# بەرەو بەختیاریی

# ئافرەت

بەرگی دووەم

نووسینی

جەمال حەبیبوڵڵا ( بیدار )




پرۆژەی تیشک

پرۆژەی تیشک 10

# بەرەو بەختیاریی ئافرەت

**جەمال حەبیبوڵلا**

**(بێدار)**

**بەرگی دووەم**

2007 زایینی

1428 کۆچی

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

**ناوی کتێب**: بەرەو بەختیاریی ئافرەت
**نووسینی**: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار"
**ژمارەی سپاردن**: (107) ساڵی 2007
**شوێنی چاپ**: کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر /07703612141
**نۆرەی چاپ**: یەکەم
**ساڵی چاپ**: 2007
**لە بڵاوکراوەکانی**: پرۆژەی (تیشک)، زنجیرە (10)
**ئیمەیلی پرۆژە**: tishkbooks@yahoo.com
**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت**: **www.tishkbooks.com**

**مافی لەچاپدانی ئەم بەرهەمە پارێزراوە**

# بەشی یەکەم

## گفتوگۆیەك

مام جەمیل: لەگەڵ عائیشەدا حەزمانکرد بە خزمەتت بگەین، سکاڵا باسی تۆی بۆ کردووین‌و بەوە گەلێ شادمان بووین.

باجی عائیشە: یاخوا بەخێر بێیت، ئای کە خۆم بە بەختیار ئەزانم بە دیدارت.

دڵپاك: یاخواماڵتان ئاوابێت، ئەوەش پیاوەتی‌و مەردایەتی خۆتانە.

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، بە تەلەفۆن نەشمین‌و پرشنگ‌و جوانم ئاگادارکردن، بڕیاریاندا کە شەو بێن بۆ لامان‌و نەشرۆنەوە، ئەها! سەرنج بدە، نازدارو بەهاری خوشکم چۆن لێت ورد ئەبنەوە!.

دڵپاك: وابزانم پێویستی بەوە نەئەکرد کە ئاگاداریان بکەیت، بۆچی ئەزیەتیان بدەینەبەر؟ ئەترسم لەبەر خاتری ئێمە کاتی خۆیان لەدەست دەرکەن، واتە هاتنەکەیان ڕووگیریی بێت.

سکاڵا: نا.. نا، بە بیستنی هەواڵەکە گەلێ خۆشحاڵ بوون.

(سەربەت‌و سەردار هاتنەوە، ڕۆژباشیان لە دایك‌و باوكیان کردو بەخێرهاتنەوەی سکاڵایان کرد، سکاڵا ئەوان‌و ئاوازو دڵپاکی بەیەکتر ناساند، دەستیان درێژ کرد بۆ دەستگوشین، یەکە یەکە دەستی ئاوازیان گوشی، بەڵام دڵپاك دەستی درێژ نەکرد، ئەوانیش بەزەردەخەنەیەکی زەردەوە تەماشایەکی دڵپاکیان کردو ئەمجا کشانە دواوە).

سەربەست: حەی.. حەی.. حەی! ئەم بەرگە پیرەژنانەت لەکوێ هێناوە خاتو سکاڵا؟ نۆبەی ئەمەشمانە، خەڵك مانگو ئەستێرەکان ئەپشکنێ‌و هۆی گەشتو گوزاریان بۆ دابین ئەکات، کەچی تۆ ئێستا بەرەو چەرخی بەردیی ئەگەڕێیتەوە! کچە ها، بەو شێوەیەتەوە نەچیتە دەرەوە، با دراوسێکان گاڵتەمان پێ نەکەن، سکاڵا ئاوڕوومان مەبە، چی بکەم! ئێستا میوانت هەیە.

باجی عائیشە: لێی گەڕێ سەربەست.. لێی گەڕێ، ئارەزووی خۆیەتی، خۆی چۆن حەز ئەکات با وەها بێ کوڕم، چ زیانێك بە تۆ ئەگات؟!

مام جەمیل: سەربەستی ڕۆشنبیر، تۆ چیتە بەسەریەوە؟ ئەوە بەرگی شەرەفە.. شەرەف، تۆ هەر هەقی خۆتت هەیە.

سکاڵا: بابەگیان، پێویست بەهەراو دەمەقاڵێ ناکات، سەربەست هەرچی بڵێت من لێی عاجز نابم، بەڵام ئەبی ئەوە بزانێت کە برامە، برایش خراپەی بۆ خوشکی خۆی ناوێت، هەروەها بیری سەربەست . وەکو خۆی بۆی ئەچێت . بیرێکی پێشکەوتوانەیە، بێگومان باوەڕی بەربەستیی هەیەو سەربەستیی من زەوت ناکات، ئەوە گاڵتە ئەکات.

سەربەست: لە هەموو شتێك گاڵتە بکەم، لەم باوو نەریتەدا کە تۆ ئەتەوێ زیندووی بکەیتەوەو بمانگێڕیتەوە بۆ دە هەزار ساڵ لەمەوبەر، گاڵتە ناکەم، حەیامان مەبە، با خەڵك ئا بەو شێوەیە نەتبینێ.

باجی عائیشە: ئەی لە دەوری گەڕێم، بەخوا جوانی لێدێت، وازی لێبێنە.

سکاڵا: ئای سەربەست لەو مێشك‌و بیرکردنەوەیەت! جاران بەسەرو مل و باڵ‌و سنگ‌و قاچ‌و قولی ڕووتەوە ئەچوومە دەرێ، سەدان چاوی چنۆك تەماشایان ئەکردم، لات گرنگ نەبوو، باسی ئابڕووچوونت نە ئەکرد، کەچی ئێستا کە پەردەیەکی ڕەش ئەدەم بەسەر ئەو چاوە چنۆکانەدا، تۆ دێیت بەسەرماو سەرزەنشتم ئەکەیت! ئای برای شیرینم، چەند دووری لەڕاستییەوە! تۆ چاك بیر لە بابەتەکە بکەرەوە.

ئاواز: کاك سەربەست، گوێی مەدەرێ، پەلەت نەبێ، خۆت زویر مەکە.

دڵپاك: سەربەت ئەبی سەربەست بێت‌و دەرگای سەربەستی لە کەسانی تر نەگرێت، خۆ ئەگەر وا نەبوو، ئەوسا نابێ

پێی بگوترێت سەربەست.

مام جەمیل: سەربەست گیان بیبڕنەوە، میوانمان هەیە، باسەکە بگۆڕن.

(لەدوای نوێژکردنو شێوکردن بە کەمێك، جوانو نەشمینو پرشنگ خۆیان کرد بەماڵا، چۆنو چاکییەکی گەرمو گوڕ کەوتە ناو ماڵەکەوە، گەلێ لە شێوەو جلو بەرگەکەی سکاڵا ورد بوونەوەو زەردەخەنەی پڕ لە سەرسوڕمانیان هەر بەدەوام بوو، بەڵام سکاڵا خۆی لێڵ نەئەکرد، زۆری نەخایاند زەنگ زرایەوە، کەچوون بە دەمییەوە دییان هەڵکەوتە، هاوڕێی سەربەست، تومەز نەشمین ئاگاداری کردووە).

## مەگەر مەرگ بەرنامەمان پێ ببڕێت

نەشمین: من دڵنیام کە سکاڵاخان، لەبەر خۆشەویستیو ڕێزگرتنی هاوڕێیەتی مامۆستا دڵپاك ئەو بەرگەی پۆشیوە، هەقی خۆیەتی، مرۆڤ ئەبێ ڕێزی بیرو هەستی هاوڕێی خۆی بگرێتو هەوڵبدات هەستی بریندار نەکات.

هەڵکەوت: تەبعەن.. تەبعەن، ئیحترامی مەشاعیرو موقەددەساتی خەڵك زەرووریيە.

سکاڵا: ئا.. ئا، ئەوە نییە ئێوە پەیڕەویی ئەوە چەند جوان ئەکەن!

مام جەمیل: ئەم باسە با ببڕێتەوە، نازانم ئیتر بەس نەبێت؟

سەربەست: بەسی چی بابە؟ بەشەرەفم، بەیانی دوو دراوسێ ئا بەو شێوەیەی ببینن، ئیتر من لەڕووم نایەت لەم ماڵە بچمە دەرێ.

پرشنگ: خوا ئەکا ئەو هەر ئەو جلانە لەبەر ئەکات، دیارە ئەوە بەختی منە، چونکە جلە عەسرییەکانی بە من ئەبڕێن، وا نییە سکاڵا؟

باجی عائیشە: هەزار جار پێشکەشت بن، ئا.. ئا، هەر بۆتۆ چاکن.

سکاڵا: هاوڕێ بەڕێزە "عەصرییەکان!" هەرچی ئەڵێن سەربەستن، هەر ئێستا تا سەدساڵی تر شەکر بشکێنن، من بە بای خەیاڵمدا نایەتو کێچێك نابێت بە میوانم، ئەوەش زۆرباش بزانن کە من خۆمم زۆر چاك ناسیوە، ئێستا ئەزانم چیمو کێم، تاریکایی دڵو دەروونم، هی سەرچاوم ڕەوینەوەو نەمان، ڕۆشنایی جێگەی گرتنەوە، هیوادارم خوای گەورە ئێوەش بخاتە سەر ڕێگەی ڕاستو پاکی خۆی.

بەڵێ مامۆستا دڵپاکم خۆش ئەوێتو ڕێزی هەیە لامو خۆی خاوەن ڕێزە، بەڵێ ئەو خستمیە سەر ڕێگەی ڕاست، بەڵام لەبەر خاتری ئەو، من ئەم بەرگەم نەپۆشیوە، بەڵکو قایلبوون، باوەڕ بەخوا، بیرکردنەوە، ژیربێژیی، ئەم بەرگەیان پێپۆشیم، جا ئێوە هەرچی ئەڵێن بیڵێن، هەڵبەت ئازادو سەربەستن، هەموو گوتنێکیش مەرج نییە کە ڕاست بێت.

بەڵام من سەرم لە ژیربێژی ئێوە سوڕماوە، لەلایەکەوە دەم لە سەربەستیی دەکوتن، لەلایەکی ترەوە دەستبەسەر سەربەتیی کەسانی تردا ئەگرن، ئای لەو ژیربێژییەتان جا، با لەمەش زیاتر کاتەکەمان بەفیڕ نەڕوات، با باسێکی بەکەڵكو سوودبەخش بکەین.

جوان: وا دیارە حەبی هێمنییو ئارامییت خواردووە، سکاڵاهەڵچوونەکانی جارانت چییان لێهات؟ بۆچی دەریان ناخەیت؟

پرشنگ: وادیارە لەگەڵ مامۆستا دڵپاکدا بەرنامەیەکتان ڕێکخستووە، ئەوەتا ناوی باسی بەکەڵك ئەکەیت.

سکاڵا: بەڵێ، بەڵام بەرنامەی ئێمە خەیاڵیی نییە، بەڵکو لێکۆڵینەوەیە دەربارەی ژیان، خوایاربێت تا لە ژیان بین، بەرنامەکەمان بەردەوام ئەبێ، واتە مەگەر مەرگ ئەو بەرنامەیەمان پێ ببڕێت.

باجی عائیشە: مامۆستا دڵپاك گیان، تۆ دەمێکە بێ دەنگیتو هەر تەماشای ئەوان ئەکەیت، بۆچی قسەیەکمان بۆ ناکەیت؟

دڵپاك: ئەی قسەکردن نابێ بە نۆرە بێت؟ نۆرەم نەهاتووە.

هەڵکەوت: دڵپاك خان، لەگەڵ سکاڵادا ناوێرم قسە بکەم، نازانم ڕێی ئێمەش ئەدەن بەشداریی لە باسەکەتاندا بکەین؟

دڵپاك: باسەكە ئەگەر گشتیی و پاك بێت و لەسەر بنەڕەتی زانیاریی دابمەزرێت و بەرەو ئامانجێكی تایبەتی بڕوات و مەبەست گەیشتن بێت بەڕاستیی، واتە دەمەقاڵێ و یەكتربەزاندن نەبێت، بێگومان چاك و بەكەڵكەو هەریەكە بۆی هەیە بەشداریی بكات، بەڵام ئەگەر وەها نەبێت، من بەشداریی ناكەم، تۆیش بۆ خۆت سەربەستیت.

ئاواز: بەڵام بڕیار وەهابوو كە لەبارەی ژنهێنان و شووكردن (الزواج) . هاوسەرێتیی . ەوە بدوێین، ئەگەر لەبیرتان مابێت.

دڵپاك: حەزئەكەم باسەكە بەشێوەی پرسیارو وەڵام بدەینە بەر، بەو مەرجەی هەروەك پرسیار ئەكەین، گوێ بۆ وەڵامی پرسیارەكەش بگرین. بێگومان پرسیاركردن خۆی بەتەنها، واتە بێ وەڵام، ئادەمیزاد بەهیچ ئەنجامێ ناگەیەنێ، دیارە هەر پرسیارێك وەڵامی خۆی هەیە.

مام جەمیل: ڕۆڵەكانم" ئێوەخوێندەوارن، پێویستە ئاگاتان لە قسەكانتان بێت، بزانن چۆن دەدوێن، نابێ لەیەكتر دڵگران و پەست بن.

هەڵكەوت: نا . . نا، خاڵۆگیان، خەمت نەبێت.

باجی عائیشە: ئێمەش گوێتان لێ ئەگرین و كەڵك لە قسەو باسەكانتان وەرئەگرین، من زۆر حەز لەفێربوون ئەكەم، خوا ئادەمیزادی زانای خۆش ئەوێ، ڕۆڵەگیان، زانین بۆ ئێوە ئێجگار بە كەڵكە، چونكە لە سەرەتای بەهاری تەمەندان.

## مەفهومی بنەڕەتیی هاوسەریی

هەڵكەوت: دڵپاك خان، وەك ئەزانین جیهانی ئەمڕۆ، جیهانەكەی دوێنێ نییە، چونكە شارستانییەت پەرەی سەندووە، بەگشتی خەڵك پێشكەوتووە، زۆربەی مەفهوومان گۆڕاون، هەر كارێ مەفهومێكی تری بنەڕەتیی تازەی هەیە، پێم ناڵێیت مەفهومی بنەڕەتی هاوسەرێتیی بە بیروڕای ئیسلام چۆن بووەو چۆنە؟

دڵپاك: برای بەڕێزم، مەفهومی بنەڕەتیی هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا یەك مەفهومەو كۆن و نوێی نییە، مەفهومیی ئیسلامیی لەم مەسەلەیەدا لە مەفهومەكانی تری دنیایی جیاوازە، چونكە ئەم لە قورئانەوە وەرگیراوە، قورئانیش ئەو بەرنامە خوایییەیە كە بۆ ئادەمیزاد دایڕشتووە.

نەشمین: چۆن؟ ئەكرێت ئەوەمان بۆ ڕوون بكەیتەوە؟

دڵپاك: مەبەستم ئەوەیە كە مەسەلەی هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا گەلێ قووڵ و بەرفراوانەو هەمە گرەوەیە (شامل)ە، نەك هەر ئادەمیزاد بە تەنیا، بەڵكو هەموو گیاندارەكانی ترو بێگیانەكانیش ئەگرێتەوە، بۆ نموونە: یاسای ژمارە (49)ی سورەتی (الذاريات) ئەفەرموێ: (وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُون)، هەروەها ئەفەرموێ: (سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُون)[1].

بەم پێیە هاوسەرێتیی و جووتێتیی، ئەو شێوازەیە كە پەروەردگار خەملاندوویەتی بۆ لەدایكبوون و زۆر بوون، بۆ یەكگرتن و بەردەوامبوون و مانەوەی ژیان لەسەر زەویدا، پاش ئەوەی كە هەریەكەی لەو دوو هاوسەرە بەشێوەیەكی تایبەتیی خەلق كردووە، كە هەریەكەیان بتوانی بەڕۆڵی سەرەكیی خۆی بەشێوەیەكی گەرمو گوڕ هەڵسێت و بە هەردووكیانەوە مەبەستی مانەوەی ژیان بدەن بە دەستەوە.

پرشنگ: بەڵام باسەكە پەیوەندیی چییە بە بێ گیانەوە؟ ئەوەیان چۆن؟!

دڵپاك: پەروەردگار جووتێتیی كردووە بە بناغەی یاسای ئەم بوونەوەرەو ئاوەدانكردنەوەی، لە بێگیاندا، بۆ نموونە: لە ئەتۆمدا، پرۆتۆنی گەرم سرووشت و بزێوییەكەی لە هی ئەلەكترۆنی سارد جیاوازە، خوای گەورە ئەو جیاوازییەی

[1] سوورەتی (یس: 36)

بەخێر گێڕاوە، چونکە بە هۆی ئەو جیاوازییەوەیە کە یەکتر ڕائەکێشن و یەك ئەگرن، خۆ ئەگەر ئەو جیاوازییە نەبووایە، ئەو دووانە لەیەکتر دوور ئەکەوتنەوەو کیانی ئەو ئەتۆمە هەڵئەوەشایەوەو تێکئەچوو (سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا..).

هەروەها کارەبا ساردو گەرمی هەیە کە ئەوانیش دوو هاوسەرن، شەحنەی سارد لەگەڵ گەرمدا. نەك ساردداـ یەك ئەگرن، بەو یەکگرتنەش تەزوو (تیار)ی کارەبایی پێکدێت.

سەربەست: ڕاستە.. ئەوە زۆر ڕاستە. شەحناتە هاوڕەگەزو هاوچەشنەکان یەکتر ڕاناکێشن، بەڵکو لە یەکتر دوور ئەکەونەوە، ئەوە بە تاقیکردنەوەی دوو پارچە مەگناتیس زۆر جوان ئەنجام دەدات بە دەستەوە.

دڵپاك: بەڵێ وەهایە، جا با بێینە سەر ڕووەك، ئەویش نێرو مێی هەیە کە پێویستیان بە هاوسەرێتیی هەیە، ئیتر کۆئەندامی نێرو مێی تیایا سەربەخۆ بێت وەك لە دارخومادا ئەیبینین، یاخود هەردووکیان پێکەوە بن لە ڕووەکەکەدا وەك لە زۆربەی گژوگیادا زانراوە، ئەوەتا هەتا نێرو مێ کەڵك لە یەکتر وەرنەگرن، بەرهەم پێکنایەت.

هەر بەو جۆرە لە گیانلەبەرو مێرووەکانی تریشدا، نێرو مێ، کە پێکهاتنیان لە یەکتر جیاوازە، بە یەکتر ئەگەن، لەو بەیەکگەیشتنە بەرهەمێکی چاك پەیدا ئەبێت، کەچی لە بەیەکگەیشتنی نێرو نێر، یان مێو مێدا ئەو بەرهەمە پەیدا نابێت، هەر ئەمەش یەکێکە لە فەلسەفەکانی قەدەغەکردنی بەیەکگەیشتنی نێرو نێر یان مێو مێی ئادەمیزاد لە ئیسلامدا[1].

هەڵکەوت: باسەکە بە شێوەو شێوازێکی سەیر ئەدەیت بە گوێماندا!

دڵپاك: نەخێر، نە سەیرەو نە سەیری تێدایە. لە ڕاستییدا جووتێتیی (الزوجية) بریتییە لە بوونی شتێك کە سیفەتی کارکردن ـ واتە کردار ـ ی تێدا بێت، لەگەڵ شتێکی تردا کە کاری بکەرەکەی پێ پەسەند بێتو بۆ کاری بکەرەکە هەڵبچێتو بە دەمەوەچوونی تێدا هەبێت، یانی یەکێکیان کارکردنو کارتێکردنی تێدا بێتو ئەویتریان هەڵچوونو کارتێکرانی تێدا بێتە دی. جا هەر ئەم پەیوەندییە بۆتە بناغەی پێکەوەنووسانو وابەستەیی هەرچی شتی ئەم جیهانەیەو بەم پێکەوەنووسانە یاسای جوانو ڕازاوەی ئەم بوونەوەرە فراوانە ئەچێت بەڕێوە.

بێگومان ئەم پەیوەندییە هەمووی یەك جۆر نییە، بەڵکو بەپێی جیاوازیی جۆرو ڕیزی خەلق کراوەکان ئەو پەیوەندییەش جیاوازە، ئەو جووتکردنە (المزاوجة) لەنێوان توخمەکاندا، ڕەگەزەکاندا، ئاوێتە بێگیانەکاندا، لەشە زیندووەکاندا، بەپێی سرووشتی هەریەکەیان هەیەو لە ڕووی جۆرایەتییو چۆنایەتییو مەبەستی سروشتییەوە لە یەکتر جیاوازە، بەڵام هەموویان لە بنەڕەتو جەوهەری جووتایەتییدا یەك ئەکەون، بۆ هێنانەدی مەبەستی سەرەکیی فیترە کە ڕوودانی تەرکیبە لە جۆرە جیاوازەکانی سرووشتدا، ئەویش ئەوەیە لایەنێك هێزی کارو لایەنێکی تر هێزی هەڵچوون لە ئەنجامدا بدات بە دەستەوە، ئایا مەفهومی بنەڕەتیی هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا بێوێنە نییە لە بەرزییدا؟[2].

نەشمین: ئەتوانم هەزار سوێند بخۆم کە هەڵکەوت لەم باسە تێنەگەیشت.

هەڵکەوت: نا.. نا، وا مەڵێ، لە بەشی زۆری تێگەیشتم، بەڵام قسەکانی ڕەق بوون.. ڕەق، ئەی تۆ تێگەیشتی خانم؟

نەشمین: ئا، تا ڕادەیەکی زۆر، هەر هیچ نەبێت لە تۆ زیاتر.

## ئاستی ژیریمان پێشچاو بگرە

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، ئێمەی گەنجو خوێندەواری ئەم چەرخە، بەهۆی فیلمی دڵداریی نیشاندەرو گۆڤارو پەڕاوی

---

[1] بۆ ئەم باسە بە درێژی تەماشای عمل المرأة في الميزان (د. محمد علي البار) بکە.

[2] بۆ ئەم مەبەستە بە درێژی تەماشای (الحجاب)ی مەودوودی بکە.

پڕ لەوێنەی ڕووتەوە، نامان پەردەژێ بەسەر باس و بابەتی فەلسەفییەوە، بەشێوەیەکی ئاسان و سادە باسەکەمان بۆ داڕێژە، ئاستی ژیرییمان پێش چاو بگرە، (هەرچی بدرۆشێتەوە مەرج نییە زێڕ بێت)، هەرکە خوێندەوار بێت مەرج نییە ڕۆشنبیر بێت.

سەربەست: بەشەرەفم پاش ماوەیەکی تر، سکاڵا بەرگی فەیلەسوفیی ئەپۆشێ.

دڵپاك: هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا پێویستییەکی بنەڕەتی فیترییە، یاسایەکی زۆر بایەخ پێدراوە، چونکە ئیسلام زۆر چاك ئەزانێت کە یاسای هاوسەرێتیی کارێکی وەهایە نابێت دەستی لێهەڵبگیرێت، بەستراوە بە مێژووی دوورو درێژی بوونەوەرەوە، گیاندارو بێگیان ئەگرێتەوە، بوونەوەر لەسەر ئەو بناغەیە پێکهاتووە، ئەی خوای گەورە باسی ناکات بۆمان: (سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ) (یس: 36)؟.

یاسای جووتێتیی بازنەیەکی تەسکۆڵە نییە، وەك هەندێ بۆی چەن، دیسان ئاسۆیەکی داخراو نییە، نابێ بشبڕێت بەسەر ئادەمیزادو گیانلەبەرو ڕووەکدا بەتەنیا، بەڵکو بە پێی یاسای ئیسلام، یاسایەکی زۆر وردو فراوانە، بوونەوەرەیش ئەگرێتەوە، هەر جۆر (نوع)ێك لە جۆرە جیاوازەکانی بوونەوەر بگریت، ئەبینی ئەبێت بە دوو بەشەوە، یان بە دوو ڕەگەزەوە، تۆ بڵێ ئەبێت بە جووتێ شتەوەو جوتێتیی تێدا دیارە.

ئەوەش نەك بە شێوەی دژایەتیی و جیاواز، وەك ماددییەکان لێکیی ئەدەنەوە، بەڵکو بە مەبەستی دۆستایەتیی، لەگەڵ یەکتردا سازان و گونجان، بۆ بە یەکگەیشتن و یەکگرتن و شادبوون.

جوان: ئایا ئەگونجێت ئەو باسە بەنموونە ڕۆشن بکەیتەوە بۆمان؟

دڵپاك: بەڵێ، هەر بۆنموونە: ئەو نهێنییەی لە کارەبادا کە بەشی سارد (سالب) وەری ئەگرێت، جیاوازە لە نهێنیی بەشی گەرم (موجب)، کەچی ئەو دووانە هیچ کامیان بە جیا جیا هیچ بەرهەمێك نادەن بە دەستەوە، واتە مەبەست بە دیناهێنن کەچی بە یەکگەیشتنیان تەزووی کارەبا پێکدێت و بەوەش کەڵکێکی گەورەو فراوان دێتە کایەوە.

هەموو جووتەکانی تری ئەم بوونەوەرە هەر بەو جۆرەن، هاوسەرێتییان پڕە لە کەڵك و حیکمەت، چ ئەوانەیان کە تا ئێستا زانیاریی پەی پێبردوون، چ ئەوانەی پەی پێنەبردوون، ئینجا مەفهومی بنەڕەتیی هاوسەرێتیی ـ ژنهێنان و شووکردن ـ لە ئیسلامدا لەسەر ئەو حیکمەتە دامەزراوە، نەك لەسەر هەندێ پڕوپلانتەو ئیعتیباراتی پووچەڵەی سادەو هەڵە، نەك لەسەر ئەو بۆچوونانەی کە هەندێ بەناو زانای وەکو (فرۆید)و شاگردەکانی کە بۆی چوون و بۆی ئەچن، کە پەڕین ئەکەنە مەبەستی سەرەکیی، هەموو مەبەستە سەرەکییەکانی تر ئەکەن بە ژێر لێوەوە، کە بەوەش خەڵکی چەواشە ئەکەن.

سەربەست: ئێ، بابە، وابڵێ.. وا بڵێ، ئەمجارە من لە باسەکە تێگەیشتم.

دڵپاك: بەڵام لەوەدا پەروەردگار ئادەمیزادی وەکو گیانلەبەرو شتەکانی تر بەرەڵڵا نەکردووە، کە ئارەزووەکانی بێلغاو بن و بۆ هەرکوێ بڕۆن بڕۆن، بەڵکو یاسایەکی جوان و پاکی پڕ لە کەڵکی بۆ ناردووە هەتا لەسەری بڕوات و تووشی زیان و مەترسی نەیەت، هەتا پلەو ڕێزو شکۆی پارێزراو بێت. ئەمەش خێرو چاکەی ئادەمیزادی تیایە، ڕێزی ئادەمیزادی تێدا دیارە، ئەی مرۆڤ جێنشینی خوا نییە لەسەر ئەم زەوییەدا؟!.

## پەڕین ( جنس ) بە سروشت پاکە

نەشمین: سکاڵاخان، جا ئیسلام کە ئەوەندە پەڕین بە گلاو ئەزانێ، ئیتر هاوسەرێتیی چ نرخێکی هەیەو بۆچ زاناکان بەدناو بکەین؟

دڵپاك: سبحان الله، نازانم ئێوە بۆچ هەموو شتێك بە هەڵگەڕاوەیی دێتە بەرچاوتان و گوێتان مانای قسە پێچەوانە ئەکاتەوە، ببورە، ئەمزانی بەناوبردنی فرۆید خاترت بەو جۆرە ڕێش ئەبێت، بەڵام نازانم تۆ لەچییەوە هەڵتهێنجاند کە

پەڕیین لە ئیسلامدا گلاوە!.

ئەگەر لە خۆمانی تێکنەدەین باسەکەی پێشوو گەیاندینیە ئەوەی کە هەریەکە لە جۆری ئادەمیزاد کە لە نێرو مێ دروست بووە، هەر یەکە لەت (شطر)ە سوننەتێکە لە سوننەتەکانی خواو ئەبێ لەگەڵ لەتەکەی تردا یەك بگرێت بۆ خەملاندنو تەواوکردنی جۆرەکە، یا یەکەیەکی تەواو، هەر یاساکە خۆی (وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ)، ئەگەر بەوردیی سەرنجی لێبدەین گەواهیی ئەمە ئەدات:

ئەو دەستورو یاسایەی کە خوا دایناوە، بۆ ئەوەی بوونەوەری لەسەر بڕوات، نەپیسەو نە گلاو، نەخێر، کاری خوا پاکو خاوێنە، جا مادام جنس یاسایەکی خواییەو ئیسلامیش بەرنامەیەکی خواییە، کەی ژیری ساغ ئەیگرێت کە ئیسلام بەپیس یان بە گلاوی بژمێرێ؟ بەپێچەوانەی قسەکەی جەنابتەوە، پەڕینی پاك لە ئیسلامدا نەك بە تەنها پاكو پوختەیە، بەڵکو گرنگو پیرۆزەو خوا پاداشتی ئادەمیزادی لەسەر ئەداتەوە، ئەوەی کە بەئێوەیان گوتووە لەم ڕووەوە لە تێڕوانینو بۆچوونو سەرەتاکانی ئیسلامەوە ئەوەندە دوورە کە پێچەوانەکەی ڕاستە، ئەوەی کە پێتان گوتراوە مەزهەبو ڕای "زینو"ی قوبرسییە کە گەورەترین فەیلەسوفی ڕەواقییەکان بوون لە (342)ی پێش زایینو ڕای هەندێ ڕاهبو وشکە سۆفی دوور لە زانینە.

جا ئەگەر ئیسلام جنسی بەپیسو گلاو بزانیایە ئەبوایە مسوڵمانان ژنیان نەهانیبایە، شوویان نەکردایە، ئەوسا منو تۆو ئەم هەموو خەڵکە نەبووینایە، خۆ پێغەمبەر ﷺ، لە هەموو کەسێك زیاتر گوێڕایەڵیی فەرمانی خوا بووە، لە هەموو کەسێك زیاتر لە خوای پەروەردگار ترساوە، هەر هیچ نەبێت، ئەبوایە ئەو ژنی نەهێنایە، کچەکانی خۆی نەدایە بەشوو، ئایا ئەمە بۆچوونەکەی ئێوە پتەو ئەکات، یان پووچەڵی ئەکاتەوە؟ تۆزێ مێشکتان بکەنەوە خوشکە گیان.

سەربەست: بەخوا ڕاست ئەکەیت، ئەوە بەڵگەیەکی زۆر زیندووە.

دڵپاك: باسەکەی ئێمە، باسی هاوسەرێتیی بوو، بەڵام بەداخەوە! ئێوە نازانن هاوسەرێتیی چەند گرنگو بەنرخە، کەڵکە ڕەوشتییو تەندروستییو کۆمەڵایەتییو دەروونییەکانی هەموو ئەکەن بەژێرەوە، بە تەنها ڕووتو قووت پەڕینەکەتان پێش چاوگرتووە، پێش چاوگرتنەکەشتان ئێجگار زیادەڕەوییی پێوەیەو بردوونی بەناو لیتەی نەزانیدا!.

جا ئێستا لێتان ئەپرسم: ئایا ژیری ئەیگرێت کە باوکێکی دڵسۆزی میهرەبان خواردنێك بە پیسو گلاوی بزانێ، کەچی دەرخواردی ڕۆڵەکانی خۆی بدات؟ یاخود هانیان بدات لەسەر خواردنی ئەو خواردەمەنییە؟

مام جەمیل: نە بەخوا، من باوکمو ئەوە ئەزانم، هەرگیز شتی وا نابێت.

دڵپاك: ئەی ئەگەر ئیسلام پەڕین بە پیس بزانێت، چۆن هانی ڕۆڵەکانی خۆی ئەدات بۆ ژنهێنانو شووکردن؟ ئایا ژنهێنانو شووکردن ئاشکراترین ڕێگەی پەڕین نییە؟ فەرموون گوێبگرن لە پێشەوای ئیسلام موحەممەدی پێغەمبەر ﷺکە ئەفەرموێت: (اربع من سنن المرسلين، الحناء والتعطر والسواك والنكاح) (ترمذي). (ثلاث حق على الله عونهم: المجاهد في سبيل الله، والمكاتب الذي يريد الأداء، والناكح الذي يريد العفاف) (ترمذي).

تەنانەت لەم فەرموودەیەدا بەئاشکرا ئەبینین کە ژنهێنانو تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا هاوسەنگن.. هاوسەنگ! "يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فانه اغض للبصر وأحصن للفرج.." (رواه الجماعة).

لەوەش گەورەو گرنگتر خوای گەورە گرنگیی هاوسەرێتیی بۆ پێغەمبەرمان باس ئەکاتو ئەفەرموێ: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً وَذُرِّيَّة..).

خۆ دیارە ئادەمیزادە باوەڕدارەکان ئەبێ دوای پێغەمبەران بکەونو ئەوان بکەن بە سەرمەشقو نموونە، وەك ئەوان بکەن لە ژیاندا، ئای خوشکانئەگەر ئیسلام وەها بوایە کە داویانە بەگوێی ئێوەدا، ئێستا چەندان سەدە بوو قەرەچۆڵی مسوڵمانان بڕابۆوە.

پرشنگ: ئەوەی کە گوتت ڕاستە، بەڵام هەر تەنیا بۆ پیاوانە.. پیاوان.

دڵپاك: ئەی خوا ڕەحمت پێبکات، هاوسەرێتیی بۆ لە نێوان پیاوو پیاودا ئەکرێت، یان لە نێوان پیاوو ئافرەتدا؟ ئەی

بەدرێژیی باسی هاوسەریمان نەکرد؟ یان لە بیرت چۆتەوە؟ هاوسەرێتیی کارێکە لە نێوان ساردو گەرم، ڕەق و نەرم، نێرو مێدا ئەکرێت، پرشنگ خان.

بەپێی یاسا خواییەکە بکەرو کارتێکراو هەردوو لایان لە کارەکەدا بەشدارن، وەك یەك خاوەن چاکەن، ئەی نەمان گوت دوولایەنی بەبێ یەکتر نەکراون، بەبێ یەکگرتنیان ئامانجو مەبەست وەدی نایەت؟ ئەی تۆ نازانی کە گرنگیی زەرەنگەر لە زێرەکەوەیە؟ زێڕیش بەبێ کڕیار هیچ نازو نرخێکی نییە؟

جوان: ئێ.. ئێ، تێگەیشتم وایە، بەڵام نامانەوێ زوو خۆمان بدەین بە دەستەوە!

دڵپاك: خوشکی بەڕێز، لە مەدا مەسەلە هەق ناسینە، نەك خۆ بە دەستەوەدان.

## ئەو پلەیە نەبێت پێکەوە نایانکرێت

پرشنگ: ئەوە ی گوتت، ژیری زۆر چاك پەسەندی ئەکات، بەڵام ئایا ئەمە دژ بە پلەکە (وللرجال علیهن درجة) نییە؟ لێرەدا چی ئەڵێیت؟

دڵپاك: خوشکەکەم، ئێمە باسی بکەر، یا کارتێکەرو کارتێکراومان کرد، کاتی خۆیشی باسی سەرپەرشتیارییکردنمان کرد، جا ئەو ئایەتە لێرەدا تۆ بە هەڵە ئەخەیتە بیری خۆتەوە، ئەوەش وات لێئەکات کە بەدژایەتیی بزانیت، لە کاتێکدا دژایەتیی دروست نابێت و هەر تیایشیا نییە.

باوکێکی بەسۆز، کە هەموو پێداویستییەکی کوڕەکەی، یان کچەکەی جێبەجێ ئەکات، زۆری خۆش ئەوێت، چونکە جگەرگۆشەیەتی، کەچی ئەبینی ڕۆژێك لە ڕۆژان بە شەقازللە تێی بەربووە، ئایا ڕاستە بڵێین ئەو باوکە دژایەتیی لە ڕەفتاریدا هەیە؟ وەڵامەکەمان ئابێت یان نا، ئەپرسم بۆ؟

هەڵکەوت: وەڵامەکە (نا)یە، چونکە لەوانەیە ئەو کوڕە، یان ئەو کچە کارێکی بێجێ ڕوویدابێت لێی و شایانی لەوەش زیاتر بێت.

دڵپاك: دەی نابێت لە خۆمانەوە حوکم بەسەر شتدا بدەین، خۆ ئەگەر دامان مەرج نییە ئەو حوکمە ڕاست بێت، ئەبێ ئەوە بزانی خوشکە پرشنگ.

ئەو پلەیەی کە تۆ مەبستتە بەڵێ هەیەو باسکراوە، بەڵام ئەو پلەیە کە دراوە بە بکەر لەبەر ئەوە نییە کە بکەرە، نەدرانی ئەو پلەیەش بە کارتێکراو لەبەر ئەوە نییە کە کارتێکراو وەك بکەر گرنگ و بە بایەخ نییە، نا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە پێکەوە بیانکرێت، بیانگونجێت، مەبەستیان پێ بێتەدی. جا ئەگەر بکەرو کارتێکراو، یان با یەکسەر بڵێین پیاوو ئافرەت، هەردوولا وەك یەك لە هەموو شتێکدا یەکسان بن، جیاوازییان لە نێواندا نەبێت، جا ئەگەر یەکێکیان لەویتریان لە هەندێ ڕووەوە زیادو کەمیی نەبێت، چۆن کردار ڕووئەدات؟ ئایا دەرزییو قوماش، گاسن و زەویی، ئەگەر بەقەدەر یەك ڕەق بن، دوورین و کێڵان ڕوودەدات؟ ئەگەر بارگەی نیوترۆن و ئەلەکترۆن، وەك یەك بن، هێزی ڕاکێشان ئەتوانێ هەریەکەیان لە شوێنێی خۆیا بهێڵێتەوە؟ ئەگەر ساردو گەرم لە کارەبادا وەك یەك بن، ئایا وزەی کارەبایی دروست ئەبێت؟

نەشمین: نموونەو بۆچوونەکانت جوان و بەجێن، بەڵام ئەوانە چییانە بەسەر ئادەمیزادەوە؟ ئێمە باسی ئادەمیزاد ئەکەین.

دڵپاك: چاوەکەم، ئەو نموونانەم بۆیە هێنایەوە کە ئێوە بەئاسانیی تێبگەن، هەروەها گوتمان هاوسەرێتیی بەپێی مەفهومی ئیسلامی بەرفراوانەو گیاندارو بێگیان ئەگرێتەوە، نازانم بۆچ زوو شتتان لەبیر ئەچێتەوە!

ئای خوشکەکانم! بەدبەختییەکە لەوەدایە هەندێ تەڵەکەبازو فێڵباز ساختەچی، لەدوای پەردەی مافی ئافرەتەوە، ئەیانەوێ بکەر بخەنە شوێنیی کارتێکراو، ئەمیش بخەنە جێگەی ئەو، ئەیانەوێ یاسای سرووشت بەپێی حەزو

هەوەسی خۆیان هەڵبوەشێننەوەو سەرلەنوێ بەئارەزووی خۆیان دایڕێژنەوە! هەوڵئەدەن‌و بەهیوای ئەوەیشن کە سەرکەوتن، بەدەست بهێنن، ئەیانەوێ هێزو بازوو قەبەیی و قەوارەی پیاو، زبریی‌و بیرتیژی لە پیاو بسێننەوەو بیدەن بە ئافرەت.

لە هەمانکاتدا، ڕیش‌و سمێڵی پیاو بتاشن‌و بیانلکێنن بە ئافرەتەوە، جوانیی‌و ناسکیی‌و نەرمو نیانی‌و سۆزو میهرەبانی‌و دەنگی ناسکی ئافرەت نەهێڵن، بگرە شیردان‌و منداڵبوون، بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی لە ئافرەت بسێننەوەو بیاندەن بەپیاو، بەو نیازەی یەکسانیی لە نێوان ئافرەت‌و پیاوادا بنەخشێنن! با بڵێین توانیان ئەمە بکەن، ئایا ئەتوانن کۆئەندامیی زاوزێ‌و میزکردنیشیان وەك یەك لێبکەن بۆ نەخشاندنی ئەو یەکسانییەی کە ئەوان ئەیانەوێ؟، هەر بەناوی سەربەستی‌و یەکسانیی نێرو مێشەوە ئەیانەوێ ئەو کارە بکەن؟

ئاواز: دەی ئەو کارە کارێکی شێتانەی دوور لەژیریی‌و ژیربێژییە، سەرنەگرتنی ئاشکراو مسۆگەرە.

باجی ئایشە: کچی خۆم، خۆشیی هاوسەرێتیی لەوەدایە کە ژن ژن‌و پیاویش پیاو بێت، ئەها نابینین پیاو هاوسەریی پیاوو ئافرەت هاوسەریی ئافرەت بکات، ئەی ئەگەر بیکەن ئایا تاسەر وەك ژن‌و پیاو پێکەوە ئەیانکرێت؟.

دڵپاك: ئەی هەزار ڕەحمەت لە مردووت، ئای چەند جوان مەبەستەکەت پێکا، خۆزگە ئافرەتە ڕۆشنبیرەکانمان، پیاوە خێرخوازەکان کە داوای سەربەستیی‌و یەکسانییمان بۆ ئەکەن!، ئەو گیانە پاکەی تۆیان ببوایە، ئۆی کە ئافرەت ئەوسا بەختەوەر ئەبوو، چونکە هەڵنەئەخەڵەتا بە دروشمی زلی بێناوەڕۆکی ئەو کەسانەی کە هەر خۆیان ئافرەت لە مرۆڤایەتیی خۆی ئەپاچنەوە! خۆزگە ئەو ئافرەتانەی کە خەڵەتاون هەستیان بە خەڵەتاوی خۆیان ئەکرد.

## مەبەست بە تەنها پەڕین نییە

جوان: دڵپاك خان، لە کاتێکا کە هێرش ئەکەنە سەر فرۆید، ئەبینم ئیسلام لە ڕاڕەوەکەی فرۆیدا زیاتر دائەچێت لە باس‌و ڕازی جنسدا...

دڵپاك: ئێوە . بێبەلاّ بن . شت تێکەلاّو ئەکەن‌و ئەیدەن بە یەکدا، هەر وەك هێزی بەراوردکردنتان خەوتبێت یان کزو لاواز بێت!، ڕاڕەوی فرۆید لەکوێ‌و بەرنامەی ئیسلام لەکوێ! تۆ ئەڵێیت چی؟!.

مەبەستی ئیسلام، لە هاوسەرێتیی‌و لە پەیوەندییەکانیدا پەڕینێکی ڕووت نییە بە تەنها، بەڵکو مەبەستی سەرەکیی چەند شتێکی ترە، ئەتوانین بڵێین، جنس هۆیە نەك مەبەست، چونکە مەبەستی سەرەکیی‌و بنەڕەیتی پاراستن‌و هێشتنەوەی ڕەچەڵەك (النسل)ە، نەك لە زەت چەشتن بەتەنیا.

مەبەست لێرەدا ئەوە نییە کە لەزەت چەشتن بە پووچەڵ و بێنرخ بژمێرین، نەخێر، هەرشتێ خۆشیی و لەزەتی تێدا نەبێت، مرۆڤ خۆی ناکوتێ بۆی‌و ناتوانێت لەسەری بەردەوام بێت.

هەڵکەوت: بەڵگەت چییە سەبارەت بەو بۆچوونە؟.

دڵپاك: براکەم، ئەوە بۆچوون نییەو ڕای پێغەمبەری خوایە، کابرایەك چووە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فلاّن ئافرەت زۆر جوانەو نەزۆکیشە، با مارەی بکەمو بیهێنم، تەنانەت ئەو داوایەی سێ بارە کردەوە، پێغەمبەر ﷺ، ڕێگریی کردو مۆڵەتی پێنەداو پێی گوت، مەیهێنەو فەرمووی: (تزوجوا الودود الولود، فاني مکاثر بکم الامم یومة القیامة) (فقه السنة/ بەرگی دووەم، ل 22).

لەوەیش ڕۆشنتر پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (ان الله تعالی لا یجب النواقین ولا الذواقات)، ئایا ئەم یاسایانە ئەوپەڕی پێچەوانەیی ڕاڕەوەکەی فرۆید نانوێنێ؟ ڕاڕەوەکەی فرۆید جگە لە هەوەس‌و زوڕناقییەتیی بۆ نێرو مێ چیتری لەگەڵ خۆیا هەڵگرتووە؟، ئەی مەبەستەکانی تری هاوسەرێتیی ژن‌و پیاوی فڕێدایە کام بنچاڵەوە؟

سەربەست: بابە تۆو دایکم ئاوا گوێتان گرتووە چی تێئەگەن؟

مام جەمیل: بەخوا ئەو کیژە نەرم‌و نیانە، هەرچی ئەڵێت، یەکسەر تێئەگەم.

نازدار: کاك سەربەست، خۆزگە تۆو سکاڵاش ئالەو قسانەتان بۆ ئەکردین.

سکاڵا: هەقی خۆتە نازدار، بۆ لەمەودوا، خوایاربێت قسەکانمان‌و سەراپای ژیانمان بە جارێکا ئەگۆڕین، دەست بەژیانێکی تری نوێ ئەکەین.

نەشمین: باشە، ئەولایەنەو مەبەستانەی تر کە تۆ ناویان ئەبەیت، لە باسی هاوسەرێتیدا چین‌و کامانەن؟

دڵپاك: زۆرو زەبەندەن‌و پێویستیان بە شیکردنەوەش هەیە، بەڵام بە کورتیی: جێبەجێکردنی هەوەس‌و ئارەزووی فیتریی ئادەمیزاد، هێمنیی‌و ئارامیی گیان‌و دەروون، هێشتنەوەو بەردەوامبوونی ڕەچەڵەك، دروستکردنی خێزان کە نوواتی هەموو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگەیەکە، دروستبوونی خزمایەتیی، تەواوکردنی بەشێك لە باوەڕ، هاوکاریی نێرو مێ لە قۆناغی ژیاندا.. هتد.

هەڵکەوت: ئەوانە هەموویان ڕاستن، بەڵام دەستی باڵا هی جنسە، خۆ داننان بە واقیعدا گوناه نییە خوشکە دڵپاك.

سکاڵا: ئاخ! داخی ئەو قسە زلانەت، هەڵکەوت، لە دڵما هەر سۆ ئەکات، کوڕە ئاخر واقیعەکەت کامەیە؟ تۆ مانای واقیع ئەزانی؟!

دڵپاك: سکاڵا گیان: پێویست بە هەڵچوون‌و قسەی زاق ناکات، لەسەرخۆبە.

کاك هەڵکەوت، پەندێکی عەرەبیی هەیە ئەڵێت: "حبك للشيئ يعميك". من دڵنیام هەر ئەو هۆیەیە کە ئێوەی چەواشە کردووەو ناتوانن کەمێ بیر لە ڕاستیی، یان لە واقیع بکەنەوە، ئەگینا واقیع دژ بە بۆچوونەکەی تۆیە، زانیاریی پێچەوانەی تۆ گەواهیی ئەدات.

فەرموو . وەك خۆتان ئەڵێن . با واقیعیی بین، لایەنی ڕاستیی بەرنەدەین، زانیاریش ڕێگەمان بێت، هەموومان باسی کۆئەندامی زاوزێی ئافرەت‌و پیاومان بە وێنەوە خوێندووە، دەی با جیاوازییەکیان بێنینەوە بەرچاومان، بەتایبەتی (ڕەحم)ی ئافرەت، ئەرك و کاری ئەو ڕەحمە، ئەمجا لە خۆمان بپرسین: ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان کۆئەندامی ئافرەت‌و پیاودا هەیە، ئایا لە زەت چەشتنی پەڕین ئەنوێنێ، یان کارێکی تر؟ دوای ئەوە خۆیشمان وەڵامی خۆمان بدەینەوە.

نەشمین: ئەوە وەڵامەکەی ئاشکرایە، دیارە ئەو جیاوازییە ئەرکی لەزەت چەشتن نیشان نادات، بەڵکو بە زمانی حال گەواهیی ئەرکی زۆربوون‌و مانەوەو بەردەوامیی جۆری مرۆڤایەتیی ئەدات، ڕەحم پەیوەندیی بە لەزەت‌و شتنەوە چییە؟ ئەویش نەبوایە لەزەت هەر ئەبوو.

دڵپاك: ڕاست ئەکەی. ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە گوتمان جنس خۆی بە سرووشت هۆیە، نەك مەبەست، بێگومان ئەوە دەرچوونە لە یاسای سرووشت، لادانە لە هیڵی ڕاست، ئەنجامەکەشی ڕەنگدانەوەیەکی پڕ لە زیانی مەترسیدار ئەبێت.

هەروەها هەرکەسێ بەوردیی‌و ژیرانە بیر لە ئێش‌و ئەشکەنجەو ژانی ئافرەت لە کاتی سکپڕبوون‌و منداڵبووندا بکاتەوەو لێی تێبگات، بۆی ڕۆشن ئەبێتەوە خۆگرتنی ئافرەت، بەرامبەر ئەو ئێش‌و ئەشکەنجەو ئازارو ژان‌و زەحمەتە، ئارەزووی دایکێتییە، خۆشەویستی منداڵە لە دڵی ئافرەتدا، نەك لەزەتی پەڕیین بە تەنها، خۆ ئەگەر تەنها ئەو لەزەتە بووایە، ئافرەت لە دوای یەك سك، لە داخی ئەو ئێش‌و ئازارە، تەوبەی ئەکردو توخنی پیاو نەئەکەوت‌و ئارەزووی خۆی بەگۆڕ ئەکرد.

باجی عائیشە: وەڵڵا ڕاست ئەکەیت، ئەی ئافەرم کچی خۆم، ڕاستە. هەڵکەوت، ئێوە هەرچەندە خوێندەوارن، بەڵام منداڵن کوڕم، هێشتا فامتان نەکردۆتەوە، دنیاتان نەدیووە.

## گۆشەگیری لە ئیسلامدا نییە

هەڵکەوت: دەی بەوپێیەی کە باست کرد، باسەکە ئاڵۆزەو مەبەست نادات بە دەستەوە، چونکە نە ئەوەیە وەك فرۆید بایەخ بە گیروگرفتەکە بدات، نە ئەوەیە دەستی لێهەڵبگرێت، ئەمەش پێی ئەوترێ دژایەتیی.

دڵپاك: برای خۆم، بە تۆو کاك سەربەستو خوشکان ڕائەگەیەنم، کە ئیسلام دان بەو تەناقوزەدا نانێت کە دراوە بە گوێی ئێوەدا، بەهیچ جۆرو شێوەیەکیش، لە مەسەلەی هاوسەرێتییدا دژایەتیی لە ئیسلامدا بەدی ناکرێ. وادیارە ئێوە هەر لە بنەڕەتدا لە واتای دژایەتیی تێنەگەیشتوون، بۆیە بەهەڵە بەکاری ئەهێنن، دژایەتیی کاتێ دروست ئەبێت کە ئیسلام بڵێت، هاوسەرێتیی چاکە، لە هەمانکاتدا بڵێت خراپە، بیکەن، مەیکەن، دەی شتی وەهایش لە ئیسلامدا نییە.

دووریی ئێوە لە ئیسلام وای لێکردوون کە لێی تێنەگەن، ئەمەش وای لێکردوون کە حەقیقەت بە هەڵگەڕاوەیی ببینن، هەر بەدوای ڕەخنەبازیی و لاساییکردنەوە بن، یاسای بێوێنەی ئیسلام لەم باسەدا ئەوەندە قووڵو فراوانە کە بیرو هۆشی ئێوەی (ڕۆشنبیر)یش پەی پێ نابات، بە کورتیی و ئاسایی پێتان ئەڵێم کە ئیسلام ڕێبازێکی مامناوەندییە (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً..)، بەوپێیە لایەنی زۆرڕەویی یان لایەنی کەمڕەویی نەگرتووە، بەلام تێنەگەیشتنی ئێوە لێی، وەهای لێکردوون کە بە دژایەیتی دایبنێن، ئایا هەرچی لە شێوەی زۆرڕەویی و کەمڕەوییدا نەبێت، ناوی دژایەتیی بەسەرا ببڕین؟

نەشمین: دەی فەموو تۆ تێمانگەیەنەو باسەکەمان بۆ ڕۆشن بکەرەوە.

دڵپاك: خوشکەکەم، ئیسلام داوا ناکات لە مسوڵمانان کە گۆشەگیریی، کە نارگیری بکەن، وەك هەندێ بیروڕای فەلسەفی نییە کە جنس بە پیس و گڵاو بزانێت، بە هیچ جۆرێك پشتگیریی ژیانی عازەبیی ناکات، بەڵکو بە خراپو زیانمەندی ئەزانێتو بگرە لە هەندێ ڕووەوە بە تاوانی ئەژمێرێت.

ئاواز: لام وایە ئەمەیان ڕای خۆت بێ خوشکە دڵپاك، نەك ڕای ئیسلام.

دڵپاك: ببورە، من ڕام نییە، ڕای من یاساکانی ئیسلامە، فەرموون سەیری قورئان، فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، لە ژیانی خێزانداریی پێغەمبەر بکۆڵنەوە، ئەوسا تێئەگەن کە ئیسلام چەند نەیاری عازەبییەتە. (أربع من سنن المرسلين: الخناء والتعطر والسواك والنكاح). (ترمذي). جا شتێك کە پیشەو سوننەتی پێغەمبەرمان بێ چۆن دروستو پەسەند نییە؟ ئەی پێغەمبەران پێشڕەوو سەرمەشقو نموونەی پاکی باوەڕداران نین؟ دیسان (ثلاث حق على الله عونهم: المجاهد في سبيل الله، والمكاتب الذي يريد الاداء، والناكح الذي يريد العفاف)، (ترمذي). ئایا ناکحو ڕاهب، واتە مارەکەرو مارە نەکەر یەکنو وەك یەکن؟ لەمەش ڕوونتر: کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، سکالای ئەکردو ئەیویست بە عازەبیی بژی، پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێنەدا، ئەمەش ئیبنو عەبباس ئەیگێڕێتەوە: پیاوەکە گوتی: (الا أختصي؟ فقال الرسول ﷺ ليس منا من خصى أو اختصى).

هاوسەرێتیی حەڵاڵکراوێکی خواییەوە، یاسایەکی خواییەو بڕیاری لەسەر دراوە، جا دوورکەوتنەوە لێی، یانی پەیڕەویی نەکردنی ئەو یاسایە، یانی حەرامکردنی ئەو حەلاڵە لەسەر خۆت، ئەمەش پێچەوانەی ویستی خواییە، ئەها خوا ڕوو ئەکاتە باوەڕدارانو پێیان ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ)، ئایاتی قورئانی ئێجگار زۆرە لەم ڕووەوە، لە ژمارە نایەن بە ئاسانیی.

جارێك چەند کەسێك هاتن بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺباسی خواپەرستی خۆیانیان کرد، هەندێکیان گوتیان، ئێمە بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژووین، هەندێکی تریان گوتیان ئێمە بەشەوانە هەر شەو نوێژ ئەکەین، ئەوانی تریشیان گوتیان ئێمە خۆمان لە ئافرەت بە کەنار ئەگرینو ژن ناهێنین. پێغەمبەر ﷺکە ئەوەی بیستەوە پێی گوتن: (سوێند بەخوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا ئەترسم، بەلام ڕۆژوو ئەگرمو خۆراکیش ئەخۆم، نوێژ ئەکەمو ئەشحەسێمەوە، ژنیش ئەهێنم، ئەمەش سوننەتی منە، هەرکەسیش لە سوننەتم پشت هەڵبکات لە من نییە). بخاری ومسلم. لەوەش تۆخو زاقو ڕوونتر ئەفەرموێ: (لا رهبانية في الاسلام).

ئادەمیزادی مسوڵمان بە هاوسەرێتیی نیوەی ئایینی خۆی دەستخستووە، (من رزقه امرأة صالحة فقد أعانه على

شطر دينه، فليتق الله في الشطر الباقي). گبرانی والحاکم. فەرموون، ئەمەیە بیروڕاو یاسای ئیسلام دەربارەی گرنگیی هاوسەرێتی و نەیاریی عازەبیی، ئادەی پێم بڵێن چ یاسایەکیی تر بەمجۆرە ڕێکوپێکە؟ کام بەرنامە وەك ئەم مەسەلەکەی لە شوێنی خۆیا داناوە؟

جوان: بەڕاستیی ئیسلام لە گۆشەگیری و ژیانی عازەبییەوە دوورە.

## لەزەتپەرستیی لە ئیسلامدا نییە

سەربەست: خوشکە دڵپاك، دەی خۆ ئایینی مەسیحیش هەروەك ئیسلامی ئێمە ئایینی خواییە، ئەی بۆ ڕەهبانیەتیی بەلاوە پەسەندە؟

دڵپاك: بەڵێ، ئەویش ئاینێکی ئاسمانییە، بەڵام گۆشەگیریی و هاوسەرێتیی وازلێهێنانی بەلاوە پەسەند نەبووە، مەسیحییەیتی ڕاستەقینە دەستکاریی کراوەو گۆڕانکارییان تێدا کردووە، ئەو گۆشەگیرییە هەندێ لە بەناو زاناو گەورەکانیان، دوای عیسا (سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ) دایانهێناو ئیشەکەشیان تەشەنەی کردو لە سەرەتای سەدەی چوارەمیی زایندا مەجمەعی (الفیرا) لە ئیسپانیادا بڕیارێکی دەرکرد، کە بە پێی ئەو بڕیارە ژنهێنان و شووکردن بۆ گەورەکانی ئایینیی یاساغ بکرێت.

پرشنگ: هەندێ جار بیستومەو هەم ئەیبیستم کە ئیسلام ئایینی زەوق و حەزپەروەرییەو هەر لەبەر ئەوەش ڕێگەی چەند ژنێتیی دەدات.

دڵپاك: سبحان الله!! خوشکە شیرینەکەم، ئای چییان لێکردوون! چۆن چەواشەیان کردوون!، وەها چنگیان خستۆتە مێشکتانەوە کە توانای لێکدانەوەو بیرکردنەوەی نەمێنێت، لەلایەکەوە ئیسلامیان بە گۆشەگیریی و دەست هەڵگرتن لە دنیا بۆ باسکردوون، لە لایەکی ترەوە بە لەزەتپەرستیی و هەوەسبازیی بۆیان باسکردوون، ئەی نابێت بپرسن، ئەگەر ئەمیان بێت ئەی چۆن ئەویانە؟ ئەگەر ئەویان بێت چۆن ئەمیانە؟ ئایا ئەکرێت دار بەردیش بێت و داریش بێت لە هەمانکاتدا.

خوشك و براکەم، هەروەك گۆشەگیریی لە ئیسلامدا باش نییەو ڕێی پێنادرێ، هەر بەو شێوەیەش، بەڵکو بەزیادیشەوە، لەزەتپەرستیی دانی پیادا نانرێت. ئەی فەرموودەکەی پێغەمبەرتان ﷺ لەبیر چووەوە کە ئەیفەرموو: (ان الله لايجب الذواقين ولا الذواقات).

مام جەمیل: کچم، بیری ئەمان سەرگەردانە، جا گەر وانەبوایە وەها نەئەبوون.

دڵپاك: ڕەنگە سەرتان سوڕبمێنێت کە ئەڵێم، هاوسەرێتیی گرنگترین هۆو ڕێگەیە بۆ وەگۆڕکردنی لەزەتپەرستیی و هەوەس بازیی.

نەشمین: سەرسوڕمانی ناوێ، چونکە هاوسەرێتیی خۆی لە خۆیا لەزەتپەرستییە.

دڵپاك: بەداخەوە خوشکەکەم!! جا ئەگەر وەها بوایە، ئەی بۆ زۆربەی پیاوان و ئافرەتانی بێباوەڕی جیهانی ئەمڕۆمان هاوسەرێتیی بە بەستنەوە دەژمێرن؟ خۆ ئەوانە کڕیاری لەزەتپەرستین و لەزەتپەرستن، ئەی بۆ هاوسەرێتیی بە بخۆری سەربەستیی و بەرەڵڵایی بەناو ئازادی دەژمێرن؟ ئەی ئەمە ئیتر لەگەڵ قسەکانی ئێوەدا چەندی بەچەند؟!.

ئیسلام لە کلاوڕۆژنەی ماددەوە تەماشای ئادەمیزاد ناکات وەکو بەرنامە داتاشراوەکانی دەستی ئادەمیزاد، بەڵکو بەفراوانیی و لە هەموو سەرێکەوە تەماشای ئەکات، لەبەر ئەوە ڕێگەی پێنادات کەرێگەی لەزەت پەرستیی بگرێتە بەر.

هەروەها دانەری ئیسلام (ئەبیقوور) نییە کە لەزەت بە بنەڕەتی ڕەوشت دابنێ و بیکاتە مەبەستی سەرەکی ژیانی ئادەمیزادو خێر هەر لەوەدا بەدی بکات، فرۆید نییە کە مەبەستی ژیانی بخزێنێتە ناو چاڵاوی پەڕیینەوە، نەخێر.. نا، دانەری ئیسلام خالقی ئادەمیزادە، ئەو چاکتر لە هەموو کەسێك بە بەرژەوەندی خەلقکراوەکانی ئەزانێت، چۆن ڕوویان

وەرئەگێڕێ بەرەو لەزەت پەرستیی؟

هەڵکەوت: بەڵام لەزەتپەرستیی بەوشێوەیەو ئەوەندە مەترسیدار نییە!.

دڵپاك: ئای ئەوەچی ئەڵێیت كاك هەڵكەوت؟ یاخوا لەزەتپەرستیی نەكەوێتە ناو هیچ گەل و كۆمەڵگەیەكەوە، وێران و سەرگەردانی ئەكات، ئادەمیزاد بریتی نییە لەلایەنی لەزەتپەرستیی بە تەنها، بەڵكو بریتییە لە چەند لایەنێكی جۆر بەجۆر، هەركامیان لەسنوور دەربچێت، مەترسیی پەیدا ئەبێت، "محمد قطب"، لە "منهج التربیة الاسلامیة"دا ئەڵێت: "كاتێ ئادەمیزاد هەوەسێك لە هەوەسەكانی بەسەریا زاڵ ئەبێت.. هەوەسی سامان و دارایی، یان پەڕیین، یان هێزو دەسەڵات، ئائەوە تێكچوونێكە لەدەروون و ناخیدا، لەراستیشدا ئەوە بەختیاری ناكات، گەرچی لەسەرەتاوە وای بۆ دەرئەكەوێ كە خۆشبەخت و كامەران و بەختیارە، بەڵكو لە نارەحەتییەكی هەمیشەییدایە، چونكە بەوەی دەستی كەوتووە دڵی لەنگەو بەتەمای زیاترە، هەروەها ئەوە لارەسەنگییە لەواقیعی ژیان، هەموو زیادە هەوەسێك بەتەنیا خاوەنەكەی ناداتە بەر پلار، بەڵكو خەڵكی تریش لەسەرە ڕێگەدا پێوە ئەتلێن، چارنییەو خەڵكی تریش لەو هەوەسە لەسنوور دەرچووە تووشی زیان ئەبن".

ئێمە كاتی خۆی باسی مەسەلەی چەند ژنێتیمان بەدرێژیی كرد، جا ئەگەر لەوكارەدا مەسەلە لەزەتپەرستی بوایە چەند مێردییش ڕێگەی پێئەدرا. هیوادارم تفەنگ نەنێن بە تاریكییەوەو بیر لە قسە بكەنەوە لە پێش كردنیدا.

باجی عائیشە: بەخوا ڕۆڵەكانم، ئەو ڕاست ئەكات.

راستیی وەك خۆرە، بە جوانی دیارە

خۆشیی كەر تەنیا سەوزیی بەهارە

# بەشی دووەم

## شارستانییەت لەزەتپەرستی نییە

ئاواز: لەگەڵ ئەوەشدا، نابێ دەوری شارستانییەت و پێشکەوتن فەرامۆش بکەین.

دڵپاك: بەڵێ، لەناو زۆربەی کۆمەڵگەکاندا، شارستانییەت و پێشکەوتن (سەربەستییەکی!) زۆر بەربڵاویان هێنایە کایەوە. لەبیردا، لەقسەو باوەڕو کرداردا، سامانی بەدەمەبوو، لەوەشەوە خەڵك لەجیاتی ئەوەی ڕێگەی بەختیاری بگرێتەبەرو بەرەو کامەرانیی مرۆڤایەتیی بڕوات، دەستی کرد بەسووکارییو لەزەتپەرستیی، لەوەشدا ئەوەندە ڕۆچوو، دەستی لە هەموو ئامانجێکی گیانیی بەردا، پێوەری واتاکانی شەرم و حەیادارییو و ئابڕوو و بێگەردیی، خرانەژێرپێی فیلی مادەو لەزەتپەرستییەوە. هەرکەسێك لەناو ئەو کۆمەڵگانەدا ئەگەڕێت، سەربەستیی تەواوی لەژیانی تایبەتی خۆیدا هەیە، هەرچی بووێت ئەیکات، دوور لە چاودێریی یاسا، دوور لە تانەوبۆڵەی عورفو باو"، کۆمەڵگە سەرزەنشتی ناکات. لە هەمووی گرنگتر، بێئەوەی ترسێك لەدڵی هەبێت و لەکردەوە ناپەسەندەکانی بیگێڕێتەوە. هەرچی بۆ بلوێت ئەیکات، بەڵام ئایا ئەگاتە ڕادەی تێربوون؟ بۆچ ئارەزوو سنووری بۆ هەیە؟ ئایا ئەو جۆرە کەسانە، لەناو ئەو گەلو کۆمەڵگانەدا هێمنی دەروونو ئارامیی گیان بە خۆیانەوە ئەبینن؟

بەڵێ، دەوری پێشکەوتنو شارستانیەت نابێ فەرامۆش بکەین، بەڵام ئەو پێشکەوتنو شارستانییەتەی کە حەزو ئارەزووەکان بتەقێنێتەوە، نەوت و بەنزینیشیان بەسەردا بڕژێنێ، مەبەستی سەرەکی لە لەزەتپەرستییدا خۆی بنوێنێ، شێتییەتیی تاسەو هەڵپەی هەوەس و خارشی ئارەزوو هەموو ساتێ یاری بە ژێکانی دڵانو چاڵو چۆڵەکانی مێشك بکات، ئەوە چۆن پێشکەوتنو شارستانییەتێکە؟

چاوەکەم، کەی ژەهر ئەبێتە هەنگوین؟! ئەی بۆچ چاویلکە ئەکەن بۆ کورت بین؟ لەقسەکەی ئاواز خان چاك تێگەیشتم. بەڕای ئەو یەکێك لە بەرهەمەکانی شارستانییەت، عازەبییە، بەڵێ لەوەدا ڕاست ئەکات. لەناو ئەو کۆمەڵگانەدا هاوسەرێتی بە کۆت و زنجیرێك ئەژمێردرێت کە سەربەستییان تەسك و تروسك ئەکاتەوە، لەزەتپەرستییان لە کیس ئەدات. بەم بیانووەوە تاڕاددەیەکی زۆر، بە پەڕۆیەکی پیس کلکی هاوسەرێتی ڕاستەقینەیان گرت و لە سنووری وڵاتەکانیان دەریان کردە دەرەوە، هەوڵی بەرزکردنەوەی ئەو ڕادەیەش هەر بەردەوامە، چونکە لەو ڕێگەوە ئەوسا پیاوو ئافرەت کەوتنو ئەکەونە دۆزینەوەی دۆستو هاوڕێ! کەڵەو ماشقە بۆ خۆیان، نەگبەتییەکەش لەوەدایە، کە ئەو دۆستایەتییو هاوڕێتییو ماشقەبازییو کەڵەکارییە، زۆر ساردیی دای ئەپلۆسێنێ، زوو ئەبێزرێت، پەستییو وەڕەستیی زۆر بەسەر خۆیان ئەهێنێ، پاش ماوەیەکی کەم هەریەکە لەو دوو (خۆشەویستە!) ئەچێت بەدەم کاری خۆیەوەو بەدوای نێچیری خڕو خرپنی تازەدا ئەگەڕێ، دڵو گیانو بیرو هۆشی ئەوگاری بۆنی ئامێزێکی تری - لای ئەو- تازەن، ئەمەش بە گەورەترین دەستکەوتی شارستانییەت و پێشکەوتن، لە لایەن زوڕناقیبەکانەوە ئەدرێتە قەڵەم!.

سکاڵا: دەی خۆتانو ویژدانتان، ئەوە بۆچ لە ڕاستی سڵ ئەکەنەوە؟ ئایا وانییە؟ واقیعی ئەمڕۆی کۆمەڵگە بێباوەڕەکان، گەورەترین بەڵگە نییە؟

پرشنگ: مامۆستا دڵپاك شارستانییەت و پێشکەوتن بەخراپ دائەنێت.

دڵپاك: ببورە خانم، بەڵام تۆ ژیربێژیت هەر وەك ئاوێنە وایە، لای ڕاست ئەکات بە چەپو لای چەپیش ئەکات بەڕاست! من کەی وام گوت؟ پێشکەوتنو شارستانییەت، کاکڵەی بەرنامەی ئیسلامە، خوای گەورە مرۆڤی خستە سەر ئەم زەوییە تا ئاوەدانی بکاتەوە، ئەی ئاوەدانکردنەوە لەڕێگەی پێشکەوتنو شارستانییەتەوە نایەتە کایەوە؟، بەڵام

پێشکەوتن‌و شارستانییەت بەراو باوەڕی ئیسلام، ئەبێت لە دەروون، لە گیان، لە ناخ‌و بیرو هۆش‌و مێشکەوە دەست پێبکات، ئەبێ لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتییدا، لە پەیوەندیی جوانی مرۆڤانەی مەردمدا ڕەنگبداتەوە، پێشئەوەی کە لە تەکنۆلۆژیادا ڕەنگبداتەوە، ئەبێ ماددەکانی بوونەوەر بە چاکیی‌و پاکی ڕام بکرێن بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیی، لە کاتێکدا باوەڕو زانیاریی دەس لەملان بن‌و مرۆڤایەتیی مرۆڤ، بەهاکەی ڕۆژ بەڕۆژ بڵندتر بێت.

بەڵام ئەو شارستانییەت‌و پێشکەوتنەی کە بێئابڕوویی، بێحەیایی، ترس‌و بیم‌و هەڵەوەڕیی، هێنانەخوارەوەی ئادەمیزادی تێدا بێت بەرەو ئاژەڵێتیی، پڕ بێت لە درۆو گزیکاریی‌و ناپاکیی‌و وێرانکاریی‌و چەوساندنەوەو ئیستغلال‌و ماددەو لەزەتپەرستیی، بەڵێ ئیسلام تف ئەکاتە ناوچاوییەوە.

مام جەمیل: بەخوا کچم قسەکانی تۆ ڕاستن، ئەمانە چییان دیووە؟

## ژیانی عازەبی ناڕەوایە

هەڵکەوت: خوشکە دڵپاک، تۆ ئاماژەت کرد بۆ مەسەلەی عازەبیی‌و گوتت گۆشەگیریی (الرهبانية) لە ئیسلامدا نییە، وانەبوو؟

دڵپاک: بەڵێ.. بەڵێ وابوو، ئەو حوکمە هی من نییەو هی پێغەمبەرە ﷺ، ئەفەرموێ: "ان الله ابدلنا بالرهبانية الحنيفية السمحة"[1].

پرشنگ: دیارە گۆشەگیریی کارێکی ناپەسەندەو دژ بە خواستە لاشەییەکانی ئادەمیزادە، بگرە دژ بە خواستە دەروونییەکانیشیەتی، بەڵام عازەبیی، گۆشەگیری نییە، ئێ بۆچ ئادەمیزاد لە سەرەتای بەهاری تەمەنییەوە خۆی ببەستێتەوە بەخێزان‌و خێزانداریی‌و ئەرک‌و پێویستییەکانیانەوە؟ با چەند ساڵێك بە عازەبیی بژی، دوایی چاو ئەکاتەوە، ئەبێتە خاوەن تاقیکاری، دوای ئەوە هاوسەرێکی لەبار بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ‌و بەخۆشیی پێکەوە ئەژین، ئیتر بۆچ عازەبیی بدەینە پاڵ گۆشەگیریی؟ چ زیانێکی هەیە؟

سەربەست: نازانم ئیسلام بۆ ئەوەندە حەزی لە باسی هاوسەرێتییە؟!.

باجی عائیشە: کچم دڵپاک خان، وەڵامیان مەدەرەوە، ئەمانە مێشکیان پڕە، ویی!! خۆ دوو دوو سێ سێ لێی دێنە دەنگ! وەڵامیان مەدەرەوە.

دڵپاک: نا.. نا باجی عائیشە، گوێی مەدەرێ، قەیدی چی ئەکات، با بپرسن، خۆزگە مێشکیان پڕ بووایە، چی ئەپرسن با بپرسن، پرسین خراپ نییە.

خوشك‌و براکانم، هەروەك گۆشەگیری ناڕەوایە، عازەبیش بۆ کەسێك کەتوانای پەیداکردنی هاوسەری هەبێت، ناڕەواو حەرامە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "من كان موسرا لأن ينكح ثم لم ينكح فليس مني"[2].

لە بیرتانە کە گوتمان بەپێی فەرموودەی خواو پێغەمبەر ﷺ هاوسەرێتیی یەکێکە لە سوونەتی پێغەمبەران‌و پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ".. فمن رغب عن سنتي فليس مني".

جا فەرموون لێکی بدەنەوە، گۆشەگیریی کە وازهێنانە لە هاوسەرێتیی‌و وازهێنان لە خۆشیی دنیا، بە مەبەستی یەکلابوونەوە بۆ خواپەرستی، کە ئەمەیان بەپێی ئایینی ئیسلام حەرام بێت، ئەی ئەبێ عازەبیی وە کە مەبەست لەوەدا ڕابواردن‌و بەرەڵڵایی‌و سەر بە (...) کردنە، چۆن ڕەوایە؟ بە چ ژیرییەیەك پەسەندە؟ بەژیریی سەرمایەداریی‌و کۆمۆنیست‌و سەهیۆنییەت؟

---

[1] رواه البيهقي عن سعد بن ابي وقاص.

[2] طبرانيي وبيهقي.

نەشمین: ئاخر بۆچ نارەوایە بۆ؟ چ زیانێکی لێ چاوەنوار ئەکرێت؟.

جوان: ئاخر پاش چەند ساڵێك، ئەو کەسە ئەبێتە هاوسەر!

## ئەگەر خراپ نەبووایە ڕەنگە چاك بووایە

دڵپاك: پرسیارەکانی ئێوەش، بەشێکن لە ڕاکەی پرشنگ خان، هیچ شتێکی تازەیان تێدا نەبوو، "بۆچ ئادەمیزاد لەسەرەتای بەهاری تەمەنییەوە خۆی ببەستێتەوە بەخێزانو خێزانداریی و ئەرکو پێویستییەکانیانەوە؟". یان کە ئەیگوت: "با چەند ساڵێك بەعازەبیی بژی..".

ئەو خۆ نەبەستنەوەیە بە خێزانو خێزانداریی‌یەوە، ئەو ژیانیی عازەبێتییە، دوو شت زۆر بەزاقی ئەخەنە مێشکمانەوە، لەو دوو شتە بەدەر هیچی تر نییە، یەکەمیان: کۆمەڵێك نیشان ئەدات کە زۆر بەرەڵڵاو جنسباز بن، لە ڕێگەی هاوسەرێتیی ڕەواوە تێربوون لە جنس بەدی ناکەنو وا ئەزانن هەرگیز خارشیان نامرێت، یان بە سرووشت گەنیونو حەز لە بۆگەنیی ئەکەن، هەموو ئاواتێکیان لە سكو ورگو ناوگەڵیاندا ئابلۆقە دراوەو لەوە بەدەر هیچی تر بە بیرو هۆشیاندا نایەت، ئەم کۆمەڵە ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیا، بەتایبەتی لە خۆرئاوادا ئێجگار زۆرن.

پرشنگ: نا.. نا، خوشکە دڵپاك، تا ئەو ڕادەیەش نا، من مەبەستم ئەوە نەبوو.

دڵپاك: منیش مەبەستم تۆ نییە، بەڵکو باسی مەسەلەی عازەبیی ئەکەم، جا دووەمیان: کۆمەڵێك نیشان ئەدات کە توانای هاوسەرێتییان نییە، سەلیقەو گیانی بەجێهێنانی بەرپرسیارییان کزو لاوازە، فێری تەمەڵیی و خەو خۆشیی و زۆرخۆریی و حەسانەوەن، ئەرکی خێزانداریی‌یان پێ ناچێت بەڕێوە، لەبەرئەوە حەز لە ژیانی عازەبیی ئەکەن، ئەم دوو شتەش هەردووکیان بەلای ئیسلامەوە ناپەسەندنو نابەجێن، دەی ئیتر عازەبیی بۆ چاکە؟.

هەڵکەوت: لەوانەیە هیچ کام لەو دووانە نەبێ، عازەب ئەتوانی خۆی لە هەموو جۆرە خراپەیەك بپارێزێ، مەرج نییە ئامانجی عازەبێتیی ڕابواردنی دەرەوە بێت.

دڵپاك: ئەم قسانەی تۆ، نەسرووشتی ئادەمیزاد، نە واقعیی ژیان، هیچ کامیان لایەنگیریان ناکەن، تەنانەت خۆیشت لەناخدا پێچەوانەی قسەکانی خۆتیت، ئەی ئایا تۆ باوەڕت هەیە بەوەی کە بە مەرجەوە گەنجانی نێرو مێ بتوانن خۆیان بپارێزنو نزیکی جنس نەبنەوەو زاڵ بن بەسەر حەزی سرووشتیی خۆیاندا؟ ئایا عازەبەکانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا ئەو بۆچوونەی تۆیان سەلماندووە یاخود پێچەوانەی قسەکانی تۆیان سەلماندووە؟ خۆ فیکرەی عازەبیی لەسەر خاکی ئەواندا چەکەرەی کردو تۆوەکەی گەیشتە وڵاتی ئێمەی مسوڵمان.

مام جەمیل: کچم، ئەمانە منالن.. منالْ، خۆ خوێندەواریی هەموو شتێ نییە.

سەربەست: لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا قایل نیم بەوەی کە ژیانی عازەبیی خراپو مەترسیدار بێت، چونکە هیچی تیا نییە.

دڵپاك: کاکە گیان، لەیەك حاڵەتدا تۆ ڕاست ئەکەیت، ئەویش ئەوەیە، ئەگەر عازەبیی خراپ نەبووایە، ڕەنگە چاك ببوایە.

سکاڵا: ئەگەر تێگەیشتبێ، ئەو وەڵامەی بەسە، تێگەیشتی سەربەست؟

سەربەست: کوڕە بە شەرەفم عازەبیی یەك دەنك خراپەو مەترسیی نییە.

# مەترسیی عازەبیی

دڵپاك: كاك سەربەست، ئیسلام بەرنامەی خوایە، خوا لە هەموو زانایەك زاناترە، پێغەمبەر ﷺ، لەخۆیەوە قسەی نەكردووە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى *إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) سورة النجم.

ئیسلام كە گۆشەگیریی بە حەرام داناوەو عازەبیی بەشەڕ ناو بردووە، هەروا بێبنەڕەت ئەوەی نەكردووە، بێگومان مەترسییەكی فراوان لەو شتەدا ئەبێ ببێت، كە یەخەی تاكەكەس و كۆمەڵ بگرێت و ببێتە هۆی پەشێوییان.

جا با پێش هەموو شتێ ئاوڕێك بدەینەوە بەلای سرووشتی ئادەمیزادو پێداویستیە فیترییەكانیەوە، ئیسلام ئارەزووی جنس بە یەكێك لە وزە فیترییەكانی ئادەمیزاد ناو ئەبات و حسابی بۆ ئەكات، ئەم وزەیەش ئەبێ بەكاربهێنرێت، بەكارهێنانەكەشی ئەبێت لە ڕێگەی پاك و شیاوی خۆیەوە، سوود ببەخشێت نەك زیان، لە مەشدا وەك هەموو ئارەزووەكانی تری مرۆڤ ڕێگەی بۆ دیاریكراوە.

ئێوە خۆیشتان سەبارەت بە ڕازو باسی عازەبیی ئەزانن كە ڕاست ناكەن، جا بەشوورەیی ئەزانن كە ددان بەڕاستییدا بنێن، باشە ئەی بۆ بەڕۆژوو نابن؟ ئەی چۆن ئەتوانن لەڕووی جنسەوە بەڕۆژوو بن؟ ئایا عازەبیی وەك بەڕۆژوو بوون نییە؟ ئەی جنس وەك خۆراك پێویست نییە بۆ لەش؟

جوان: كوڕە هەرچی ئەبێ با ببێ، من ڕاستییەكە ئەڵێم، ڕاست ئەكەی.

دڵپاك: چی ئەبێ؟! هیچ نابێت، ڕاستیی خۆشەو مرۆڤ ئەگەیەنێ بە ئامانج.

دەركردنی ئەو وزەیە، لە لەشی ئادەمیزاددا زۆر زەرووییە، هێشتنەوەی زیانمەندو ناسروشتییە، بەڵام دەركردنی ئەبی بە شێوەیەكی بەكەڵك بێ، ئەو مەبەستەی كە پێویستە بێتەدی، ئەبێ بەپێی بەرنامەكەی خوا بێ، بەڵێ دەركردنی ئەو وزەیە لە زەت و خۆشییەكی گەورەی لەگەڵدایە، بەڵام نابێ دەركردنی تەنها لە پێناوی ئەو لەزەت و خۆشییەدا بێ، خالقی ئادەمیزاد ڕێگەی دەركردنی ئەم وزەیەی لە شێوەی هاوسەرێتیی حەلاڵدا بۆ دیاریكردووین، جا هەركە ئەو ڕێگەیەمان نەگرتەبەر، تووشی چەندەها مەترسی دێین كە گرنگەكانیان ئەمانەن بە كورتیی:

### 1- مەترسیی تەندروستیی

دیارو ئاشكرایە، هەركە عازەبیی لەناو هەر نەتەوەیەكدا بڵاوبووەوە، ئەوە یانی زۆربەی گەنجەكانی بەنێرو مێیانەوە، لە ژیانی كۆمەڵایەتییاندا، دەستیان داوەتە بەرەڵڵایی و بێئابڕوویی و لە زەمینەی خراپەكاریی و هەوەسبازییدا ڕەگیان داكوتاوە، چونكە دەروونی ئادەمیزاد ئەگەر جڵەوی لەخواترسانی لێداماڵراو هەستی نەكرد بە چاودێریی خوا، یان بایەخی پێنەدا، بێگومان لە لیتەی هەوەس و لەزەتپەرستیدا ئەچەقێت، لە بیابانی داوێن پیسیی و بەدڕەوشتیدا ڕێی لێگوم ئەبێت، ئەوسا شەرواڵ پیسی بڵاو ئەبێتەوە، بە بڵاوبوونەوەشی ئێش و ئازارو نەخۆشیی و دەردی سامناك بڵاو ئەبێتەوە لەناو ئەو نەتەوەیەدا، بەوەش لەش دائەهێنرێ و هێزو توانا بەرباد ئەبن، بەتایبەتی ئەم نەخۆشییە سامناكانە: (سیلان، زهري، تقرحاتي جنسي، القرح اللين، مرض النضج الجنسي المبكر..)[1].

جا هەر نەتەوەیەك كە ئەم نەخۆشیانەی تێدا بڵاو ببێتەوە، ئایا خێرو خۆشی لە تەندروستیی خۆی ئەبینێ؟.

نەشمین: ویی..! من هەرگیز ناوی ئەم نەخۆشیانەم نەبیستووە! كوا لە وڵاتی ئێمەدا ئەم جۆرە نەخۆشیانە، هەر ناویشیان نییە؟

دڵپاك: ڕاست ئەكەی، نەبوونیان لە وڵاتی ئێمەدا بەهۆی ئەوەوەیە كە داوێن پیسی پەرەی نەسەندووە، بەسایەی ئیسلامەوە تا ئێستاش خەڵك ئەو كارە بە پیس و گڵاو دەزانێ، ئابڕۆ نووسراوانی پزیشكەكانی وڵاتە بێباوەڕەكان بخوێنەرەوە بزانە چی ئەبینی!.

[1] عقبات الزواج/ د. عبدالله ناصح علوان، والأمراض الجنسية/ د. نبيل صبحي الطويل.

سکالاّ: زۆرمان ماندوو کردی مامۆستا دڵپاك، کاتی حەسانەوەیە.

**2ـ مەترسیی ڕەوشتیی و دەروونیی**

دڵپاك: گەلێجار، بە فێلبازانە لە کەلەبەری دەروونمانەوە عازەبیی و سەڵتی ئەرازێننەوە لەبەر چاومان، گوایا ئەگەر عازەب بووین دەروونمان سەلامەت و دوور لە گرێ ئەبێت، دەروونمان حەساوەو ئاسوودە ئەبێت.

بەپێچەوانەوە لەسەدا یەکی عازەبان توانای ددانگرتن بە خۆدا، سەرکوتکردنی ئارەزووی پەرینیان نییە، ناچار ئەبن بەبێئەوەی قول و قوڵی لێ هەڵبماڵن، خۆیان بهاوێژنە کەنداوی هەوەسبازییەوە، بەوەش ئەو ئارەزووە زاڵ ئەبێت بەسەر هەموو وزە لاشەیی و عەقڵیی و دەروونیی و گیانییەکانی ئادەمیزاددا، ئەوسا مرۆڤێکی خارشنی لێدەرئەچێت، ئیتر هەمیشە وەك پاڵی پێوە بنێن، بەشێوەیەکی سەیری شێتانەی بەجۆش ڕائەکات بە دوای ئارەزوو خارشە ئاژەڵییەکەیدا، جگە لە تێرکردنی ئەو هەوەسەی بیر لە هیچی تر ناکاتەوە، هەوڵ بۆ هیچی تر نادات.

ئەو جۆرە کەسانە بەزۆریی تووشی نەخۆشییەك دێن کەپێی ئەگوترێ (الهوس الجنسي)، ئەو کەسانە یان ئەو نەخۆشانە، هەمیشە بە بیرکردنەوە لە باس و ڕازو نیازی هەوەسبازیی و لەزەتپەرستییەوە بیرو هۆشیان پەشۆکاوە، لە بازنەی ماچ و موچ، دەستکردنە مل، گرتنە باوەش، بیرکردنەوە لە ئەندامانی ڕەگەزەکەی ترو چاوو گەردن و لێوو خەت و خاڵ و قاچ و قول و مەمك و..هتد، دەرناچن، هەموو شتێکی تر فەرامۆش ئەکەن، ئیتر تووشی لەبیرچوونەوە دێن، گرنگی بەشتی تر نادەن، هەمیشە بێئاگاو وێڵن، فامیان لاواز ئەبێت، کە ئەبینی گەمژەو پەست و مات و غەمبار دیارن، لەشیان دائەهێزێت، نەخۆشی دەروونیی سەریان تێئەکات.

هەروەها لە هەر ولاّتێکدا، خەڵك پەنای بردە بەر ژیانی عازەبیی، نەخۆی (الشذوذ الجنسي) واتە نێربازیی و پانێ بە پانێ بلاّو ئەبێتەوە، ئەوەش نەخۆشییەکی پیس و سامناکە، نێر بەر ئەبێتە نێرو (مێ)ش بەرئەبێتە مێ. ئەم نەخۆشییە ئەمرۆ ئالاّوەتە گەردنی ئەو کۆمەڵگانەی کە کالاّی پێشکەوتن و شارستانییەتیان پۆشیوە، بەتایبەتیی خۆرئاواییەکان، تەنیا لە شاری نیویورکی ئەمریکی نیو ملیۆن ئافرەت و پیاو تووشی ئەم نەخۆشییە هاتوون و بە ئاشکرا کردوویانە بە پیشەیان، ئاخۆ بە شێوەی نهێنی ئەبێ چەندی تر تێوە گلابن و خەریکی بن؟![1].

سکالاّ: سەربەست گیان، دەبا تۆو هەڵکەوت ئەمانەتان بۆ باس بکردینایە.

ئاواز: ژیری پەسەندی ناکات بەو پلەیە ئەو دیاردەیە هەبێت.

پرشنگ: چۆن؟ لە خۆرئاوادا باوەڕ ناکەم شتی قێزەونی وەها هەبێ!

دڵپاك: ئێوە هەژارو بەسەرزمانن، ئەوانەیش کە مامۆستایەتیتان ئەکەن، وریاو لێزانن، لەبەرئەوە نەیانهێشتووەئەم جۆرە باسانە ببیستن.

ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط) لە (وکالات الانباء)ەوە وەریگرتووەو لە ژمارەی ڕۆژی 1400/7/13 ساڵی کۆچی بەرامبەر 1980/5/27ی زایینیی خۆیدا بلاّوی کردەوە کە "سناتۆر کنیدی" کۆبووەوە لەگەڵ نوێنەرانی شازەکانداو پەیمانی دانێ کە بەرگری لە مافەکانیان بکات و ئەگەر بەسەرۆك کۆمار هەڵبژێررا پەیمانەکەی جێبەجێ بکات[2].

بەڵێ ئەو خۆرئاوایەی کە کراوە بە ڕووگەی "ڕۆشنبیران!!" ئەو دیاردەیە تیایا ئەوەندە پەرەی سەندووە کە لە ئەمریکای "پێشکەوتوودا!!" حەڤدە ملیۆن شازی جنسی تیایە! ئەو خۆرئاوا خاوەن شارستانییەتە ئەمرۆ یاسای بە ڕەوازانینی ئەو ئیشە بۆگەنەی داڕشتووەو بە کارێکی سرووشتیی کە بێگەردو پاك بێ دەیژمێرێ!، هەزاران کۆمەڵە پێکهێنراوە کە هەموویان ئیشوکاری ئەو شازە جنسییانە ڕائەپەڕێنن، چەندەها پەرستگەو کەنیسە هەیە لە ئەمریکا، کە پیاو ئەدا بەشوو بەپیاوو ئافرەت ئەدا بە ئافرەت و ئاهەنگی تایبەتیشیان بۆ ئەگێڕن.

[1] عقبات الزواج: عبدالله ناصح علوان ـ لاپەڕە (25).
[2] عمل المرأة في الميزان/ د. محمد علي البار.

بەڵێ، ئەو کۆمەڵانە لە ئەمریکاو کەنەداو ئەوروپادا بە شێوەیەکی فراوانی وەها بڵاوبوونەتەوە، کە ئەندامەکانیان وەزیران و کەسانی بەناوبانگیان گرتۆتە خۆیان. لە هەرێمی کویبك، لە وڵاتی کەنەدادا، سێ لە وەزیرەکانی، بەشانازییەوە شازێتیی خۆیانیان ئاشکرا کرد، سەرۆکی حزبی (الأحرار) لە بەریتانیادا، ئەویش ئەو دەردەیەتیی[1].

باسەکە گەلێ دوورو درێژەو حەز ئەکەم ئێستا لێرەدا بیبڕین و زیاتر لەسەری نەڕۆین، چونکە گوتمان بە کورتی لە زیان و مەترسیی ژیانی عازەبی بدوێین، جا نازانم ئێستا کاك سەربەست سەرزەنشتی ئیسلام ئەکات کە ئەوەندە باسی ژنهێنان و شووکردن ئەکات، یان نا؟

جوان: بەخوا باشبوو کۆتاییت بەوە هێنا، ئای کە باسێکی سامناکە!.

نەشمین: منیش قێزم ئەڕشایەوە لە کرداری ئەو دەعبایانە.

### 3ـ مەترسیی کۆمەڵایەتیی

دڵپاك: یەکێك لەو مەسەلانەی کە هۆشمەندان و چاکەخوازان و زانایانی کۆمەڵناسی سەلماندوویانە، کە گەنج و لاوی هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکان هەرکاتێ ڕێگەی سەڵتیی و عازەبییان گرتەبەر لەئەرك و بەرپرسیاریی هاوسەرێتیی ڕایان کردن مسۆگەر مەترسیی گەورەو سامناك ڕوو ئەکاتە ئەو نەتەوەیە.

نەشمین: بۆ؟، قسەکە کرا ئەبێ سەلماندنیشی بەدواوە بێت.

دڵپاك: ڕاست ئەکەی خوشکێ، گەنج و لاو کە زانی برسێتیی پەڕینی لە ڕێگەی ناڕەواوە بۆ تێر ئەکرێت، دڵنیابە کە بیر لە هاوسەرو پێکەوەنانی خێزان و منداڵداری ناکاتەوە، خۆ ئەگەر ئافرەت بێت، هیچ ناچار نییە سکی خۆی پڕ بکات و زەیستانیی و منداڵبوون بەسەر خۆیا بهێنێ، چونکە وەك ئاشکرایە سکپڕی ماندوویەتیی لاشەیی و کارتێکرانی دەروونیی بۆ ئافرەت بەدەمەوەیە، جا بۆ بیهێنێ بەسەر خۆیا؟ چ مەجبووری بەخێوکردنی زۆڵە؟! ئایا ئەم کارە هەڕەشە لە خێزان ناکات؟ ئایا ڕێگەیەك نییە بەرەو پێچانەوەی لاپەڕەی بوونی خێزان و خێزانداریی؟

سکاڵا: ها، کاك هەڵکەوت وەڵامت چییە بۆ ئەو پرسیارانە؟

دڵپاك: ئەی ئەو ئافرەتانەی کە سکەکانیان ناخەن و منداڵیان ئەبێت، کە شارستانییەت نازناوی (الأمهات العذاري)ی!! کردووە بە خەڵات و تاجی سەریان، کاتێ کە ئەو بەسەزمانانە پێئەگەن، ئایا پرسیار ناکەن کە باوکیان کواو کێیە؟ پاشئەوەی کە زانییان باوکیان مستەر نەزانراوەو کۆڵیان لە پرسیندا، ئایا بێنازیی باوك پەرۆ ئەکرێتەوە بۆیان؟ ئایا هەست بە نەنگ و شەرم لە خۆیان ناکەن؟ ئایا لە ڕووی دەروونییەوە ئاڵۆزو گرێدارو دەروون شێواو دەرنا چن؟ ئەی ئەوە هەمووی ستەم نییە لێیان بکرێت؟ ئایا ناهەقیانە ئەگەر ببنە جەردەو خوێنی ئەو نەتەوەو گەلە بمژن و هێمنیی و ئارامیی تیا ڕاو بنێن؟ ئایا.. ئایا..؟

باجی عائیشە: بەخوا ڕۆڵەگیان ڕاست ئەکەی، جا چی لەوە ڕاستترە؟

دڵپاك: جگە لەوەش، ئەوە ژیانی کلۆلیی و بەدبەختی بەسەر ئافرەت و پیاودا ئەهێنێ، چونکە ژیانی بەختیاریی و دڵنیایی و ئارامیی و هۆگریی هاوسەرێتییان لێ ئەشاردرێتەوە، کە تەنها لە ژیانی ژن و مێرددا ئەوانە دەست ئەکەون، ئایا ئەوە کەمە؟ چی لەوە مەترسیدارترە؟.

هەروەها ئەوانەی کە عازەبن و دوای هەوەس و ئارەزووی ئاژەڵییان کەوتوون، لای خەڵك بەتایبەتی خزم و کەسوکاری پاکی خۆی. ئەگەر هەیبێ. سووك و بێدرخ و هیچەو بەڕیسواو بێزلێکراوی ئەزانن، ئەویش داخی ئەوە ئەچێتە دڵییەوە دژیان ئەجوڵێتەوە، لێیان یاخی ئەبێت، گەلێجار ڕێکئەکەوێت دەست بووەشێنێ، چنگی بچێتە خوێنی نزیکترین کەسوکارییەوە، ئایا ئەمەش نابێتە هۆی شێوان و پچڕانی خێزان، ئەی نابێتە هۆی بارکردنی بەختیاریی خێزان؟ جا کە

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە (134ـ 136).

خێزان شێوا، ئایا کۆمەڵ و کۆمەڵگە بەپاکیی و سەلامەتیی ئەمێنێتەوە؟[1].

ئەو کۆڕپە جوانەی بەخێوی ئەکات، ئەم هیوای پێیە

ئەپرسێت، دایە بۆچ وەك کەسانی کە باوکم نییە؟

بۆچی پێم ناڵێیت؟، ئۆف بیری ئەکەم!، کوانێ لەکوێیە؟

چۆن تێیگەیەنێت؟، چ دایك، چ کۆڕپە، دە چاریان چییە؟

بۆتە هەڵگری جەوری پیاوان، یان هەڵگری زۆڵ

زامیی دەروونی ئێجگاریی قوڵە، سۆ ئەکات، دێشێ

بێکەس و غەمخۆر، بێ دەرەتانە، بەدبەخت و کلۆڵ

مەر خۆی بەتەنیا هەناسەی سارد و کاڵ هەڵبکێشێ[2].

نازدار: کاك هەڵکەوت و کاك سەربەستم، هەر کە دائەنیشن، هەر باسی دڵ و دڵخوازیی و سەربەستیی ئەورووپا ئەکەن و پێئەکەنن.

بەهار: بێئەوەی چاویشیان بە ئەورووپا کەوتبێ و دیبێتیان.

سەربەست: ئەی باسی چی بکەین کچە؟ ئەی ئەگەر پێنەکەنین، قوڕ بپێوین؟

مام جەمیل: کوڕم، بۆ ئەوانەی پێناکەنن ئەبێ قوڕ بپێون؟ نەخێر، ئێمە داوات لێناکەین کە قوڕ بپێویت، پێبکەنە، بەڵام جاروباریش دوو قسەی بە کەڵك بۆ خوشك و براکانت بکە، ئەی نازانی ئەگەر ئەوان سەربەرزو ڕووسوور بن، تۆی پێسەربەرزو ڕووسوور ئەبێت؟

سەربەست: ڕاستییەکەی من ئەم ئیسلامەی کە مامۆستا دڵپاك باسی ئەکات، قەد لە کەسم نەبیستووە، ئەگەر بەمجۆرە بێت زۆرچاکە.

دڵپاك: برای بەڕێزم، جا ئەگەر تۆ کە خوێندەوارو ڕۆشنبیریت، نەگەڕێیت بەدوای ڕاستیدا ئەی کێ بگەڕێ؟ ئەگەر خۆت بەدڵ کڕیارو پەیجووری نەبیت، لەکێی ببیستی؟ خۆ لە سینەماکاندا نایبیستی!.

## 4ـ مەترسیی ئابووری

دڵپاك: بێگومان ئەوانەی کە بیرو هۆشیان ئەپەشۆکێنن بەڕابواردن و بە لەزەتپەرستیی و هەوەسبازیی و شتی وەهاوە، بەزۆریی عازەبەکانن، ئەوانەن ئەبنە هۆی تێکشکان و وێرانکردنی ئابووری وڵات.

هەڵکەوت: جا ئەوە پەیوەندیی چییە بە ئابووریی وڵاتەوە؟

دڵپاك: ئەوە بەڕاستە؟! ئەو عازەبەی کە بەدوای داوێن پیسییەوە هەڵپەی ناوەستێتەوە، ژیریی، لاشەی، ڕەوشتی، دەروونی، ئەوگاری نەخۆشیی ئەبن، ئەوانیش هێزو وزەکانی لاوازو لەشی داهێنرراوو ورەی پەرتوکاو ئەبێت، ئیتر کەی ئەتوانێ بەشداریی لە بنیاتنانی شارستانییەت و پەرەپێدانی ئابووریی وڵاتدا بە دەورێکی کاریگەرو گەرمو گوڕ هەڵسێت؟ کەی ئەتوانین بڵێین کۆمەڵێکی سیسەڵەی لەش داهێنرراوی دەروون گەنیو، ئەتوانن پایەی ئابووریی وڵات بەرز بکەنەوە؟ کەی ئەتوانن وردەکاری لە ئیشا، دڵسۆزیی لە کارا، پێشکەوتن لە بەرهەما، لە زیادکردن و لە جۆریدا، بکەن و بهێننە کایەوە؟ کەسێك کە جڵەوگیری ئەکەن، ترس لە خوا لەخراپە نەیگێڕێتەوە، توخوا بە تەمای چیت لەو کەسە؟ تەنانەت بۆی بکرێ هەموو سامانی نەتەوەکەی ئەدزێت و خەرجی ئەکا بۆ تیاترۆو سەڵیتەو داوێن پیسەکان، لەپێناوی هەوەسی خۆیدا.

---

[1] تەماشای (عقبات الزواج)ی عبدالله علوان بکە.

[2] دیوانی سرووەی بێداری.

کاربەدەستی وڵات، هەر لە بچووکەوە تا گەورە، ئەگەر عازەبێکی هەوەسبازو لەزەتپەرست بوو . چ نێر چ مێ . ترسی خوای لەدڵا نەبوو، بۆ وەدەستهێنانی هۆی هەوەسەکەی ناپاکیی لە شتومەکی دەوڵەت ئەکا، سامانی ئەدزێت، بەرتیل وەرئەگرێت، تەنانەت دوور نییە کە پەنهانیی وڵاتەکەی بدرکێنێ و دوژمن کەڵك لەوە وەربگرێت، ڕووداوو کارەساتەکەی وەزیری جەنگی بەریتانیا لەگەڵ ئافرەتێکدا بەناوی (کریستین کیلەر) بەڵگەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرایە ئەگەر یاداشتەکانی ئەو ئافرەتەتان خوێندبێتەوە.

پرشنگ: بەڵام قوتابخانەی واقیع، ئەمڕۆ بە پێچەوانەی قسەکانی تۆوە ئەو مەسەلەیە ئەسەلمێنێ، چونکە ئەبینین ئابووری ئەمریکاو ئەوروپاییەکان، هێزو دەسەڵاتو پێشکەوتنیان، زۆر بەرزە لە کاتێکدا ژیانی عازەبیش لەناو ئەواندا زۆر باوەو هەموو سەربەستییەکیشیان هەیە.

ئاواز: قسەکەی زۆر زۆر ڕاستەو ناتوانین لەو ڕاستییە ڕا بکەین.

سەربەست: جا ئەگەر عازەبیی خراپ بووایە، ئەوان بۆچ ذەئەکەوتن؟

دڵپاك: خوشكو براکانم، کابرایەکی پیرو گەنجێکی خاوەن بازوو کە سەرەتای بەهاری گەنجێتییەتی، هەردووکیان نەخۆشیی و دەردێك ئەگرن بەکامیانەوە زیاتر دیارە؟ یاخۆ کامیان بەرگەی ئەو دەردە ئەگرێت؟

نەشمین: دیارە گەنجەکە زیاتر بەرگەی ئەگرێت، ڕەنگە پیرەکە تیابچێت.

دڵپاك: ڕاست ئەکەیت، بەڵێ خۆرئاوا گەنداوو زەلکاوی داوێن پیسیو عازەبییە، بەڵام لەسەرەتای بەهاری پێشکەوتنی ماددیدایە، بۆیە ئەو میکرۆبانە بە گورجیی کار ناکەنە لەشو گیانییەوە، ئەمە لەلایەکەوە، جا لە لایەکی تریشەوە، ئەو دەوڵەتانە خاوەن دەسەڵاتن، دەستیان گرتووە بەسەر زۆربەی وڵاتە بچووکەکاندا، چ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ، جا هەر شتێك کە لەدەستیان دەرئەچێ لە وڵاتەکانی خۆیاندان خێرا بەخێرو بێری وڵاتە بچووکەکان قەرەبووی ئەکەنەوە، وەك ئەو کەسانەی کە خوێنی خۆیان ئەفرۆشن، ئەبینی خۆراکیی پڕ لە ڤیتامین ئەخۆنو بەو کارەش قەرەبووی خوێنە فرۆشراوەکەیان ئەکەنەوە، بەڵام ئەوەش تا سەر بۆیان ناچێتە سەر، مسۆگەر پایزی تەمەنیان دێت بەسەردا[1].

سکاڵا: بەڕاستیی گەلە هەژارەکان ڤیتامیناتی ئەو وڵاتە زلانەنو هەموو خێروبێرێکی ئەمان ئەچێتە گیرفانی ئەو دڕندە بێویژدانانەوە.

دڵپاك: بەڵام ئێمە سەیرین! ئەمانەوێ ڕووداوەکانی ژیان، بەڕووداو نهێنییە پێچراوەکانیشەوە، هەموویان لە کاتێکی کەمدا بەچاوی خۆمان ببینین! ئەی نابێت پەند لەمێژووی پڕ لە کارەساتو ڕووداو وەربگرین؟ ئێوە هەر بیر لە فڕینو بەرزبوونەوە ئەکەن، کەچی نیشتنەوەو کەوتنە خوارەوە فەرامۆش ئەکەن، ئەها ئەم شاعیرە چەند جوانی گوتووە:

ما طار طائر وارتفع الا كما طار وقع

جوان: خەریکە هەست بە شەرمەزاری خۆم ئەکەم کە خۆم بە خوێندەوار ناوببەم، ئێمە وەك پێشینان گوتوویانە: "لە گوێی گادا خەوتووین".

دڵپاك: چاوەکەم، پێویست بە شەرمەزاریی ناکات، ژیانیش هەمیشە لەسەر یەك بەزم نابێت،بەرزیی و نزمیی، ساردیو گەرمیی، هەڵەو ڕاستیی تێدایە، مرۆڤی ژیرو هۆشیار ئەو کەسەیە کە پەندی لێوەربگرێت.

ئەوەی کە ڕۆیی نایەتە دواوە گوتت ڕابردوو یانی ڕووداوە

خۆت وریاکەوە بۆ لەمەودوا با نەڕوات لەدەست ئەوەی کە ماوە

### 5- مەترسیی بۆ سەر ئایینو دوارۆژ

دڵپاك: بەڵێ، ئەو عازەبەی کە ناتوانێت بێگەردیی خۆی ڕابگرێت، کە لەخوا ناترسێ و جڵەوگیری نییە، دووچاری

[1] لەم باسەدا کەڵکم لە (عقبات الزواج)ی عەبدوڵڵا علوان وەرگرتووە.

چوار سیفەتی ناشیرین دەبێت. (طبري) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ، ئەفەرموێ: "ایاکم و الزنى، فان فيه اربع خصال: يذهب البهاء عن الوجه، ويقطع الرزق، ويسخط الرحمن ويسبب الخلود في النار".

ئەو کەسەی کە داوێن پیسی ئەکات، لە کاتی کردنیدا، لەباوەڕ بە خوای پەروەردگار دائەماڵرێ: "لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن.." البخاري. با ئەوەشتان پی بڵێم کە سزای داوێن پیس لەڕۆژی دواییدا دووقاتە: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً *يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً) (الفرقان: 68 ـ 69).

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ، داوا لە مسوڵمانان ئەکات کە لەخوا بترسن و نزیکی داوێن پیسی نەکەونەوە، چونکە شەش مەترسیی گەورەی پێوەیە: "يا معشر المسلمين اتقوا الزنا فان فيه ست خصال: ثلاث في الدنيا وثلاث في الاخرة، فاما التي في الدنيا، فذهاب بهاء الوجه، وقصر العمر، ودوام الفقر.. وأما التي في الآخرة، فسخط الله تبارك وتعالى، وسوء الحساب والعذاب بالنار".

ئەگەر خۆمان گێل نەکەین و دان بە ڕاستیدا بنێین، خەڵکی ئەم کات و سەردەمەی ئێوە تەنها لەبەر یەك شتە کە حەز لە عازەبیی و سەڵتیی ئەکات، ئەو شتەش ئەوەیە کە (سەربەست)!! بێت لە ڕووی پەرپینەوە، خۆی نەبەستێتەوە بە هاوسەرێکەوە، بەڵکو هەموو گەنیوێکی تری وەك خۆی هاوجووتی بێت، هەروەك هەموو خۆراکێك ئەکاتە ورگییەوە، هەر بەو جۆرەش بکات لەگەڵ ناوگەڵیدا، ئیتر مەسەلەو بیانووەکانی تر کە عازەبەکان هەڵیان ئەدەن، لە درۆو دەلەسە زیاتر هیچی تر نین.

سکالاَ: کاك هەڵکەوت، باسەکانی ماموّستا دڵپاك پشتیان بە زانیاریی بەستووە، یان لە قسەی پیرەکانی گوێئاگردانی ئەوسا ئەکات؟

هەڵکەوت: ئەگەر ئەوەت نەدابایەتەوە لە ڕووم نەئەکرا؟، ئای سکالاَ.. ئای! بەڕاستیی باسەکانی هەموویان لەسەرچاوەی زانیارییەوە هەڵقوڵاون و زۆر چاك و بە کەڵکن، بەڵام هێشتا لە سەرەتای باسەکەداین.

جوان: بەخوا دان بەڕاستیدا ئەنێم، سا وەڵڵا ئادەمیزاد ئێستا بۆیە حەز لە ژیانی عازەبێتی ئەکات، کە قەپی خۆی لە ئارەزووبازیی بگرێت،کە وەك کراس و جلوبەرگ دڵدارو دڵخواز بگۆڕێ، کام شوێن ئەو کارو بەزمانەی تێدابێت ئەم خۆی بگەیەنێتە ئەوێ.

باجی عائیشە: دەی ڕۆڵەگیان، ئینسان بۆیە پێی وتراوە ئینسان کە لە ئیشوکاریدا وەك ئاژەڵ نەبێت، بەخوا ئاژەڵەکانیش ئەوە ناکەن، خۆ بەچاوی خۆمان ئاژەڵەکان ئەبینین، ئەی هاوار هەی!

دڵپاك: جا ئەگەر ژیانی عازەبیی بێمەترسیی و بە کەڵك بوایە، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، چۆن نەهیی لێئەکرد؟ بۆ ئەی فەرموو بە مسوڵمانان: "شراركم عزابكم، وأرذل موتاكم عزابكم"[1]؟، بەڕاستی هەر گەل و کۆمەڵگەیەك کە عازەبیی تیایا بڵاو بێتەوە، پاکیی و بێگەردیی لەو گەل و کۆمەڵگەیەدا بار ئەکات و ئەڕوات، پایەکانی ژیانی خێزانداریی دێنێتە لەرزە، منداڵی زۆڵ فرە دەبێت، بەختیارییش لەسەر دەستی زۆڵدا نایەتە کایەوە.

[1] ابو يعلي وطبراني گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

# خێزانداریی ڕزگارکردنی مرۆڤە لە خۆپەرستیی

پرشنگ: وەك باستکرد، ئیسلام ڕقی لە عازەبیی و سەڵتییە، خەڵك بەرەو ژنهێنان و شووکردن هەڵئەنێت، با بڵێین خێزانداریی کۆت و زنجیر نییە، بەڵام ئایا خۆبەستنەوە بەخێزانەوە ئادەمیزاد فێری خۆپەرستیی ناکات؟ هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی تەرخان ناکات بۆ خێزانەکەی؟.

مام جەمیل: کچم تۆ بە ئاشکرا دژی خێزان ئەدوێیت، ئەوە خراپە.. خراپ، هەر گەل و میللەتێك ژنهێنان و شووکردنی تێدا هەڵبگیرێت و بشارێتەوە، نابێ پێی بڵێین گەل و میللەتی ئینسانی، ئەبی ناوێکی تری لێبنێین.

دڵپاك: ئێوە سەلمێنراوەکان، تاقیکارییەکانی مێژووی مرۆڤایەتیی لەناو ئاودا تەماشا ئەکەن و ئەبینن، دیارە بەو جۆرەش بەهەڵگەڕاوەیی دێنە بەر چاوتان، قاچ لە جێی سەرو سەر لەجێی قاچدا دیارە!.

ئێوە بەلای خۆتانەوە، خۆتان بە ڕۆڵەی زانیاریی ئەزانن، کەچی قسەو بۆچوونەکانتان دژ بە گیانی زانیاریین، خەڵك پێمان دەڵێت ڕۆشنبیر!، جا ئەگەر ئەمە حاڵ و مێشك و گوتەی ڕۆشنبیران بێت، ئای کە ئەو ڕۆشنبیرییە بێکەڵك و چەواشەکەرە!، بەڵام ڕۆشنبیریی ڕاستەقینە چاوو دڵ و مێشك و هۆش و بیری ئادەمیزاد ئەکاتەوە، جا من نازانم بۆ ئەمەیانتان بزر کردووەو ئەویترتان بەرکەوتووە؟!

پێویستە ئەوە بزانین کە ئادەمیزاد گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتییە، یاخۆ وەك ئەڵێن، بەسرووشت شارستانییەت پەروەرە، حەزی لە ژیان و مانەوەی کۆمەڵایەتیی و هاوکاریکردن هەیە، بەڵام وا نەبێت هەر تەنها ئەو لایەنەی تێدا هەبێت، بەڵکو لایەنی ئاژەڵێتیی و منایەتیی و تاکەکەسیشی تێدا هەیە، جا ئەم لایەنەیان بە گژ لایەنەکەی تردا . لایەنی مرۆڤایەتیی . دەچێت، واتە دژایەتیی لە نێوان ئەو دوو لایەنانەدا بەسرووشت هەیە، هەر ئەمەش وای لە ئادەمیزاد کردووە کە ژیانی ئاڵۆز بێت، مێژووی پڕبێت لەو بەگژچوونەدا، باروودۆخی جۆر بەجۆر بە هۆی ئەوەوە کە ناوێزە (شاذ) بێت، بێتە کایەوە، کۆمەڵگە پەشێوو بزرکاو بکات.

لەبەر ئەوە ئەبینین یەکێك لە بواری ئەرك و کاری سەرشانی پێغەمبەران و چاکەخوازان، بەدرێژایی مێژوو، گونجاندن و سازاندن و ڕێکخستنی ئەو دوو لایەنە دژ بە یەکترییە بووە، بە گونجاندنی ئەو دوو لایەنە، تاك و کۆمەڵ پێکەوە سازاون، ڕەنگە پێتان سەیر بێت کە بڵێم، جوانترین و سەرکەوتووترین هەوڵدان، یان ڕێگە بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە پاك و پیرۆزە . واتە گونجاندن . هاوسەرێتیی و خێزانداریی بووەو هەروەهایش ئەبێت، چونکە کارێکی بە بەرهەمە، چ بۆ تاکەکەس، یان کۆمەڵگە.

هەڵکەوت: چۆن؟ ئایا ژیریی ئەو بانگەشەیەت ئەچەسپێنێ؟

دڵپاك: پێش هەموو شتێك ئەوە بانگەشە نییەو واقیعە، هی من نییەو بەرهەمی تاقیکاریی تەمەنی مێژووی ئادەمیزادە، با باسی بکەم، ئەوسا ژیریی خۆتان بخەنە کارەوەو ئەنجامی باسەکە هەڵبسەنگێنن.

بەهاوسەرێتیی، ئادەمیزاد کایەیەکی تایبەتی، لە سنوورێکی دیاریکراودا بۆ ئەڕەخسێ، کە ئارەزووی پەڕینیی خۆی تێدا جێبەجێ بکات، جا ئەبێ لە کایەکەی خۆی دەرنەچێت، واتە دەست بۆ بەشی کەسانی تر درێژ نەکات، هەروەها کەسی تریش دەست بۆ بەشەکەی ئەو نابێ درێژ بکات، بەمجۆرە لایەنی منایەتیی خۆی دابین دەکات، بە داڕشتنێکی تر، ژن و مێرد هەریەکەیان هی ئەویتریانە، ژن هی مێدەکەیەتی و مێردیش هی ژنەکەیەتی، بێئەوەی کەسێکی تر لەو موڵکەدا بۆی هەبێت داوای بەشدارییکردنی لێبکات، ئایا بەمشێوەیە لایەنی منایەتیی نایەتە دی؟ "کل المسلم علی المسلم حرام، دمه وماله وعرضه".

جوان: بەڵێ، وەڵڵا زۆرچاك دێتە دی و لەوەش چاکتر نییەو نابێت.

دڵپاك: بەکۆبوونەوەی ژن و مێرد، لەسەر بنەڕەتی خۆشەویستیی و ڕێزگرتنی یەکترو پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو لا، هاوبەشییکردنی یەکتر لە خۆشیی و ناخۆشیدا، تۆوی سرووشتیی مەیلی کۆمەڵایەتی چەکەرە ئەکات، ئەمجا پاش ماوەیەك منداڵ ئەکەوێتە نێوان ئەو دوو هاوسەرەوە، دیارە ئادەمیزاد منداڵی خۆی خۆش ئەوێت، ئەوسا هەردووکیان.

دایكو باوك . گیانو مەیلی كۆمەڵایەتییان چەكەرەكەی سەر دەرئەهێنێتو لقو پۆپو گەڵا دەرئەكاتو سێبەرو بەرهەمیشی بەدەمەوە ئەبێت.

بێگومان . وەك گوتمان . منداڵەكانی خۆیانیان خۆش ئەوێتو سۆزو نازیان پێئەبەخشن، ئەمانیش ئەوانیان خۆیش ئەوێت، چونكە لەسەر خۆشەویستیی پەروەردە كراون. ئەو خۆشەویستییە وا لە دایكو باوك ئەكات كە منداڵی خەڵكی تریان خۆش بووێت، منداڵەكانیشیان هەست بە ڕێزگرتنی دایكانو باوكانی تر بكەن، ئەم ڕاستییو دیاردەیەش تایبەتیی نییە، هەموو كەسێك لە دایكو بابو منداڵان ئەگرێتەوە. دەی ئایا بەوە مەیلی كۆمەڵایەتی پەرە ناسێنێ؟ ئایا گیانی منایەتیی نابێت بەژێر پێی گیانی كۆمەڵایەتییەوە؟

لەسەرێكی ترەوە، وەك ئەبینین، دایكو باوك بەرهەمی هەوڵو ڕەنجی تێكۆشانیان بۆ منداڵەكانیان ئەبێت، خەرجی ئەكەن لە پێناوی پێگەیاندنو بەختیارییاندا بەو پەڕی ڕەزامەندییەوە، تەنانەت دەستی یارمەتی درێژ ئەكەن بۆ ئەو خێزانانەی كە منداڵدارنو دەستیان ناڕەوات، دەی ئەمە لە كوێو خۆپەرستیی لەكوێ؟ ئادەی ژیریی خۆتان بخەنە كار. بەڕاستیی هاوسەرێتیی وەك قورئان باسی ئەكات (ایه من ایات الله)، بەڵام بۆ كێ؟، بۆ ئەو نەتەوەو میللەتەی كە بیری لێبكاتەوە.. بیر. (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم: 21).

سەربەست: كورە بەخوا من قەد ئەم باسە بەكەڵكانەم نەبیستووە!

نەشمین: ئەی بۆ نەڵێین، پێچەوانەی ئەم ڕاستییەمان بیستووە؟.

## خێزانداریی دەروون دروستیی، كۆمەڵ دروستییە

نەشمین: ئەمشەو گەلێ بیرم لە ژیانی خێزانداریی كردەوە، بەوەشەوە خەوم لێزڕا، جگە لە سەلبیاتیو تەنگو چەڵەمەی هیچ شتێكی تری نیشان نەدام، بەسەرێشەو مەینەتو ئەزیەتكێشان دێتە بەرچاوم!.

سكاڵا: ئای لەو دژایەتییەی كە تیایا ئەژی!، لەم سەرەوە وەها ئەڵێیت، لەو سەرەوە بەدوای كەلوپەلو پیتاكی خێزانداریی‌یدا وێڵیت! ئەی مەرجو پەیمان بۆ كوێ باریان كرد؟، ئەی پێشینان نەیانگوتووە: "هەژار بكوژەو دەستخەڕۆی مەكە"، دەی بۆچ هەژارێكی پێنەگەیشتووی بەسەزمان دەستخەڕۆ ئەكەیت؟، بۆ مێشكی ئەشڵەقێنی؟

هەڵكەوت: لەوەدا منیش لەگەڵ سكاڵادام، منیش ئەڵێم مەرجو پەیمان هیچ بە هیچ، تازەو با بردیو بڕایەوە.

جوان: نا... نا، قووڵی مەكەن، لەسەر ئەوەمان نەكردبێت، تەنها قسەیەك بوو لە دەمیا ترازا، مەیخەنە هەڵوێستێكی ژلۆقەوە، ئەها هێشتا خەو بەری نەداوە، ئەوەتا باوێشك ئەدات.

نەشمین: چۆن باوێشك نەدەم؟ دوێنێ شەو سەعات دوو خەوتین، مەلا بانگیدا دڵپاكو سكاڵا هەڵساون نوێژ ئەكەنو قورئان ئەخوێنن، خەویان زڕاندمو ئیتر هەر زیتەی چاوم هاتووە.

دڵپاك: وا دیارە نەشمین خان، ڕاست ئەكەن، لایەنی سەلبییەتت لە هی ئیجابییەتت بەهێزتر بێت، بۆیە هەر یەكەمیانت هاتۆتە بیرو هۆشەوە، ئەی هەست بەوە ناكەیت كە خۆت بەرهەمی دەزگای خێزانداریی‌یت؟، ئەگەر ئەو دەزگایە نەبوایە تۆیش نەئەبوویت، گەر بشبوویتایە بەمشێوەیەی ئێستا نەئەبوویت.

خێزان بنچینەی بەرژەوەندیی تاكەكەسیو كۆمەڵی لەسەر وەستاوە، بەو پێیەی خێزان پێویستییەكی سەرەكییو گرنگی تاكییو كۆمەڵایەتییە.

نەشمین: من وای لێ ئەزانم كە گوتم، فەرموو بزانم تۆچیو چۆنی لێئەزانی.

ئاواز: ئەی چۆن! دڵپاك ئیسلامە، ئیسلامیش داوای خێزانداریی لێ ئەكات.

دڵپاك: بەداخەوە!، من مسوڵمانم نەك ئیسلام، خوشكی ڕۆشنبیر، تا ئێستاش نازانی جیاوازیی چییە لەنێوان وشەی

ئیسلامو موسڵماندا؟!

خوشكو براكانم، خێزان دەزگایەكی گرنگو پێویستی كۆمەڵایەتییە، یەكەمین هێلانەیە كە كەسانی تێدا هەڵدێت، یەكەم قوتابخانەیە كە هەڵئەسێت بە ئەركی پێگەیاندنو پەروەردەكردنو ئامادەكردنی كەسان هەتا بتوانن پێشوازی ژیان بكەن، ئایا ناسكترین قۆناغی پەروەردەكردن ناكەوێتە ئەستۆی خێزانەوە؟، ئایا زۆربەی قۆناغەكانی گەشەكردنی دەروونیی، ژیریی، كۆمەڵایەتیی و لاشەیی، لەخێزاندا نایەتە دی؟

زۆربەی پەروەردیارەكان، رایان وابووەو هەم دیسان وەهایە، كە ئەگەر ویسترا منداڵ لە هەموو رووییەكەوە، بەشێوەیەكی رێكوپێك گەشە بكات، ئەبێ لە خێزانێكی رێكوپێكدا پەروەردە بكرێت، ئەی منداڵ دەروونی لە رەنگدانەوەی ئەو ژیانگەیەی كە تێیدا دەژی پێكنایەت؟ پەندێكی پیشینان هەیە كە دەڵێت: "گیا لەسەر بنجی خۆی ئەروێت"، قسەی ئەو زاناو پەروەردیارانەش، گاڵەیەكی هەوانتەو داوایەكی بێجیٚو ریٚو مەبەستێكی هەرەمەكیی نییە، بەڵكو لە بنجو بناوانی زانیاریی و تاقیكارییەوە ئەو قسانە ئەكەن، پێغەمبەری ئیسلام پێش ئەوان كەوتووە كە فەرموویەتی: "هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت لەدایك ئەبێت، بەهۆی دایكو باوكییەوە ئەبێ بە گاور، یان جوولەكە یان مەجووسی". ئیتر كەی راستە كە بگوترێت خێزانداریی لە سلبیات بەو لاوە هیچیتر نییە؟

بەڵێ، پاش چەندەها توێژینەوە كە زاناكان كردوویانو پێیان هەڵساون، بۆ زانیینی ئەو جیاوازییەی كە لەنێوان ئەو منالاٚنەدا، كە لە باوەشی خێزاندا گەشەیەكی رێكو پێك ئەكەن، لە ژێر باڵی سۆزو نازو میهرەبانیی دایكو باوكدا پێئەگەن، لەگەڵ ئەو منالاٚنەی كە لە دەزگاو پەناگاو دایەنگاو شوێنەكانی تردا، دوور لە دایكو باوكو كەسوكاریان پێئەگەن، زاناكان بە دڵنیاییەوە بۆیان دەركەوت كە زۆربەی هەرە زۆری بەشی دووەم، ئەوگاری نەخۆشییە دەروونییەكانو دەمارشێواوین، كەمو كوڕیی زۆر ئالاٚوەتە ژیانیانو ژیانیان سرووشتیی نییە.

هەروەها زاناكان بینییانو بۆیان دەركەوت كە زۆربەی تاوانبارانو ناوێزەو زۆڵەكەكان، رەوشت نارێكو ناپەسەندەكان لەو منالاٚنەی بەشی دووەمەوە پەیدا ئەبن، ئەمجا بۆیان دەركەوت: بۆ ئەوەی گەشەكردنی منداڵ بە شێوەیەكی سرووشتیی بێتەدی، پێویستە لەكایەیەكی سۆزبەخشانەی دایكو باوكدارییدا بژیو پەروەردە بكرێت[1].

سكالا: ئەوەشمان لەبیر نەچێت، كە خێزان سەرچاوەی سەرەكیی و بنەرەتیی لایەنی كۆمەڵایەتیشە لە منداڵدا، چونكە منداڵ لە خێزانەوە فێری زمان، بەها رەوشتییەكان، بیروباوەڕو ئایینو یاساو هەموو جۆرە رارەوێكی تر ئەبێت. بەتایبەتی لە سەرەتاوە. كە ئەو سەرەتایەش پەرگەمای پێكهاتن، (تكوین)ە لە كەسایەتیی ئادەمیزاد!.

سەربەست ئەڵێ.. ئەڵڵا، لەو دارشتنەی سكالا! ماوەیەكی تر ئەبێ ئیتر هەر بەدەمی ئەودا بروانین، بەلاٚم پێمخۆشە زانایش بیت، چونكە خوشكمی.

دڵپاك: هەمووومان ئەزانین كە منداڵ لەسەرەتای منداڵیدا، زوو شت فێر ئەبێ، ئەوەش كە فێری ئەبێت، بەچاولێكردن، لاساییكردنەوەو بیستن لە دایكو باوك، زۆر ئاسانتر، بەشێوەیەكی قوڵتر لە مێشكیا ئەچەسپێت، هەروەك ئەوەی لەو قۆناغەدا فێری ئەبێت، هەرگیز لە دواییدا لێی جیا نابێتەوە، بە دەگمەن نەبێت. "خوویەك بەجوانی بیگری، بەری نادەی هەتا ئەمری". ئەمەش ئەنجامی تاقیكردنەوە دەری بڕیوە.

لەبەرئەوە زاناكانی كۆمەڵناسیی، دەروونناسیی، پەروەردیارەكان، ماڵو خێزان بە پێویستییەكی گەورەو گرنگ ناو ئەبەن، بە پەرۆشەوە داوای خێزانداریی لە خەڵك ئەكەن، تەنانەت رووسیا لە بیرورِاكەی جارانی، كە ئەیویست خێزانداریی ریشەكەن بكات، بەنیازی دروستكردنی یەك باوەڕ لە دەروونی منالاٚندا، وازی هێناو وردە وردە دەستی كردەوە بە دانانو رێكخستنی خێزانداریی و ئاواتەخوازی رۆژێكن كە پلەی ئابووریی ولاٚتەكەیان ئەوەندە بەرز بێتەوە كە پیوستیان بە كاركردنی ئافرەت نەمێنێ، هەتا ئافرەت بتوانێ لا بكات بەلای خێزانداریی و پەروەردەكردنی منداڵەوە،

[1] المرأة بين البيت والجميع، البهي الخولي/ شبهات حول الاسلام، محمد قطب/ والحجاب، ابو الأعلى المودودي

وڵاتی (چین)یش هەر لەو بڕوایەدایە، (فردریك ئەنجلز) ئەڵێت: ".. نسبەتی گشتیی مەرگی منداڵان لەسەرەتای تەمەنەوە بەرەو زیادیی ئەچێت، بەهۆی کارکردنی دایکانەوە، ئەمەش کارێکی بێ چەندو چۆنە، رووداو گەواهیی لەسەر ئەدات . لێرەدا مەبەست کارکردنی ئافرەتە لە دەرەوەی ماڵدا"[1].

کیم ئیل سۆنگ ئەڵێت: "سێل (خلیه)ی کۆمەڵگەمانە، چونکە نزیکترین کەسان تیا پێکەوە ئەژین، دایکانو باوکان، ژنانو منداڵان، برایانو خوشکان، لەخێزاندا هەر بەساوایی منداڵ پەروەردەی ڕۆژانە لەو کەسانەوە وەرئەگرێ، ئێمە ئەتوانین لە خێزاندا پەروەردەیەکی چاك دابدەین کە وێنەی ئەو لە قوتابخانەو کۆمەڵگەدا نەبێ"[2].

ئاواز: ئەوە زۆر ڕاستە، کەس ناتوانێت دانی پیادا نەنێت.

## ئەو پرسیارانە لە ئافرەت بکە، نەك پیاو

پرشنگ: من ناڵێم ڕاست ناکەیت دڵپاك خان، بەڵام سەربەستییش خۆشە.

دڵپاك: بێگومان سەربەستیی تامو چێژی تیایە، بێسەربەستی ژیان بێواتاو بێکەڵكو نەبوونی لە بوونی چاکترە، ئێمەی مسوڵمان فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتتاب، لە گوێماندا ئەزرنگێتەوە کە فەرموویەتی: "متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا"؟ بەڵام کام سەربەستیی، پرشنگ خان؟ ئێمە شەیدای سەربەستیی موسڵمانانەین، نەك سەربەستی سەهیۆنیانە.

هەڵکەوت: سەربەستیی هەر یەك سەربەستییەو ناوەکەشی سەربەستییە.

دڵپاك: بەداخەوەکە بێئاگان، ئەو سەربەستییەی کە گەنجەکانی ئێمە بوون بە پەروانەی شۆڵە خامۆشەکەی، لە باسو ڕازی پەڕیین بەولاوە هیچی تر نییە، سەرچاوەی بانگەوازی ئەم سەربەستییەش سەهیۆنییەتە. لە نۆیەمین پرۆتۆکۆلی حوکمڕانانی سەهیۆنییەکاندا هاتووە: "بێگومان ئەم بەرەیەی کە پێئەگات لە جویم . واتە نایەهودیی . هەڵمانخەڵەتاندووە، بەهۆی ئەو سەرەتاو بیردۆزە (مبادئ و نظريات)انەی کە خۆمان ئەزانین بە تەواوی درۆو دەلەسەنو کەچی فێری خەڵکیان ئەکەین، ئەم بەرەیەمان ترشاندووەو بۆ گەنمان کردووە".

جا بۆ ئەوەی کۆسپو تەگەرەی ڕەوشتیی نەتوانێت بەرامبەر ئەو کارە بوەستێت، جوولەکە سەرمایەدارەکان، فەلسەیەکی تێرو تەسەلەیان داهێنا، کە بانگەوازی بەرەڵڵایی پەڕیین پڕ بەدەم بڵاوبکاتەوە، چ بە هوشیاریی و چ بە ناهوشیاری، هەزاران نووسەرو وێژەرو ڕۆژنامەگەرو پەروەردیارو فەیلەسوفو خاوەن ڕوانگە، دوای ئەو بانگەوازە کەوتنو ئیتر بە هەزارەها چیرۆكو شانۆگەریی و پەڕاو، کە بێئابڕوویی بە بڵندیی دابنێن، بە پیاهەڵدان داوێن پیسیی و ئەوێن بازیی و یارو ماشقەگرتنو تەنانەت بازرگانیی پەڕیین بەسەربەستی بدەنە قەڵەم، دەی ئەمە سەربەستییە؟! سەربەستیی ئەگەر ئەوە بێت خۆشە؟ ئای لەو سەربەستییە.. ئای!!.

سکاڵا: لەو باوەڕەدام کە سەربەستیی شەرم لەو بەزمو ئالۆزەیە بکات.

دڵپاك: فەرموون گوێ بگرن لە نموونەیەکی ئەو سەربەستیی پەروەرانە، لەو شاگردانەی سەهیۆنییەت، بزانن لە وڵاتی موسڵمانی ئێمەدا، چی بۆ ئێمەی مسوڵمانی بەچکە موسڵمان ئەنووسن، فەرموون گوێبگرن:

لە ڕۆژنامەی "النهار"ی بەیروتیدا هاتووە، لە ژێر سەردێڕی "امرأة بلادي للوجود والعشق والجنس"دا، کە مامۆستا (سەعد جومعە) لە پەڕاوەکەیدا (مجتمع الكراهية)دا ئەیخاتە ڕوو، هاتووە: "با باس لە سەربەستی ئافرەت بکەین.. ڕێم بدەن تا یەکسەر ددانی پیادا بنێم کە سەربەستیی ئافرەت جگە لە یەك مانا هیچ مانایەکی تری نییە، ئەو مانایەش پەڕینە!! ئافرەت بەپێی تێروانینی من دەریای حەزبازیی و هەوەس بازییە.. ئافرەت گیاندارێکی ئەویندارە، جگە لە

[1] المرأة التراث الاشتراكي، ل 35.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (216).

دڵفڕاندن و ئەوین و پەڕیین هیچ مانایەکی تری نییە".

سەربەستی ئافرەت کامەیە؟ سەربەستیی ڕاستەقینە بریتییە لە پەیوەندیی پەڕین لەگەڵ ڕەگەزەکەی تردا .واتە پیاو .، یان هەتا لەگەڵ کچانی هاوڕەگەزیا، یان لەگەڵ هەردوو ڕەگەزەکەدا!!".

"ئەی دەوری پیاو کامەیە؟ پێویستە لەسەر پیاو کە ئافرەت هەڵنێ، هانیبدا بەرەو سەربەستی، من بۆ ئافرەتی وڵاتەکەم داوا ئەکەم، کە کتوپڕ خۆی بدات بە دەستی پیاوەوە، هەر کە حەزی لێکردو هەوەسی بزواند!!".

من داوا لە ئافرەتی وڵاتەکەم ئەکەم، تەوقی چەوساندنەوەی خێزانداریی و ئایین و ڕەوشت بشکێنێت، کاتێ سەربەستە کە سنووری سەربەتیی نەمێنێ، لە پێش شووکردنیدا پەیوەندیی پەڕینی هەبێت.. سەربەست بێت لە گۆڕینی ئەویندارەکەیدا، هەرکە وەڕس بوو لێی.. سەربەست بێت لە لەشی خۆیدا، بە بێ قەیدو شەرت"[1].

دەی کاک هەڵکەوت سەربەستی هەر یەك سەربەستییە، ئەوە تاوان نییە ناوی سەربەستی بە سەرا ببڕێت؟ سەربەستیی ئافرەت ئەبێ بۆ چ تەنها لە پەڕییندا ببینرێت؟ ئایا ئەوە ئاوەڕووتکردنی ئافرەت نییە؟ بۆ چ ئەبێ کاتێك بە سەربەست بزانرێ کە یەکسەرو کتوپڕ خۆی بداتە بە دەست پیاوەوە؟ ئەی ئەگەر خۆی نەدا بە دەستییەوە بۆچ چەوساوەیە؟!

هەڵکەوت: جا لە من بۆ ئەپرسی؟ ئەی لە ئافرەتان بۆ ناپرسیت؟ هەق هەیە ئەو پرسیارانە ئاڕاستەی ئافرەتان بکەیت.

سەربەست: خەریکە سەربەستیم لەبەرچاو ئەکەوێ لە دلخی ئەوانەدا.

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، هەق هەیە پرسیارەکان ئاڕاستەی ئافرەتان بکرێن، بەڵام تاوانەکە بەزۆریی هی پیاوە، چونکە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئەوان زیاتر دەهۆڵی پڕ لە ساختەی ئەو سەربەستییە ئەکوتن.

[1] تەماشای پەڕاوی (عمل المرأة في الميزان)، ل 157 ـ 158، لە دانانی د. محمد علی البار بکە.

# بەشی سێیەم

## وەڵامەکان ئەخەینە دوای نوێژی هەینی

هەڵکەوت: خوشکە دڵپاك، تۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە لە چییەوە هەڵئەگۆزیت؟

دڵپاك: ئاشکرایە کە لە ئیسلامەوە، ئەی بەڵگەم قورئان و فەرموودە نەبوو؟

هەڵکەوت: هیچ کەس ئینکاریی چاکەی ئیسلام ناکات، بێگومان چاکەی بەسەر هەموو مرۆڤایەتییەوە هەیە، رووی سەرزەوی گۆڕی، مێژووی بەجارێکدا گۆڕی، بەڵام ئەوە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوودا بوو و بڕایەوە، واتە وەك هەموو بەرنامەیەکی تر ماوەی بەسەر چوو، بە کەڵکی ئێستا نایەت.

ئاواز: ڕاکەی کاك هەڵکەوت زۆر تەواوە، ئێمەش کە ئەمڕۆ دەستمان لە ئیسلام بەرداوە هەر لەبەر ئەو هۆیەیە، ئەگینا باوەڕەمان بەخوا هەیە.

پرشنگ: هەروەها ژیانی ئەم سەردەمە لە هی ئەو سەردەمە جیاوازە، ئێستاش بەرنامەی تازە دانراوە کە هەنگاو ئەنێت بەرەو بەختیاریی ئافرەت.

نەشمین: لام وایە خوشکە دڵپاك لەم ڕووەوە نەشارەزا بێت، بۆیە هەر. .

باجی عائیشە: کات خەریکە درەنگە، نانەکەی نیوەڕۆتان بخۆن ڕۆڵەگیان.

سکاڵا: با نانەکەمان بخۆین، کاتی نوێژی هەینیش دێتە پێشەوەو ئەبێ ئێمەش دوای نیوەڕۆ بڕۆینەوە، هەڵسن با بچین نانەکەمان بخۆین.

سەربەست: من وای بەچاك ئەزانم کە ئەم دوانیوەڕۆیەو ئەمشەویش پێکەوە بین، زۆر حەز لە باسەکە ئەکەم، خۆ نەشمین و پرشنگ و جوان دەوامیان لە شاردایەو فریا ئەکەون، بەیانی زوویش من لەگەڵ سکاڵاو مامۆستا دڵپاکدا بە ئۆتۆمبێل ئەڕۆم بۆ قوتابخانەکەیان و فریای دەوامیان ئەخەم و خۆم ئەگەڕێمەوە.

جوان: بەڕاستیی ڕایەکی جوان و پەسەندە، خۆزگە مامۆستا دڵپاك قایل ببوایە.

مام جەمیل: منیش ئەوەم زۆر پێخۆشە، مامۆستا دڵپاك چی ئەفەرمووی؟

دڵپاك: مادام هەموو لایەکتان پێتان خۆشە، منیش قایل ئەبم، بەو مەرجەی مۆڵەت لە دایکم و باوکم وەربگرم و ڕێم پێبدەن.

مام جەمیل: دەی فەرموو، خۆت بە تەنها بڕۆ بۆ ئەو ژوورەو بە تەلەفۆن ئاگاداریان بکە، ئەگەر ڕازی بوون حەز ئەکەم بمێننەوە.

"مامۆستا دڵپاك بە تەلەفۆن هەواڵەکەی گەیاند بە ماڵەوەیان، ئەوانیش مۆڵەتیان پیدا، گەڕایەوە بۆلای ئەمان و پاش سەلامکردن دانیشت".

دڵپاك: وەڵامی ئەو پرسیارانە ئەخەینە دوای نوێژی هەینی ئینشائەڵڵا.

## ماف مافی تۆیە

دڵپاك: من ئەم پرسیارە ئاڕاستەی ئێوە ئەکەم، جا فەرموون وەڵامم بدەنەوە، پسپۆڕێك، پرۆفیسۆرێك، کە بەدرێژایی ژیانی دەستی لە گێڕو سوککانی ئۆتۆمبێل نەکەوتبێ، کابرایەکی هەڕەمەکیی نەخوێندەواریش، کە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ ئۆۆمبێلدا ژیابێت و مامۆستایەکی چاکیشی پێی مسی بێت، کامیان چاکتر لە ئۆتۆمبێل و لێخوڕیین ئەزانن؟

هەڵکەوت: بێگومان ئەوەیان کە لەگەڵ ئۆتۆمبێلەکەدا ژیاوەو مامۆستاشی هەبووە.

پرشنگ: بەڵام ئەگەر بێتو ئەویتریان بۆ ماوەیەك دەست بداتە فرمانەکەی ئەمیان لەوانەیە لەویتر زووترو چاکتر فێر ببێت، ئایا وانییە؟

دڵپاك: تۆ ئەڵێیت ئەگەر، (ئەگەر)یش ئامرازی مەرجە، دیسان، ئەڵێیت، (لەوانەیە)، بەڵام من بە دڵنیاییەوە ئەڵێم هەرکە ئامرازی مەرجەکە بەکارهێنرا، ئیتر هیچ پێویست بە (لەوانەیە) ناکات، چونکە ئەوسا پسپۆڕەکە یاخۆ پرۆفیسۆرەکە لە کاروبارو لێخوڕینی ئۆتۆمبێلدا، پێش نەخوێندەوارەکە ئەکەوێ.

جا خوشكو براکەم، ئێوە هەرچەندە خوێندەوارنو خەڵك بە ڕۆشنبیرتان ئەزانێت، سەد ئەوەندەی تر خوێندەوار بن، تا بەم جۆرە لە ئیسلام دووربن هیچی لێنازانن وەك ئەو پرۆفیسۆرەی کە لە ئۆتۆمبێل دوور بووە، ئێوە بە مسوڵمانانە نەژیاون، نەشارەزای بەرنامەی ئیسلامن، یاساکانی ناناسن چونکە نەتانخوێندوون، دیراسەتان نەکردوون، مامۆستاتان نەبووە، خۆیشتان مەبەستتان نەبووە کە لێی بکۆڵنەوە.

من ناڵێم خوێندەوار یان ڕۆشنبیرم، بەلام بەهۆی باوکمەوە، بەهۆی دایکمەوە. خوا پاداشتیان بداتەوە. شتێك دەربارەی ئیسلام ئەزانم، لەگەڵیان ژیاوم، لەسەر بەرنامەکەی، هەنگاوەکانی ژیانم هەڵگرتووە، سەرچاوەی پاكو چاکیان خستۆتە بەردەستم، خوێندنەوەم زۆر بووە، باوکیشم مامۆستایەکی دڵسۆز بووە بۆم، پێش ئەوەی باوکێکی میهرەبان بێت، لەبەرئەوە لە ئێوەمانان شارەزاییم لە ئیسلامدا زیاترە، دەی ئێستا مافی حوکمدان بەسەر بەرنامەی ئیسلامدا هی منە، یان هی ئێوە؟

هەڵکەوت: بێگومان ماف مافی تۆیە، چونکە تۆ شارەزای مەسەلەکەیت.

جوان: بەخوا وەهات بەستیینەوە کە تەكو جممان نەبێت، ماف مافی تۆیە.

دڵپاك: دەی بەرنامەی ئیسلام چاکترینو تێروتەسەلترین بەرنامەیە بۆ هەموو ڕۆژگارو شوێنێك هەتا هەتایە.

## چۆن خوێندنێك بووە؟!

نەشمین: بەڵام خوشکە سکاڵا، تۆ وا هەست ئەکەیت کە ئێمە هیچ لە بارەی ئایینی ئیسلامەوە نازانین!، ئەوە ڕاست نییە، چونکە زۆر شتمان خوێندووە هەر بە خوێندن دەربارەی ئیسلام، ئەی ئەمەیان چی لیّ ئەکەیت؟

دڵپاك: ئەوەیان زۆر چاك ئەزانم، هەر نەك تەنها خوێندووتانە، بەڵکو دراوە بە گوێتاندا، بەشێوەیەکی خەستو خۆڵ، ترشو خوێیشی پێوە کراوە، ئەی بۆ منیش وەك ئێوە ئەوەم نەخوێندووە؟ چۆن خوێندنێك بوو، بەرنامەو پرۆگرامێك کە قەشە (زویمر)و ئەوان بیڕازێننەوە، ئەبێ چۆن بێ؟!

بەڵێ، لەوانەکانی مێژوودا خوێندووتانە. کە بەرنامەو پرۆگرامەکەی لەلایەن ناحەزانەوە دانراوە. کە ئیسلام بۆ ئەوە هات، بتپەرستیی نەهێڵێتو خەڵك بەرەو خواپەرستی بەرێت، عەرەبەکان چەند هۆزێکی پەرتەوازە بوونو بەگژ یەکترا ئەچوون، یەکی پێگرتنو کردنی بە نەتەوەیەك، ئارەقیان ئەخواردەوەو قوماریان ئەکرد، ئەوەی پیّ تەرککردن، داوێن پیسیو کچ زیندەبەچاڵکردنو چەند ڕەوشتێکی تری پیسی وەك سووکایەتیو تۆڵەسەندنو.. هتد، پیّ لەناو بردن، شەڕیان کردو بەزۆری شمشێر خەڵکیان مسوڵمان کرد، ئیتر بڕایەوەو بەسەرچوو، ئەوەش دەورو موهیممەیەکی مێژوویی بوو، مێژوو پێچایەوەو چووە ناو لاپەڕەکانییەوە.

توخوا لەمە زیاتر چیترتان لە بارەی ئیسلامەوە خوێندووە؟ چیتر ئەزانن، جگە لەو پڕوپاگاندانەی کە هەمیشە دژ بە ئیسلام ئەدرێت بەگوێتانا؟! ئایا ئەوە پێئەوترێت شارەزایی لە ئیسلام؟، خوێندنو دیراسەی ئیسلام، یان گۆڕیینو قێزەونکردنو داماڵینی گیانی ئیسلام؟.

جوان: کچە بەخوا ناوەڕاستی نیشانەکەت پێکا، ماشائەڵڵا کە دەستت ڕاستە!

دڵپاك: خوشكو برا بەرێزەکانم، من ئەزانم ئەو قسانە هی خۆتان نینو لە خەڵکەوە وەرتان گرتوون، نەچوون بە

دوایانداو ئەوان هاتوون بەدوای ئێوەدا، بەڵام نازانم چۆن یەکسەر باوەڕیان پێئەکەن و وەك سەلمێنراوێکی چەسپاوی زانستییانە لای خۆتان ئەیانهێڵنەوە؟ نەك هەر ئێوە بە تەنها، بەڵکو زۆربەی خوێندەوارەکانمان . ئەمەش بە داخەوە ئەڵێم . ئەم نەنگەیان تێدا بەدی ئەکرێت.

ئەو قسانەی کە فێریان بوون و ئەیانڵێنەوە، ڕاست نین، . لەگەڵ ڕێزمدا بۆ ئێوە . درۆ و بوختانن، تاشراوی دوژمنانی خواو بەرژەوەندیی مرۆڤایەتیین، بەپێی پلانی کوفر دانراون، ئەوانەش کە ڕەواجیان پێئەدەن، یان ناشارەزان لە ئیسلام، یان پەروەردەکراوی ژەك و شیری کوفرن، ئێوەش سوپاس بۆ خوا، لە دەستەی یەکەمن، نەك دووەم، واتە نەشارەزان.

کوفر ئەزانێ کە ئەو قسانە گومان لە دڵی مسوڵماناندا دروست ئەکەن، بۆیە بە هەموو هۆیەك ئەیانگەیەنێتە گوێی بەچکە مسوڵمانانن هەتا دڵیان سارد بێتەوە لە ئایینەکەیان، خۆیان لە نێو خۆیاندا بەم هەراو دەمەدەمێیەوە گیرۆدە بکەن، لە هەمانکاتدا ئاگایان نەمێنێ بەسەر پلان و فڕوفێڵی پیسی کوفرەوە تا ئەوکاتەی کە کافران ئەگەنە مەبەستی خۆیان.

ئەها سەرنج بدەن، ئێمەی بەچکەمسوڵمان، لە جیاتی ئەوەی گیروگرفتەکانی ژیانی ڕۆژانەمان بخەینە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەوە، ئەوەتا بەم باسانەوە، کە هەموویان ڕەخنەی تاشراوی خۆرئاواییەکانن مێشکی خۆمان ماندوو ئەکەین، بەربووینەتە شەڕە قسەو شەڕە بیر، لە کاتێکا دوژمن لە ستراتیجیەتی خۆی دەست هەڵناگرێت، دڵنیاش بووە کە ئێمە پەشۆکاوین و لەناو تۆڕی فڕوفێڵی ئەودا دەست و پەل ئەهاوین، بیرمان نییە بەسەر کاری ئەوەوە، ئەمەش بۆ ئەو شتێکی کەم نییە.

لە سەدەی هەژدەهەمین و نۆزدەهەمینی زاییندا، زۆر لە خۆرئاواییەکان، کە سەرکەوتنی زانیارییان بەدەستهێنا، ئیتر وایان ئەزانی ئایین هیچ کاریگەرییەکی بۆ نەماوەوتەوەو مەبەستەکانی تیاچوون، هەندێ لە زاناکانیان کەوتنە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لەدژی ئایین، لەڕاستیشدا ئەوە بەهۆی ئەو تاڵاوو سوێراوەوە بوو کە لە دەستی کەنیسەو پیاوەکانی چەشتبوویان، بەڵام هەڵەکەیان لەوەدابوو کە هەموو ئاینێکیان وەك یەك ئەدایە بەرپلانی پڕوپاگەندەی ناڕەوا، بەبێ ئەوەی ئاگاداری گیانی ئایینەکانی تر بن، بەتایبەتیی ئیسلام.

ئەو دەردە تەشەنەی کردو گەیشتە خۆرهەڵاتیش، خۆرهەڵاتییە بەسەرزمانەکانیش بە کوێرانەو لە چەشنی چاولێکەرییدا، کەوتنە دوژمنکاریی لەگەڵ ئایینەکانیاندا، بەشێکیش لە بەچکە مسوڵمان هەر بەو جۆرە، وایان ئەزانی ئەگەر واز لە ئیسلام بێنن، ئیتر بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پێش ئەکەون، دیارە دەستی سەهیۆنییەت و سەلیبییەتی جیهانییش یاری بەژێی بیرو هۆشی ئەو جۆرە کەسانە ئەکردو ئاهەنگی هەمەجۆری بۆ ساز ئەکردن.

سکاڵا: کەم و زیادی نییە، ئێمە بە کوێرانە دژایەتیی ئەکەین لەگەڵ ئیسلامدا.

## چاو لەکام کۆمەڵیان بکەین؟

سەربەست: خوشکە دڵپاك. وا نەبێت ئەورووپییەکان هەموویان دژی ئایین بن، زۆر لە زاناکانیان باوەڕیان بەخوا هەیەو خاوەن ئایینن.

دڵپاك: ڕاست ئەکەیت براکەم. نەك هەر تەنها ئەورووپییەکان، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە خۆرئاواییەکان . بەتایبەتی ڕۆشنبیر . باوەڕێکی پاکی بێگەردیان هەیە بەخواو ڕۆژ بەڕۆژیش ژمارەیان بەرەو زیاد بوون ئەچێت و چاکتر هەست بە گرنگیی کاریگەریی ئایین لەژیانی ئادەمیزاددا ئەکەن، جا ئەو زاناو پسپۆڕانە لەسەر بنەڕەتی زانست و زانیاریی باوەڕیان هێناو باوەڕ دێنن، جا نازانم بەوانیش بڵێین کۆنە پەرست و دواکەوتوو؟

پرشنگ: نا.. نا، چۆن شتی وا ئەگونجێت؟ ئەوانە کەڵە زاناو بلیمەت و شارەزان.

هەڵکەوت: جا کوفر نییە کە بە (باسکاڵ، مێریت ستانلی کونجدن، ڕاسل تسارلز ئارتست، ئەنیشتاین، لورد کلیفن،

ئیقڵ.. هتد)، بگوتێرت کۆنەپەرستو دواکەوتوو؟ ئەی کێ پێشکەوتوو بێت؟

دڵپاك: بۆچ تەنها ئەوانەن؟ بۆچ لە ژمارە دێن؟ ئەی ناوی (ڕوبرت موریس بیج، ماکس پلانك، ولیام جێمز، دکتۆرسیسڵ ھامان، جۆرج ئیدل دافیز، ڕوجیە گاروودی، لورد هەلی، کمال الدین ئنگلیزیی، لیۆپۆلد ڤایز، ئیتین دینیە، عبدالکریم جرمانووس، تۆماس کاریل، تۆڵستوی، جان بروا، جۆرج بردناردشو، ئەندرو کونو ئی ئیفی، جینز برج، سومرست سۆم، ئەدیسۆن.. هتد)[1].

ئایا ئەمانە هەموو هەر دواکەوتوو و کۆنەپەرستن، چونکە بەلای ئاییندا مەیلیان هەیەو خاوەن باوەڕن بەخواو بەگرنگیی ئایین لەژیانی ئادەمیزاددا؟

نەشمین: نەخێر.. نەخێر، ئێمە شتی وەها ناڵێین، ئەوانە ناسراوی گێتین، ئەوانە ئەستێرە ورشەدارەکانی ئاسمانی زانیاریی و پێشکەوتنن.

دڵپاك: حەزئەکەم بزانن کە من مەبەستم لە باسی دژایەتییکردنی خۆرئاواییەکاندا بەرامبەر بە ئایینن هەموو خۆرئاواییەکان نەبوو، بەڵام لێرەدا لێتات ئەپرسم: "ئێمە لە ڕووی ئایینەوە چاو لەو زانایانە بکەین ڕاستترە، یان لەوانەی کە لە باڕو مەلهەو شوێنەکانی داوێن پیسییدا بیرو هۆشی خۆیانیان لە دەست چووە؟ کام کۆمەڵیان دۆست بە بەرژەوەندیی مرۆڤایەتین؟

جوان: ئەم پرسیارەی تۆ وەك ئەوە وایە کە بڵێین، شەکر شیرینە یان ژاری مار؟ دیارە زاناکان دۆست بە بەرژەوەندیی ئادەمیزادنو ئەبێ چاو لەوان بکەین.

## نازانن ئیسلام بۆ چ شتێ هاتووە!

ئاواز: واتە تۆ لەسەر ئەوە سووریت کە ئیسلام مەبەستەکانی تا ئێستاش کاریگەرییان هەر ماوەو نەبڕاوەتەوە؟ باشە لەوەدا پشت بەچ بەڵگەو سەلماندنێك ئەبەستی مامۆستا دڵپاك؟.

هەڵکەوت: پرسیارەکەی ئاوازخان لە دڵی منیشدا گینگڵی ئەدا.

دڵپاك: ئەوانەی کە ئەڵێن ئیسلام دیاردەیەکی مێژوویی بوو بەسەرچوو، حەقیقەتێکی زۆر گەورەو گرنگو سەرەکیی هەیە کە نایزانن، یان ئەیزانن، بەڵام خۆیان لا ئەدەن لێیو ئەیخەنە پشتگوێ، ئەو حەقیقەتەیش ئەمەیە، ئەوانە نازانن، یان نایانەوێ بزانن ئیسلام بۆ چ شتی هات.

بۆیە بە ئێوەو ئەوانیش ئەڵێم: ئیسلام هات بۆ ئازادکردنی مرۆڤ، ئازادکردنی لە هەموو دەسەلاتێکی سەرزەوی، کە ئەو دەسەلاتە ویستی ڕاپەڕینی مرۆڤ پێ بەست بکاتو ڕێی لێبگرێ لە کاتی ڕێ بڕینییدا بەرەو شارستانییەتو ئاوەدانکاریی و خێرخوازیی مرۆڤایەتی، ئەم ـ واتە ئیسلام ـ ئادەمیزادەکان بجوڵێنی تا بدەن لە گەردنی ئەو دەسەلاتەو نەیهێڵن، سا ئیتر هەر جۆربێ و لە هەر کاتو شوێنێکا بێ.

هەڵکەوت: بێ بەڵا بی، تۆ هەمیشە شێوازێکی فەلسەفیی ڕەق بەکار ئەهێنی، دەی باسەکە بەشێوازێکی ئاسانی خۆمانە، ڕوونتر شیبکەرەوە.

دڵپاك: ئیسلام هەروەك بۆ ئەوە هات کە ئادەمیزاد پەروەردگاری خۆی بناسێت، بۆ ئەوەش هات کە ئادەمیزاد ئازاد بکاتو لەژێر چەپۆكو ستەمی زۆرداراندا دەریبێنێ، ئەو زۆردارانەی کە بەسەر خەڵکەوە خۆیان ئەبەنە جێگەی خواو ئەیانەوێ بپەرسترێن و کەرامەتو ئابڕوو و سامانو گیانی خەڵکی ئەخەنە ژێر پێیانەوە، ئەمجار کارو گرنگیی ئیسلام لەمەدا ورياکردنەوەی مرۆڤەکانە، پاڵپێوەنانیانە، هەتا ڕاپەڕنو جگە لە خوای پەروەردگار مل بۆ هیچ هێزێکی سەر

[1] تەماشای (وتەی زاناکانو باوەڕ بەخوا) بکە، دانانی (ئەحمەد کاکە مەحمود).

زەوی کەچ نەکەن، زیندووکردنەوەی ویژدانیانە تا ڕاپەڕین و ئازادیی بخەنەوە دەست خۆیان.

ئایا ئەو زۆردارانە ئێستا هەن، یان نین؟ ئایا هەتا دنیا دنیایە ئەبن، یان نابن؟ ئێوە لەو باوەڕدان کە ستەم ڕیشەکەن بکرێت لەسەر زەویدا؟

ئاواز: بێگومان ئەوانە ئێستا بە هەزاران هەن و هەر ئەشبن، چۆن نابن؟

سکاڵا: ستەم هەرگیز ڕیشەکەن نابێت لەسەر زەویداو هەر ئەمێنێ.

دڵپاك: ئەی ئیتر چۆن و بۆ چ دەوری ئیسلام بڕایەوەو بەسەر چوو؟!، هەروەها ئیسلام بۆ ئەوە هات کە ئادەمیزاد لە ژێر چنگیی ئارەزووپەرستییدا دەربێنێ و ئازادی بکات لێی، ئارەزووپەرستی ورگ و ناوگەڵ، پلەو مەنصەب، سامان و شتەکانی تر، تەنانەت ژیانپەرستی، ئەگەر بەوردی بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە، بۆتان دەرئەکەوێ کە زۆربەی سەرو مل و گەردن شۆڕو کەچکردنی ئادەمیزاد، لە پێناوی ئەو ئارەزووپەرستییەدایە، خۆشەویستی ژیان وای لێئەکات کە هەموو جەورو ستەمێکی زۆرداران قەبووڵ بکات، گەردنی بۆ کەچ بکات.

جا ئیسلام بایەخێکی زۆر گرنگی بەم مەسەلەیە داوە، ئەیەوێ هەڵوێستی ئادەمیزادەکان هەڵوێستێکی مەردانەی پڕ لە نەیاریی بێت، پڕ لە خەبات و تێکۆشان بێت، دژی ئەو ئارەزووپەرستییە بوەستێ، گیانی و سامانی لەو ڕێگەیەدا بەخت بکات، ئەوەش نەك بە سەپاندنی گۆشەگیری بەسەر خەڵکدا، نەخێر، بەڵکو بەرێکوپێککردنی هەوەس و ئارەزووەکانی ئادەمیزاد، بە تێرکردنیان لە شێوەیەکی پاکدا.

دەی ئایا ئارەزووپەرستی براوەتەوە؟ ئەی مرۆڤەکان هەوەس و ئارەزووە جیاجیاکانی خۆیان لە شێوەیەکی پاکدا تێر ئەکەن؟ کام لەو ئارەزووانە باوو دەوری نەماوە، تا باو و دەوری ئیسلام لەو بوارەدا نەمابێت و بەسەر چووبێت؟.

پرشنگ: ئەو ئارەزووانە سرووشتین و هەمیشە لەگەڵ مرۆڤدا ئەبن، تا دنیا بێت ئەوانیش ئەمێنن، تا ئەو کاتەی ئەخرێنە گۆڕەوە بە جێمان ناهێڵن.

سکاڵا: بەوپێیەش دەوری ئیسلام هەتا دنیا دنیابێت ئەمێنێ و نابڕێتەوە.

دڵپاك: هەروەها ئیسلام بۆ ئەوەهات کە ژیریی (عەقڵ)ی ئادەمیزاد ئازاد بکات لە خورافە. واتە شتی پڕو پووچ. وەك ئەزانن، لە کاتی دەرکەوتنی ئیسلامدا مرۆڤایەتیی لە لیتەی خورافاتدا چەقی بوو، هەندێکیان لە دەستکردی مرۆڤ خۆی بوون و بە ناوی خواکانەوە دەیانتاشین بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، هەندێکیان لە چنین و ڕستنی پیاوانی ئایینی بوون بەناوی خواوە، کە هەموویان سەرچاوەکەیان نەفامیی و خورافات بوو.

ئیسلام هات و بە ئاشکراو ڕوونیی ئەو خورافاتەی شیکردەوە بۆ مرۆڤایەتیی، تێیگەیاندن کە ئەو باسانە بێناوەڕۆك و بێتان و پوچن، هەرکەس ئاشنایی لەگەڵ بەرنامەکەی خوادا هەبێت، ئەزانێ کە شێوازی کردنەوەی قوفڵی مێشکی ئادەمیزاد لەم ڕووەوە لە ئیسلامدا چەند وردو قووڵ و پڕ لە ئیعجازە، شێوازێکی ئاسانی ڕەوانی بێگرێ و بێوێنە، ژیریی لێی تێئەگات، هەست پەی پێئەبات، ویژدان یەکسەر باوەڕی پێدێنێت، بەبێئەوەی ناکۆکیی بخاتە نێوان ئایین و زانیارییەوە، بەبێئەوەی ڕێگەی سەرنجدان و بیرکردنەوەی لێبگرێت، ئایا مێشکی مرۆڤایەتی تا ئێستاش لە خورافات ئازاد بووە؟، خەریکە بڵێم نیوەی مرۆڤ تا ئەمڕۆش بتئەپەرستن، لە هندو چین و ئەفریقاو شوێنەکانی تری سەر زەویدا، نزیکەی نیوەشیان بەسەدان خورافاتی تری جۆراوجۆر کە لەبت زیان بەخشترن، ئەپەرستن، ئەی ئیتر چۆن ڕاستە بگوترێت، دەوری ئیسلام بڕایەوەو بەسەر چوو؟ ئەی نابێ بیری لێبکەینەوە؟

ئای کە ئەمڕۆ جیهان لە دوێنێ زیاتر پێویستی بە ئیسلام هەیە لە هەموو ڕوویەکەوە!، ئای کە ئیسلام ئەمڕۆ دەرمانی دەردە بۆ مرۆڤایەتی!، ئای کە ئەمڕۆ لە سەردەمەکانی تر زیاتر گیرۆدەو کۆڵەوارین و پێویستمان بە دەستگرو قوتارکەرێ هەیە! دەی ئیتر چۆن دەورەی ئیسلام بڕایەوەو تەواو بوو؟

جوان: باشە، خوشکە دڵپاك، ئەم باسە لە چ پەڕاوێکدا دەست ئەکەوێت؟

دڵپاك: بە دوورو درێژی لە (شبهات حول الاسلام)دا، لە دانانی (محمد قطب) هەیە.

خوشك و براكانم، لەسەر ڕۆشنایی ئەو نموونانەی كە باسمانكردن، پێتان ئەڵێم: ئیسلام بەرنامەیەكی خواییە، خەڵاتی ئادەمیزاد كراوەو ڕێبازی ژیانیەتی، هەتا ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەوییەدا بژی، پێویستی بەو بەرنامەیە ئەبێت، چونكە ئەو بەرنامەیە بۆ ژیانی مرۆڤ هاتووە، هەمیشە پێكەوە تەفاعول ئەكەن و هەردوو لایان وەك لەش و گیان وەهان بۆ یەكتر، لە شیش بەبێ گیان ئەگەنێت، گیانیش بەبێ لەش ڕووناكییەكە بە حەواوە.

كە وابێ تا ژیان لەسەرئەم زەوییەدا هەبێت، دەورو گرنگی ئیسلامیش ئەبێت و ئەمێنی و ئەتوانێ، بە پاكترین شێوە پێویستییەكانی كۆمەڵگەو مرۆڤایەتی جێبەجێ بكات، ئیتر ئەو پێویستیانە (مبادئ) بنەما یان پرۆژە بن، یان هەرچییەكی تر بن، با ژیانیش هەمیشە لە گۆڕاندا بێت، بەمەرجێ ئەو پێویستیانە لە ژیانێكی پاكی مرۆڤانەوەو لە فیترەیەكی پاكەوە هەڵقولابن، نەك ئەوانەی كە فیترەی پاك و ساغ نەفرەتیان لێئەكات، نەك لە هەندێك هەوەسی كاتیی زیانبەخشەوە هاتبن كە هەر لە سەرتاوە لەگەڵ فیترەت و ژیربێژییدا، دژایەتیی و شەڕە قۆچیانە، جا ئەگەر ئیسلام بە كەڵكی هەموو ڕۆژگارێك نەهاتایە، چۆن خوای پەروەردگار ئەیكرد بە كۆتایی پێهێنەری ئایینەكان؟ چۆن دەرگای نیگای خۆی دائەخست؟ (..الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً..) (المائدة: 3).

## ئیسلام بەرنامەیەكی نەمرە

پرشنگ: وەڵامەكانت هەرچەندە زانیاریی گەواهییان لەسەر ئەدات و ژیریی باوەشیان بۆ ئەكاتەوە، بەڵام پرسیارێكی تر خۆی ئەسەپێنێ بەسەر عەقڵدا، ئەویش ئەمەیە: ژیان هەمیشە لە گۆڕیندایە، ئیسلامیش زیاتر لە (1404) ساڵ لەمەوبەر هاتووە، خۆ ناكرێت دەستكاریی قورئان و فەرموودە بكرێت و بگۆڕدرێن، دەی ئیتر چۆن لەگەڵ كاروانی ژیان و گۆڕاندا بەڕێوە ئەچێت؟

دڵپاك: لەوەدا كە ئەڵێیت: (خۆ ناكرێت دەستكاریی قورئان و فەرموودە بكرێت، یا بگۆڕدرێت) ڕاست ئەكەی، جا با پێت بڵێم چۆن لەگەڵ كاروانی ژیان و گۆڕییندا بەڕێوە دەچێت.

وەكو هەموو جار گوتوومانە، ئیسلام بەرنامەیەكی خواییە، خوا هەروەك خالقی ئادەمیزادە، خالقی بەرنامەكەیشە، دەی خۆ خوا لە هەموو زانایەك زاناترە، تۆ بلێی ئەو گۆڕانەی لە بەرنامەكەیدا بەرچاو نەگرتبێ؟ دیارە ژیریی پاك و ساغ شتی وەها پەسەند ناكات؟ تۆ بڵێی خوا نەزانێ پێشكەوتنی مرۆڤ ئەگاتە كوێ؟ (استغفرالله) شتی وا هەرگیز نییەو نابێت.

لە ئیسلامدا یاسایەك هەیە پێی ئەگوترێت (یاسای زەرورەت)و ئەڵێت: (ان للضرورة احكامها) یاخود (ان الآحكام تتغیر بتغیر الزمان)[1]. واتە: بە گۆڕینی ڕۆژگار حوكمەكان ئەگۆڕێن، ئەمەش چاكترین گەواهییدەرە لەسەر نەرمو نیانیی و بەڕێوەچوون (مسایرە)ی ئیسلام لەگەڵ گۆڕانكارییدا.

هەڵكەوت: ئەكرێت بە هێنانەوەی نموونەیەك ئەوە ڕۆشن بكەیتەوە؟

دڵپاك: بەڵێ، بۆ نموونە: نوێژ كە بنەڕەتێكی زۆر گرنگە لە ئیسلامداو لەسەر موسڵمانان فەرزە، بەبێ دەستنوێژ دروست نییە، دەستنوێژیش بە ئاو ئەگیرێت، بەڵام لە كاتی نەبوونی ئاودا یان كاتێ كە بەكارهێنانی ئاو نەگونجاوبێت، ئەوكاتە تەیەمووم جێگەی دەستنوێژ ئەگرێتەوەو نوێژی پێئەكرێت[2].

حەقیقەتێكی زۆر گەورە هەیە كە ئێوە فەرامۆشتان كردووەو ڕەنگە پەی پێنەبەن، ئەویش ئەوەیە كە نازانن هەندێ لایەن گۆڕانیان بەسەردا دێت، كەچی هەندێ لایەنی تر هەیە كە گۆڕانیان بەسەرا نایەت، ڕۆژگار ناتوانێ فیترەت، سۆز، ئاوات، (الفطرة، العواطف، النوازع) بگۆڕێت، لەوەیش زیاتر، چەندان لایەنی بنچینەیی هاوبەش لە ژیانی مرۆڤدا هەن كە

---

[1] تەماشای (حقیقة البابیة والبهائیة)ی (دكتۆر موحسین عەبدولحەمید) بكە.

[2] تەماشای (فقه السنة)، بەرگی یەكەم بكە.

هەرگیز گۆڕان و وەرچەرخاندن، کاریان تێ ناکات، واتە ناگۆڕدرێن و وەرناچەرخێنرێن، دوای ئەوەش لە ڕووی ئەو سیفەتانەوە کە باسمانکرد مرۆڤ هەر مرۆڤە. گۆڕینی بەسەر جیهانی دەرەوەدا دێت نەك ناوەوە، ئەویش: پەیوەندیی مرۆڤ بە مەوخلوقاتی دەوروبەرییەوە، هێنانە ژێرباری ئەو هێزانەیەکە پەروەردگار لەم بوونەوەرەدا پرش و بڵاوی کردوونەتەوە، ئینجا ئەو حوکمانەی کە پەیوەندییان بەو لایەنانەوە بێ کە هی گۆڕانن، ئەوانیش ئەگۆڕێن، ئەمەش بەبێئەوەی پێویستیی خۆی بسەپێنێت بەسەر ئیسلامدا کە لە بەها نەمرەکانی خۆی بچێتە دەرەوەو پێویست بە گۆڕینی قورئان و فەرموودە بکات.

سەربەست: ئەوەیان چۆن؟ من لە مەبەستت تێنەگەیشتم!

باجی عائیشە: کوڕم، دەی یەك یەك لێی بپرسن، چوارچاوتان کردووە.

دڵپاك: لێیان گەڕێ باجی عائیشە، هەرچی ئەپرسن با بپرسن، ئەی پێشینان نەیانگوتووە "پەرسابەو دانابە؟". خوا یاربێت دانا ئەبن.

کاکەگیان، ئیسلام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بیستوتانە، نەمرە، نهێنی نەمریشی لەوەدایە کە بەشی هەرەزۆری یاساکانی تەنیا چوارچێوەن و سنوورێکن بۆ جموجوڵ و هەوڵ و بزووتنەوەی ئادەمیزاد، لەدوای ملیارەها ساڵیش وەیا هەرگیزاو هەرگیز جموجوڵ و هەوڵ و بزووتنەوەی مرۆڤ ناتوانێ ئەو چوارچێوەو سنوورە ببڕێت، ئەمەش تێمانئەگەیەنێ کە شەریعەتێکی داخراو نییە، ناوچەیی نییە، پێویستە ئەوەشتان پێبڵێم کە لە دوو لایەنی سەرەکیی پێکهاتووە، با دوولایەنەکەتان بەکورتیی بۆ باس بکەم، ئەوسا باسەکە ڕۆشنتر دەبیستن و دەبینن.

1. دەقە نەگۆڕاوەکان (النصوص القاطعة). ئەمانە لە قورئان و فەرموودەدا هەن، دەستووری گشتین، پەیوەستیان بە هەموو لقەکانی ژیانەوە هەیەو بەستراون پێوەیان، گۆڕان و وەرچەخاندن نایانگرێتەوە، چونکە مرۆڤ لە هیواو هەڵپەو مەیلیدا، چ بۆ خێرو چ بۆ شەڕ هەر مرۆڤەو بە مرۆڤی ئەمێنێتەوە، بۆ نموونە: ئادەمیزاد بە سرووشت هەوەسی هەیەو حەز بە هاریکاریی و ئەزیەتنەدانی کەسانی ترو بەشدارنەکردنی خەڵك لە هاوسەرەکەیدا، یان لە سامانیا ئەکات، حەز لە خۆدوورگرتن لە زیان و پیسی ستەمکاریی ئەکات، حەز لەڕاستگۆیی و سپاردە پاراستن و خۆشەویستی ئەکات، ئینجا هەر یاسایەکی خوایی کە لایەنێك لەم لایەنانە ڕێکخات، بە نەمریی ئەو لایەنە ئەو لایەنەش نەمر ئەبێت.

هەروەها سرووشتی مرۆڤ ـ دیارە مەبەستمان لەو سروشتە پاکەیە کە بە (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا)یە ـ زیاندان لە خەڵك، داوێن پیسی، درۆ، منایەتیی بێسنوور، ناپاکیی و.. هتد ئەکات، کە چارەسەری ئەو گێرەو کێشە کۆمەڵایەتییە بکات و بیەوێت ڕیشەکەنی بکات، بە نەمریی لایەنەکە، یاسا خواییەکەش نەمر ئەبێت، پەروەردگار زاناو بینایە، پێشئەوەی ئادەمیزاد خەلق بکات و بەرنامەی خۆی بنێرێ بۆیان زانیویەتی ئەو لایەنانە ناگۆڕێن، بۆیە یاساکانیشی بەشێوەیەکی دامەزراوی نەگۆڕاو داناوە، ئەی ئێوە کامتان لەو باوەڕەدایە کە لایەنی خێرو شەڕ لە ئادەمیزاددا نەماون و بەوەش دەوری ئەو یاسایانە نەما؟.

نەشمین: کچە ئەوە کەی پرسیارە؟ لایەنی خێرو شەڕ چۆن نەماوەو نامێنێ، مەگەر ئادەمیزاد نەمێنێ، تا ئەم بێت، ئەوانیش ئەبن.

2. حوکمە فەرعییەکان و پارچە کردارییەکان (الأحكام الفرعية والجزئيات العملية)

ئەوەش لایەنی دووەمە، پێی ئەگوترێت فیقهی ئیسلامی، ئەمانە لەبەردەم گۆڕان و وەرچەرخاندان، بەپێی باوو عورف و ئەنجامی تێگەیشتن و پێگەیشتن و ڕۆژگاری ئادەمیزاد ئەگۆڕێن.

ئەمانە سەربەخۆ نین، بەپێی شارستانییەت و پێشکەوتنی ژیانی ئادەمیزاد لە دەقە نەگۆڕەکانەوە وەرئەگیرێن، واتە پەیوەندیی نێوانی بەها نەمرەکان سەبارەت بە مرۆڤایەتی مرۆڤ ناگۆڕێت، چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤە، بەڵکو ئەوەی کە ئەگۆڕێت، چۆنییەتی چارەسەرکردنەکەیە، کە بۆ ئەو شەڕە قۆچەی کە لەنێوان ئەو مانایانەدا کە لە ئەنجامی گۆڕان و

پێشکەوتنێکی دیاریکراوەوە پەیدا ئەبێت، دێتە کایەوە[1].

جوان: ئەکرێت ئەو باسە بەهێنانەوەی نموونەیەك ڕوون بکەیتەوە؟

دڵپاك: بەڵێ، دواکەت بەجێیە، بۆ نموونە: ڕۆژووگرتن، هەموو مانگی ڕەمەزان لە هەموو ساڵێکدا پێویستە. جگە لە هەندێ حاڵاتی تایبەت. ئەو دەقە قورئانییە کە ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ..) دەقێکە هەرگیز ناگۆڕێت و بەرزو نزمکردنەوەی تێدا ناکرێت، هەروەها حەجکردن لەسەر ئەو مسوڵمانەی کە مەرجی حەجکردنی تیایە پێویستەو دەقەکە جموجوڵی تێدا ناکرێت و گۆڕانی بۆ نییە بەهیچ کلۆجێ.

بەڵام وەك ئەزانین ئەوسا خەڵك بەپێ ئەچوو بۆ حەج، یان بە سواری وڵاغ، شارستانییەت هاتە کایەوە، هۆی هاتوچۆکردن لە پێ و وڵاغەوە گۆڕان بۆ ئۆتۆمبێل و پاپۆڕو فڕۆکە، ئایا دەقێك هەیە لە قورئان و فەرموودەدا کە ئەو هۆیە تازانە قەدەغە بکات و بە چاکیان نەزانێ؟ بێگومان نەخێر، دەی ئیتر بۆچی و چۆن ئیسلام ناتوانێت لەگەڵ پێشکەوتن و شارستانییەتدا بڕوات بەڕێوە؟.

سەربەست: نموونەکە باسەکەی بە تەواوی دابەدەستەوە، ئێستا تێگەیشتم کە ئیسلام چۆن بۆ هەموو کاتێك دەست ئەدات و کاریگەریی هەر ئەمێنێ.

دڵپاك: کە ئیسلامتان چاك ناسی، بۆتان دەرئەکەوێ کە بەرنامەیەکی نەمرە.

## تازەیەو بەرنامەی خوای گەورەشە

ئاواز: لێرەدا شتێك دێتە پێشەوە، یا بڵێین پرسیارێك خۆی ئەسەپێنێ، ئەویش ئەمەیە، لە چەرخی پێشکەوتن و شارستانییەتدا، کۆن چۆن بەکەڵك دێت؟

دڵپاك: ئای لەو بیرە تەسکە! ئای لەو مێشك بەنجکراوێتییە!، نازانم بە چ ڕەنگێ بیری ڕۆشنت بە (زانیاریی)! ڕێگەی پێدایت کە ئەو پرسیارە بکەیت؟!.

هەمووتان ئەزانن کە ئاو، هەوا، ئەم زەوییە، بە هەموو ئەو ڕەگەزانەوە کە هەن تیایا کۆنن، ژیان کۆنە، خۆرو مانگ کۆنن، ئایا ئەوانە ئێستا بەکەڵك نایەن؟ ئایا زانیاریی داوامان لێئەکات کە پشتیان تێکەین، چونکە کۆنن؟، ئەگەر بێت و زانیارییش ئەو ڕێگەمان بداتێ، ئایا ژیریی پەسەندیی ئەکات؟ کام ژیریی، خۆ ئارەزووی پەرپین لەگەڵ خەڵقبوونی ئادەمیزاددا هەبووە، زانیارییش پێمان ئەڵێ، تەمەنی ئادەمیزاد. واتە بوونی. بە بلیاران ساڵە، واتە تەمەنی ئارەزووی پەرپینییش بە بلیار ساڵە، ئەی بۆچ بە کۆن ناوی نابەن و بۆ چ بە کەڵك دێت؟ یاخۆ "بانێکەو دوو هەوا؟!".

ئەزانم مەبەستت ئەوەیە بڵێیت، ئیسلام پێش زیاتر لە هەزارو چوارسەد ساڵ هاتووەو کۆن بووەو بە کەڵك نایەت.

پرشنگ: بەڵێ.. بەڵێ کتومت مەبەستی ئەوەیە، من ئەزانم.

دڵپاك: ڕاست ئەکەن تەمەنی ئیسلام لە (1404) ساڵ زیاترە، بەڵام دانەرەکەی خوای پەروەردگارە، ئەی تەمەنی مادییەت و لەزەتپەرستی، کەئێستا بە سەرۆکایەتی خۆرئاوا زیاتر لە نیوەی گێتیی گرتووەتەوە، چەندە؟

"دوای تەماشاکردنێکی یەکتری بە سەرسامییەوە"

هەڵکەوت: لە سەرەتای چەرخی ڕاپەڕینی ئەوروپاوە دەستیپێکرد، وانییە؟

دڵپاك: نا وەڵلا وانییە، ئەی نەتەوەو خاکپەرستیی و خۆبەزلزانینی میللەتان ئێستا پێی ئەڵێن: "قەومییەت"و "وەتەنییەت" لە کەیەوە دەستیپێکرد؟

نەشمین: ئەمەیان هەر زۆر تازەیە، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا.

جوان: خۆ من نازانم کەی دەستیپێکردووە، بەڵام بەخوا نەشمینیش نەیزانی.

---

[1] تەماشای (التطور والثبات)ی محمد قطبو (حقيقة البابية والبائية)ی د. محسن عبدالحميد بكە.

دڵپاك: یاسایەكی تر هەیە، كە خۆی بە دوا یاسا دەداتە قەڵەم‌و شەیداكانی بە هیوای ئەوەن، كە مرۆڤایەتی ڕۆژێ لە ڕۆژان باوەشی بەتاسەوە پیادا بكات، ئەویش ئیشتراكییەت‌و شیوعییەتن باشە تەمەنی ئەو یاسایە چەندە؟

ئاواز: ئەمەیان هەر زۆر تازەیە، لە كۆتایی بەشی یەكەمی سەدەی بیستەمەوە هەڵقوڵاو لە ئۆكتۆبەری (1917)ی زاینییەوە دەستی خستە ناو ژیانی عەمەلییەوە، لەبەر ئەوە بە تازەترین بەرنامە دائەنرێت‌و چاكترین بەرنامەیشە.

دڵپاك: بەداخەوە، ئێوە گەلێ بێئاگان، ئەبوایە وەها نەبوونایە، چونكە خوێندەوارن، خەڵك بە (ڕۆشنبیر!) ناوتان ئەبات، ئەبێ ئەوەش بزانن كە دانەرانی ئەو ڕێبازانە هەموویان ئادەمیزاد بوون.. ئادەمیزادیش قابیلی ڕاستناسیی‌و هەڵەكردنیشە، بەپێچەوانەی خواوە كە هەڵە ناكات.

سكاڵا: مامۆستا دڵپاك، من زۆر بە پەرۆشم بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانەت.

دڵپاك: ماددیەت‌و هەوەس‌و لەزەتپەرستی، هەر لە سەرەتاوە، لەگەڵ بوونی ئادەمیزاددا بوون، هەركە لە ڕێگەی خوا دوور كەوتبێتەوە، ئەو لایەنانەی بوونی سەریان هەڵدڕیوەو لە سنووری خۆیان دەرچوون، واتە بوونیان ئەگەڕێتەوە بۆ بلیاران ساڵ، دیارە نابێ بگوترێت تازەن، یانی كۆنن.

خاك‌و نەتەوەپەرستیی كە بەزاراوەی تازە پێیان ئەگوترێت "قەومییەت‌و وەتەنییەت"، لەناو یۆنانیی‌و ڕۆمانییەكانەوە سەریان دەرهێناو نەشونمایان كردو بە جیهاندا بڵاوبوونەوەو گەیشتنە لای ئێمەش، ئایا ئیسلام لە یۆنانی‌و ڕۆمانەكان كۆنترە؟ ئەی نابێ ئێوە لەم جۆرە شتانە بكۆڵنەوە؟!

ئیشتراكییەت یاخۆ شیوعییەت، مێژووی بیرۆكەكەی لە سەردەمی یەكێك لە فەیلەسوفە یۆنانییەكانەوە كە ناوی (هرقلیطس) بوو دەستیپێكرد، ئەو بیرۆكەیە چەند دەستاو دەستێكی كرد، چەند شێوەو جۆرێكی لێهات، ئەم وڵات‌و ئەو وڵاتی كرد، تا لە ئێراندا لە سەر دەستی (مازدەك)دا ئاشكرا كراو ماوەیەكیش خەڵك دوای كەوت، ئەمجا لە ئەڵمانیادا فەیلەسوفێك بە ناوی (هیجل) تازەی كردەوە، دواجار ماركس هات‌و پەڕۆو پینەیەكی تری كرد، تا بوو بە شیوعییەتی ئەمڕۆ، بەپێی قسەی ماركس لاساییكردنەوەی "كۆمۆنەی یەكەم"ە، واتە مرۆڤایەتیی ئەم ڕێبازەی لە دەوری یەكەمی بوونی ئادەمیزادەوە، بە خۆیەوە دیوە[1]. دەی ئایا ئەو ڕێبازە نوێیە؟ ئەی بۆچی ئیسلام كۆنە؟ یاخۆ ئەمڕۆ مرۆڤی (ڕۆشنبیر!) ئەبێ ژیربێژیی بە هەڵگەڕاوەیی بەكار بێنێ؟!

جوان: بەخوا زۆربەی خەڵك ئەم زانیارییانە نازانێ، من هەر نەمبیستوون.

سكاڵا: كاك هەڵكەوت‌و سەربەستی برام لە مێژووی قسەی زل‌و زمانی تووتی ئەزانن.

دڵپاك: هیوادارم كە بۆتان دەركەوتبێ، كە ئیسلام لەو بەرنامانەی دوایان كەوتوون، تازەترە، لەوەش زیاتر بەرنامەی خوایەو كاری خوایش پاك‌و تەواوە.

## هاوسەرێتیی سێ جۆرە

نەشمین: با بگەڕێینەوە سەر باسەكەی خۆمان، هاوسەرێتیی ـ ژنهێنان‌و شووكردن ـ، خوشكە دڵپاك بۆی باسكردین كە عازەبیی‌و زگورتیی لە ئیسلامدا بە چاك دانانرێن.

دڵپاك: نەك هەر تەنها بە چاك دانانرێت، بەڵكو نەهی لێكراوە، فەرمان بە پێچەوانەكەی دراوە. ئەوەبوو بۆم باسكردن لە یاسای ژمارەی (32)ی سورەتی (النور)دا ئەفەرمووێ: (وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ..). لە یاسایەكی تری قورئاندا (فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ..) وشەی (أنكحوا) وەك ئەزانن فرمانی فەرمانییە (فعل أمر)ە، فەرمانەكەش لەلایەن خواوە دراوە بەسەر مسوڵماناندا‌و پەیڕەوییكردنی واجبە.

[1] تەماشای (قصة الايمان)ی نديم الجسر، (فجر الاسلام)ی أحمد أمين، (حقائق الاسلام وأباطيل خصومة)ی (العقاد) بكە.

پێغەمبەری ئیسلامیش ﷺ ئەفەرمووێ: (لا آمركم ان تكونوا قسيسين ورهبانا)، (ليس في ديني ترك النساء واللحم واتخاذ الصوامع)، (لارهبانية في الاسلام)، (لكل نبي رهبانية، ورهبانية هذه الأمة الجهاد في سبيل الله)، مەسەلەکە ئێجگار قووڵە لە ئیسلامدا!

سەربەست: ئەی باوکەگیان! ئەم هەموو ئایەتو فەرموودەیەت چۆن لەبەر کردووە؟

پرشنگ: ئایا ئەتوانین بڵێین، هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا واجبە؟

دڵپاك: من فتوادەر (مفتي) نیم، با وردبینەوە لە یاساکانی ئیسلام، ئەوسا کە خۆر دەرکەوت ئیتر پێویستی بە پەنجە بۆ ڕاکێشان نییە، وابزانم هێشتا لە بیرتان بێ کە باسی یاسای ژمارە (28)ی سورەتی (الرعد)مان کرد، کە خوا بە پێغەمبەر ئەفەرمویێ: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً وَذُرِّيَّةً..)، پێغەمبەریش بە مسوڵمانان ئەفەرمویێ: (اذا تزوج العبد فقد استكمل نصف الدين).

سکاڵا: خوشکە دڵپاك، خۆت ئەزانی مێشکی ئێمە نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کە بتوانیێ لە دەق ئاکامو ئەنجام دەربێنیێو جیابکاتەوە، تکایە مەسەلەکەمان بە ئاسانی بۆ ڕۆشن بکەرەوە تا لێی تێبگەین.

دڵپاك: چاوەکەم هاوسەرێتیی لە ئیسلامدا لەو ڕووەوە ئەکرێت بە سێ جۆرەوە:

### 1ـ هاوسەرێتیی پێویست (الزواج الواجب):

هەرکەسێك دەسەڵاتی هاوسەرێتیی بوو . دەسەڵات بە هەموو واتاکانییەوە . و حەزی لێکردو لە گوناه تووشبوون ترسا، ئەوە هاوسەرێتیی لەسەر پێویستە، چونکە خۆ بە پاکڕاگرتنو دوورەپەرێزی لە حەرام پێویستە، ئەوەش بەبێ هاوسەرێتیی نایەتە دی، لەم ڕووەوە (القرطبي) ئەڵێت: "ئەو خاوەن توانایەی کە بترسێت دەروونو ئایینی بەهۆی زگورتێتییەوە زیانیان پێئەگات، ئەو زیانە بە هاوسەرێتیی نەبێت، لە کۆڵی دانابەزێ، واجبێتی هاوسەریی بۆی، جیاوازی (خلاف)ی تیا نییە.."[1].

هەروەها پێشەوا (ابن حزم)و کۆمەڵێکی تر لە زانایانی ئیسلام هەمان فەرموودە دووبارە ئەکەنەوەو ئەڵێن: "هاوسەرێتیی بۆ ئەوانەی کە بۆیان ئەلوێتو توانایان هەیە پێویست . واجب . یێکی واز لێنەهێنراوە، هەرکەسێ بە قورسی بزانێتو وازی لیێ بهێنێ بەبێ بەهانەیەکی شەرعی، ئەو کەسە گوناهبارە، گوناهبارێکی وەها کە گوناهەکەی بەرامبەری گوناهی ئەو کەسە بێت کە یەکێك لە پێوستکراوەکان (الفرائض)ی واز لێهێنابێت"[2].

### 2ـ هاوسەرێتیی بەچاکزانراو (الزواج المستحب):

هەرکەس حەز بە هاوسەرێتیی بکاتو توانایشی هەبێت، بەڵام لەخۆی دڵنیا بێت کە تووشی حەرام نابێت، ئەمە هاوسەرێتیی لەسەر پێویست نییە، بەڵام ئەگەر هاوسەرێتیی بەجێبهێنێ ئیسلام کارەکەی بە چاك ئەزانیو بەلایەوە پاكو پیرۆزە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله ابدلنا بالرهبانية الحنيفية السمحة)، طبراني. "تزوجوا فاني مكاثربكم الأمم، ولا تكونوا كرهبانية النصارى"، البيهقي، (ابن عباس) ئەیگوت: "لا يتم نسك الناسك حتى يتزوج"، عومەر (درووودی خوای لەسەر بێت) بە (أبي الزوائد)ی فەرموو: "انما يمنعك من التزوج عجز أو فجر"، فقه السنة/ج2/ ل 16و 17.

### 3ـ هاوسەرێتی قەدەغەکراو:

هەرکەسێ مافی هاوسەرەکەی بەجێنەهێنێ لە جنسو خەرجیدا، توانای هاوسەریی نەبێت، یان حەزی لێنەکات، هاوسەرێتیی حەرامە لەسەری، وابزانم ئەمە ئاشکراو ڕوونەو پێویستی بەشیکردنەوەو درێژە پێدان ناکات.

ئەوەیە ڕای ئیسلام، یا بڵێین یاسای ئیسلام سەبارەت بە حوکمی هاوسەرێتیی، لە ڕووی پرسیارەکەتەوە پرشنگ

[1] فقه السنة ـ بەرگی دووەم، ل 16.

[2] المرأة القران والسنة: محمد عزه دروزه.

بە یەکاشێلانی مرۆڤایەتیی پاکە، تێکەڵکردنی سیفاتی جوانە لە نێوان ژنو مێرددا، ئەبێ تەماشای مرۆڤایەتیی‌و ئایینداریی پێشبخرێت.

دڵپاك: لەو مەسەلەیەدا ئیسلام هەموو سنورو ئیعتیبارێکی دەستکردی نەفامانەی تێکشکاندووە، چین، ڕەنگ، زمان، ڕەگەز، نەتەوەپەرستی.. هتد. هەموویانی خستۆتە ژێر پێی مرۆڤایەتیی‌و ئایندارییەوە، چونکە بمانەوێ‌و نەمانەوێ، ئایین لە هەموو شتێ زیاترو چاکتر ئەتوانێ ویژدانو عەقڵ بدوێنێ‌و بە زیندوویی‌و خاوێنیی ڕاگیریان بکات.

ئەوەیە یاساو ڕێبازی ئیسلام سەبارەت بە بنەڕەتی هەڵبژاردنی هاوسەریی چاك، مسوڵمان بەو کەسە ئەوترێ کە پەیڕەویی ئەو یاساو ڕێبازە بکات. هەرکەس پەیڕەویی نەکردو تووشی هەڵەکاریی‌و زیان هات، ئەبێ بزانین کە ئەوە لەو کەسەوەیە، نەك لە ئیسلامەوە، ناتەواوییەکەی هی خۆیەتی، نەك هی ئیسلام.

یاسای خواوەند نایاب‌و چاکە        بەڵام بۆ ئەوەی کە فیترەی پاکە.

## مەرجەکانی هاوسەری چاك

سکاڵا: خوشکە دڵپاك، گریمان تۆ پیاوبوویت، ویستت هاوسەرێ بۆ خۆت هەڵبژێری، چ ئافرەتێك هەڵئەبژێری؟

دڵپاك: بێگومان لەوەدا ناکەومە دوای هەڵپەی ئارەزووی خۆم، خۆم نادەم بەدەست خارش‌و ئالۆشەوە، ئەگەڕێم بۆ هاوسەرێك بە مەرجێ هاوسەریی تێدا بەدی بکەم، ئەو مەرجانەش ئایینەکەم . ئیسلام . دیارییکردن، پێشئەوەی بپرسیت ئەو مەرجانە کامانەن، پێت ئەڵێم ئەمانەن.

1ـ **مسوڵمان بێت،** چونکە خوا ئەفەرموێت: (وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ..). (البقرة: 221). پێغەمبەریش ئەفەرمووێ: (..فاظفر بذات الدين تربت يداك..)، دیارە فەرموودەی خواو پێغەمبەر ﷺ کەڵك‌و قازانجی هەردوو دنیای تیایە، بە پێچەوانەی هەڵپەو خارۆش‌و ئالۆشی ئارەزووەوە کە لە ئاژەڵیشدا هەیە.

2ـ **لەوانە بێت کە ئیسلام ڕێی مارەکردنیان ئەدات.**

واتە لەو ئافرەتانە بێت کە دەستنوێژ لێیان ئەشکێت، دیارە دایك‌و خوشك، چ ڕاستەقینەو چ شیریی، پوورو نەنك‌و ئەوانە مارەکردنیان لە ئیسلامدا قەدەغەو ناڕەوایەو بە هیچ جۆرێ نابێ‌و ناکرێ[1].

ئاواز: دەی ئەوە لە هەموو شوێنو لایەکدا ناپەسەندەو هیچ کەس نایکات.

دڵپاك: نەخێر وانییە، خوا یاربێت باسی ئەوەش کاتی دێت، پەلە مەکە.

3ـ **دەستگیرانی کەسێکی تر نەبێت.**

پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە پیاو داوای دەستگیران‌و داواکراویی برای ئایینی خۆی بکات، (ابن عمر) ئەڵێت: "نهى النبي ان يبيع بعضكم على بعض ولا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى يتركها الخاطب أو يأذن له الخاطب"، بە ڕوونتر، ئەو کارە کارێکی حەرامە، چونکە دیارە دەستدرێژیی تیایە بۆسەر داواکاری یەکەم، ئەوەش دووبەرەکیی ئەخاتە نێوان چەند خێزانێکەوەو ئیسلامیش شتی وای پێنا خۆشە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (المؤمن اخو المؤمن، فلا يحل له أن يتباع على بيع أخيه، ولا يخطب على خطبة أخيه حتى يذر). (أحمد ومسلم).

4ـ **خاوەن ئایین ـ ئاین پەروەر ـ بێت**

مەبەست ئەوەیە باوەڕێکی فراوان‌و تەواوی گەرم‌و گوڕی هەبێت بە ئیسلام، لە عەقیدەو پەرستشداو بیشیکات، ڕەوشتی مسوڵمانانە بێت، واتە نەك هەر بەناو یان بەدەم مسوڵمان بێت‌و بەس، بەڵکو بەکردارو ڕەوشتیش مسوڵمان

[1] ئەوانەی کە مارەکردنیان حەرامە، لە سێیەم یاسای سورەتی (النساء)دا ناوبراون.

بێت.

ئەم خاڵە لە هەموو خاڵەکانی تر سەرەکیی و گرنگترە، چونکە پەیوەندیی بە ئەندامەکانی خێزانەکەوە هەیە، بەتایبەتی ئەو منالانەی کە لەبەر دەستی ئەودا پەروەردە ئەکرێن، ئەی ئەو یەکەمین مامۆستای ئەو منالانە نییە؟، ئەی گۆپکەی ژیانیان بەسروەی هۆش و بیری ئەو ناپشکوێ و لەوەوە بیروباوەڕو چەندەها سیفاتی تر فێر نابن؟، باوکی بەسەزمان کەی بەقەدەر دایک ئەیپەردەژێ بەسەر منالەوە؟ دەورەی دایک هەر تەواو بەرزو گرنگە.

خوشکێ، سنگی تۆ کانی ژیانە سۆزو نازی تۆ تینی جولانە

یەکەم مامۆستای خێزان و گەلی بە ڕاستیی ئەرکت، دەورت گرانە

هەر لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (لاتزوجوا النساء لحسنهن فعسى حسنهن أن يرديهن ولا تزوجوهن لأموالهن، فعسى أموالهن أن تطغيهن، ولكن تزوجوهن على الدين، ولأمة سوداء ذات الدين أفضل). (عبد بن حميد وعبدالرحمن بن زيادا لأفريقي).

### 5- سککەر بێت، واتە نەزۆك نەبێت

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت (سوداء ولود خير من حسناء عقيم)، (تزوجوا الودودة الولود، فاني مكاثربكم الأمم يوم القيامة).

وەك ئەزانین یەکێك لە مەبەستەکانی هاوسەریی منالْ لێبوون و منالْ بوونە، جا ئەبێ ژن سککەر بێت، ئەوەش بە سەلامەتیی لەشیا، بە ناسینی خوشکەکانیا، دایك و پورەکانیا، تارادەیەکی زۆر دەرئەکەوێت، ئەمەش مانای وا نییە کە ئافرەتی نەزۆك شوو نەکات و هیچ کەس نەیخوازێ، نا. بەلام ئەمەش بۆ کەمکردنەوەی هەراو ئاژاوەی نێوان ژن و مێردە، بۆ بەردەوامیی بەختیاریی ئەو هێلانە گەرمو گوڕەیە کە پێکەوە پێکەوەی ئەنێن، ئەی باشە ئەگەر لەسەرەتاوە گوێ نەدەن بەم لایەنە، کەچی دوای چەند ساڵێك ئەوسا بیری لێبکەنەوەو لە یەکتر جیاببنەوە؟ ئەی بۆچ "قڕەی شووم بکەوێتە خەرمان؟"، ئەی نالێن خۆ پاراستن لە چارسەرکردن چاکترە؟ ئادەی پێم بڵێن، کێ حەز لەوەجاخکوێری ئەکات؟

### 6- ئەو ئافرەتە خزم ـ بەتایبەتی نزیك ـ نەبێت

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیداوە کە لە مارەکردنی خزم و خوێش دوور بکەوینەوە (اغتربوا لاتضووا) (البيت الاسلامى كما ينبغي ان يكون/ مقداد يالجن).

سکالا: ئەمەیان چۆن؟! بێگانە بۆ هاوسەریی لە خزم چاکترە؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، چونکە خزم ژنی لێبێنی یان نەهێنی هەر خزمتە، لەوانەیە بە ژنهێنان لێی خزمایەتییەکەش بشێوێ، چاکتر وایە، بێگانە بکەیت بە خزم، زۆربوونی خزمیش شتێکی چاك و پاکە، هەروەها بەسرووشت ئادەمیزاد لەگەڵ خزما هەوەسی بە جۆش و بەگوڕ نییە ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی ترەوە، زۆربەی زاناکانی بنەچەناسیی ڕایان وایە، لاوازیی بنەچەو کزیی توانای عەقڵیی پەیوەندییان بە هۆی ویراسییەوە هەیە. جا چەند ژنەکە نزیکتر بێت بۆ پیاوەکە لە خزمایەتییدا، شوێنەوارە ویراسییەکە پتەوتر ئەبێت، هەروەها لەشیش کزو لاواز دەرئەچێت، دەی (وتخيروا لنطفكم فان العرق داس). (ابن ماجه والديلمي)، باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك حەز بکات بە چەو وەچەی لەش لاوازو گەمژە دەربچێ.

### 7- کچ بێت نەك بێوەژن

سکالا: لەوانەیە پێچەوانەکەی ڕاستتر بێت، چونکە بێوەژن پێگەیشتووترو تێگەیشتووترە، خاوەن تاقیکارییە، هەندی شت فێربووە کە کچ هێشتا نەیدیوون و نایانزانێ، ئایا ئەمانە ڕاست نین؟

دڵپاك: شتێك لە ڕاستییان تیایە، بەلام شتی تریش هەیە، بۆ نموونە: لەوانەیە مێردەکەی پێشوی هەندێ خراپەی تێدا بووبێت کە لەمێردە تازەکەیدا نەبن، ئەمجا ئەو ژنە وا هەست ئەکات وەك لە یەکەم چاکتری دەستکەوت، ڕەنگە

لەمیش چاکتری دەست بکەوێت، ئەمەش وای لێئەکات کە بە زۆریی بیر لە گۆڕینی ئەمیش بکات، بەهیوای دەستکەوتنی لە دووەم چاکتر.

یان لەوانەیە یەکەم لە دووەم چاکتر بووبێت، ئەوەش وای لێئەکات کە بیری هەر بەلای مێردی یەکەمییەوە بێتو دڵ بۆ دووەم نەسووتێنێ، یان لەوانەیە لە یەکەمەوە هەندێ خوو فێربووبێت کە دووەم لەو خووانەی پەستو پەشێو بێت، دەی شتنەوەو لابردنیان کارێکی سووكو سادە نییە.

بەڵام کچ ئەو ماندووبوونەی ناوێ، چونکە لای مێردەکەی فێری ئەلفو بێی خێزانداریی ئەبێت، ئەوسا گێرەوکێشە کەمتر ڕووئەدات لە نێوانیاندا.

ئاواز: ئەم خاڵە زۆر ڕاستو جوانەو پڕە لە پەندو کەڵك بۆ هەردوو لایان.

دڵپاك: جگە لەوەی کە باسمانکرد، ئەو کچ هێنانە ئەبێتە هاندەرێك بۆ کچان کە کچێتییو پاکییو بێگەردیی خۆیان بپارێزن، ئابڕووی خۆیان نەتکێنن. دیسانەوە مارەکردنی کچ دەردو دژەی جنسیی کەم ئەکاتەوە، چونکە کچ لەو ڕووەوە لە بێوەژن دوورترە لە میکرۆبی نەخۆشییە جنسییەکاندا ئاشکرایشە زەوقو هەوەسی کچ گەرمترە لە هی بێوەژن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (هلا بكرا تلاعبها وتلاعبك) (رواه الستة الا مالك). پەندێکیش ئەڵێت: "فما الحب الا للحبيب الأول"[1].

### 8- ساغو سەلامەت بێت

واتە نەخۆش نەبێت، چ نەخۆشی لەشی، چ نەخۆشیی دەروونیی، یان نەخۆشی ژیریی "عەقڵی". ئەمەش نەخۆشی سەرێشەیەکی کاتیی یان گەندە تایەك یاخۆ هەڵامەتو ئەنفلۆنزا نا، بەڵکو نەخۆشییەك کە بۆماوەیی بێت، یان ویراسیی نەبێت، بەڵام چارەسەرکردنی مەحاڵە یان زۆر زەحمەت بێت، دیارە ئەو ئافرەتە هیواو ئومێدی ئەوەی لێناکرێت، کە حەسانەوە بدات بە مێردو منداڵەکانی، لە هەمانکاتدا بەو مێردو منالآنەی، بەو ئەركو کارەی کە بۆی پەیدا ئەبێت لە ئەنجامی شووکردنەوە، باری سەرشانی خۆیشی قورس ئەبێتو ئێش و ئازاری زیاتر ئەبێت.

بێگومان مارەکردنی ئافرەتی وەها بۆ هیچ لایەکیان ـ ئافرەت، پیاو، منالەکانیان ـ خێرو خۆشیی تێدا نییە، بەزۆریی وەڕسییو بێزاری پێوەیەو دواجار جیابوونەوەی لێپەیدا ئەبێت، کە ئەمیش هەر چاك نییە.

بەڕاستیی ئەگەر بێتو پیاوان پەیڕەویی ئەو خالآنە بکەن لە کاتو ساتی هەڵبژاردنی هاوسەردا، گیروگرفت ئێجگار کەم ئەبێتەوە، ماڵ وێرانیی گەلێك کەمئەبێتەوە، لەوەش زیاتر ماڵو خێزان ئەبنە بەهەشتێك خۆیانو منالەکانیشیان تیایدا هێمنترینو بەتامترین ژیان بەرنە سەر، پیاو حەساوە، ئافرەت گەشاوە، زاڕۆ بەختیارو بەدەم گوڕو تینەوە پێشوازیی ژیان ئەکات، بە کەڵكو سوودبەخش دەرئەچێت.

کێڵگەی بەختیاریی کۆمەڵ خێزانە ئەم ئاوەدان بێ، ئەو ئاوەدانە
سەرچاوان لێڵ بن، جۆگاش لێڵ ئەبێ بەرهەمی بێ وێڵ هەر بێ وێڵ ئەبێ

## چاکترین ژن

سکاڵا: لە هەڵبژاردنی ئافرەت بووینەوە، با بڵێین کرا بە بووكو گوێزرایەوە، ئێستا ژنەو وا لەماڵەوە، چاکترین ژن کامەیە؟

دڵپاك: پێغەمبەر ﷺ، باسی چاکترین ژنمان بەمجۆرە بۆ ئەکات: "خير النساء من اذا نظرت اليها سرتك، واذا أمرتها أطاعتك واذا أقسمت عليها ابرتك، واذا غبت عنها حفظتك في نفسها ومالك". (رواه النسائي وغيره بسند صحيح).

[1] تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە: البيت الاسلامي كما ينبغي أني كون/ مقداد يالجن. فقه السنة/ ج2 السيد سابق. قضايا المرأة المعاصرة/ البهي الخولي. عمل المراة في الميزان/ د. محمد على النجار.

سکالاْ: بە تەماشاکردنی، پیاو شادمان ئەبێت، جوانیی ئەنوێنێ، ئاشکرایە، بە گوێی مێردەکەی بکات، لە ڕووی گوزەرانەوە بساچێت لەگەڵیا، کە مێردەکەی لەوی نەبوو، ناپاکیی لە خۆیاو لە سامانی مێردەکەیا نەکات، ئەمانە هەموویان جوانن.. بە ڕاستیی جوانو پاکن!

دڵپاك: ئەبێ لەگەڵ منداڵەکانیشیا بە سۆزو بەزەیی بێت: "أحناه على ولد في صغره،..". (فقه السنة/ ج2). ئای خوشکان! دەورەی ئافرەت چەند گەورەو گرنگە! چەند بەرزو پیرۆزە لە ئیسلامدا! تەنیا تێرکردنی جنیسی نییە، وەك بەرنامەکانی تر لێکی ئەدەنەوە، کارگەی مرۆڤ، یەکەمین مامۆستاو پەروەردیار، نەخشکێشی مێشك و دڵو دەروونی منداڵ، هاودەمی باوەڕپێکراوی شەووڕۆژ، بەڕێوەبەری ماڵو خێزان، پاڵپشتو هاندەرو ئارامگەی دەروونیی پیاو، بە ڕاستیی گەشەکردنو بەختیاریی و سەرفرازیی کۆمەڵگە وابەسەر نووکی پەنجەی ئەوەوە، ئەبێ چی لە ئافرەتی چاك چاکتر بێت؟، چ شتێکی چاکی ئەم دنیایە هاوسەنگیی ژنیی چاك ئەکات؟، هیچ شتێك نایکات، پێغەمبەری خوا ﷺ گەواهیدەریەتیو ئەفەرمێ: "الدنيا كلها متاع وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة". (رواه المسلم).

دیسان پێغەمبەر ئەفەرمووێ: "أربع من أصابهن فقد اعطي خير الدنيا والاخرة: قلبا شاكرا، ولسانا ذاكرا وبدنا على البلاء صابرا وزوجة لاتبغيه حوبا في نفسها وماله". (رواه الطبراني)، لە فەرموودەیەکی ترا، سیانی یەکەمو چوارەم بەم جۆرەیە: "وزوجة مؤمنة تعينه على ايمانه". (الترمذي وابن ماجة). لە ڕاستییو جوانیی ئەم پەندەش کە دەڵێت: "وراء كل رجل عظيم امرأة!". ئەی توخوا پێچەوانەکەشی ڕاست نییە؟

ئاواز: تێناگەم! مەبەستت لە پێچەوانەکەی چییە؟

دڵپاك: ئەگەر پاڵپشتو هاندەرو تیژکەری هەموو گەورە پیاوێك ئافرەتێ بێو ئەو بووبێتە هۆی سەرکەوتنی ئەو پیاوە، ئایا ئەو ئافرەتە ناتوانێ ببێتە هۆی سەرنەکەوتنو خاوکردنەوەو وەبردنی ئەو پیاوە، ئەگەر بێتو ئافرەتەکە لە جیاتی چاکیی، خراپیی لێبووشێتەوە؟

ئاواز: بەڵێ وەڵڵا زۆر چاك ئەتوانێ، لایەنو دەستی وێرانکاریی لە هی ئاوەدانکردنەوەو بینانان، بەکارهێنانیان ئاسانترە.

دڵپاك: لەبەر ئەوە ڕاستە ئەگەر بڵێین: "وراء كل فاشل امرأة". هاوسەری چاك یانی بەهەشتی دنیا، چونکە ماڵەکە ئەکات بە بەهەشت، هی خراپیش یانی دۆزەخ، چونکە ماڵەکە ئەکات بە دۆزەخ، دەی توخوا نەبوونی چاکتر نییە لە بوونی؟ ڕەحمەت لەو هۆنەرەی کە گوتوویەتی:

پای پەتیی وەشا نەك وە پاڵای تەنگ بێ یانەی خاسا نەك وە یانەی جەنگ

## ئافرەت مافی هەڵبژاردنی هەیە

ئاواز: ئێمە ئەمانەوێ بەرەو بەختیاریی ئافرەت هەنگاو هەڵبگرینو بڕۆین، کەچی باسی هەڵبژاردنی ئافرەتمان کرد لەلایەن پیاوەوە، دەی با خەمێکی ئافرەت بخۆین، ئەی بۆچی ئیسلام ڕێی ئافرەت نادات بۆ ئەوەی کە ئەویش هاوسەرێکی لەبار بۆ خۆی هەڵبژێرێ؟، ئەو سەربەستییە تەنها بۆ پیاوە، کوا، کێ دیویەتی ئافرەت بگەڕێ بە دوای پیاودا، بە تایبەتیی لە ئیسلامدا؟.

دڵپاك: مامۆستا ئاواز. قسە هەڵمەگێڕەوە، من نەمگوت کە ئافرەت لە ئیسلامدا ئەبێ بگەڕێ بەدوای پیاودلو داوای پیاو بکات، تۆ ئەوەت لەچییەوە لە من وەرگرت؟ بەڵام ئیسلام ئافرەتی لە مافی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی خۆی بێبەش نەکردووەو سەربەستییەکی پاکی پێبەخشیووە.

ئەبێ ئەوە بزانین کە مەبەست لە هەڵبژاردن دۆزینەوەی هاوسەری چاكو پاکە نەك خراپو پیس، دەی ئەمەش بەشێکە لە یاسای ئیسلام. دەیان ڕێگەی پاكو ڕەوا هەیە، کە ئافرەت بە هۆیانەوە ئەتوانێ هاوسەری چاك بناسێت، تەنانەت بۆی

هەیە هەوڵی بۆ بنێریو داوای لێبکات کە مارەی بکات، چاکترین هاوسەریش بۆ ئافرەت ئەوەیە کە مەرجەکانی هاوسەری چاکی تێدا بێت، خۆ لە یادتانە، هەشت مەرجمان ژمارد.

وەك ئەزانین لەناو کۆمەڵگەی ئاساییدا پیاو پێشدەستیی ئەکاتو خوازبێنی ئافرەت ئەکات، دەی ئافرەت سەربەستیی ئەدرێتێ، بۆی هەیە پەسەندی بکاتو بۆیشی هەیە بیداتە دواوەو ڕەفزی بکات، ئایا ئەمە مافی هەڵبژاردن نییە؟، لە کاتێکدا کە پیاو ئەبێ بگەڕێتو ماندوو بێت، ئەم ـ ئافرەت ـ شتەکە دێتە بەردەستی! تەنیا ئەرێ یاخۆ نەرێی لەسەرە، ئیتر هەموو پێویستییەك لە ئەستۆی پیاودایە.

ئاواز: دەی وا نییە، ئەگەر کەسوکاری بیانەوێ بیدەن بەو خوازبێنیکارە، ئەو ئافرەتە ئەرێو نەرێی هەر ئەرێیە، ناتوانێ بڵێ نا، هیچ حیسابێك بۆ ڕای ئەو ناکرێت، کەسوکارەکەی حیسابن.

دڵپاك: ئایا تۆ هیچ بەڵگەیەکت هەیە کە ئەم بۆچوونەت بسەلمێنێ؟

ئاواز: بەڵێ.. بەڵێ. هەزارەها شتی وەها ڕوویداوە، هەر خۆم بەچاوی خۆم بە دەیەها کچم دیووە کە بەو جۆرەو بە شەقو لەقەو تێلاکاریی دراوە بەشوو، گوایا خۆت ئەوەت بە چاوی خۆت نەدیووە؟ بۆچی نازانی؟

سکالا: ئاهڕاستە، ئەوە هەبووەو هەیشە، نازانم بڵێم چی، نازانم.

دڵپاك: گیروگرفتو نەگەیشتنە ئەنجام لەوەدایە کە ئێوەمانان ئیسلام بە خەڵكو خەڵکیش بە ئیسلام ئەزانن، ئیسلام لە هەڵەکاریی خەڵکا باس ئەکەن.

چاوەکەم، من داوای بەڵگەی قورئانییو فەرموودەییم کرد، نەك هەڵەکاریی خەڵك، تۆ چیتە بەسەر خەڵکەوە؟ خۆ ئیسلام داوای لە خەڵك نەکردووە کە زینا بکات، دزییو جەردەییو خوێنڕێژی بکات، لەوەش زیاتر گیانو سامانو خوێنی مسوڵمان بۆ مسوڵمان حەرامە: "كل المسلم على المسلم حرام: دمه، وماله وعرضه"، بەڵام ئایا خەڵك دەستی لەو تاوانانە هەڵگرتووە؟، کە دەستی هەڵنەگرتووە، ئایا لەوەدا تاوانەکە هی ئیسلامە یان خەڵکە تاوانکارەکە، ئەوەتا خەڵك کوفر ئەکات، بێباوەڕیی بڵاو ئەکاتەوە، ڕیشەکەنی باوەڕ ئەکات، هەوڵی بنبڕکردنی ئیسلام ئەدا، ئەوەش هەر بکەین بە تاوانی ئیسلام؟، تاکەی مێشکمان هەر خەواڵوو و بەنج بێت؟.

ئاواز: نەخێر، لەوەدا تاوان هی خەڵکە، نەك ئیسلام، بەڵام هەڵبژاردن..

سکالا: هامن تێگەیشتم، ئۆخەی.. ئۆخەیئێستا تێگەیشتم.

دڵپاك: دەی بێبەشکردنی ئافرەتی ژیرو مسوڵمان لە مافی هەڵبژاردن تاوانێکە، وەك ئەو تاوانانەی کە ئیسلام لە دژیان ئەجەنگێ، کە خواو پێغەمبەر ﷺلێی تووڕەن، بێبەشکردنی ئافرەتی مسوڵمانی پێگەیشتوو و تێگەیشتوو ئەو ستەمەیە کە خواو پێغەمبەر نەهییان لێکردووە، بەڵام ئەبێ ئافرەت ئەو هەڵبژاردنەی لە ژێر ڕۆشنایی ئیسلامدا بێت، لە سنووری مسوڵمانێتی نەچێتە دەرەوە، ئەمە پیاویش ئەگرێتەوە، خۆ لێی دواین.

## بەڵگەی مافی ئافرەت بۆ هەڵبژاردن

دڵپاك: مەسەلەی هاوسەریی، مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، بەتایبەتی بە نیسبەت ئافرەتەوە، چۆن گرنگ نییە؟ ئەی بەدرێژایی تەمەنی نییە؟ بۆ ئافرەت گرنگترە تا پیاو، چونکە تەڵاق لە دەستی پیاودایە، ئەگەر وەڕس بوو لە ژنەکەی تەڵاقی ئەدات، بەڵام ئایا ژن ئەوەی بە ئاسانی بۆ ئەکرێت؟ تەنانەت لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە تەڵاق کاریگەرییەکەی ئەکەوێتە سەر ژن ـ بەزۆریی ـ نەك پیاو، زیاتر ئافرەتی پێ لەکەدار ئەبێت. دەی ئیتر چۆن بەرنامەی خوا بەو هەموو دادگەرییەوە ئافرەت لە مافی هەڵبژاردن بێبەش ئەکات؟ ژیریی ساغ، کەی ئەوە پەسەند ئەکات؟.

پێشەوامان (غەزالی) ئەفەرمووێ: "وریایی سەبارەت بە مافی ئافرەت لە هی پیاو گرنگترە، چونکە ئەو بەستراوەتەوە بە هۆی تەڵاقەوە، ناتوانێ ـ بە ئاسانیی ـ قوتار بێت لێی، کەچی مێرد توانای تەڵاقدانی لە دەستایە، جا ئەگەر خاوەن

ئافرەتێك، ئەو ئافرەتەی دا بە ستەمكارێك، یان فاسقێك، یان فێڵداهێنەرێك، یاخۆ ئارەق خۆرێك، ئەو پیاوە ئەتكی ئایینی خۆی بەوە كردووەو خۆی خستۆتە بەر خەشمو قاری خوا، چونكە ڕەحم بڕانیی كردووەو هەڵبژاردنەكەی خراپ بووە"[1].

پیاوێك بە حەسەنی كوڕی عەلی گوت: "كچێكم هەیە، تۆ ئەڵێی بەكێی بدەم؟" ئەویش پێی گوت: "بیدە بە كەسێك كە لەخواترس بێ، ئەگەر خۆشییویست ڕێزی ئەگرێت، ئەگەر خۆشی نەویست ستەمی لێناكات"[2]. هەروەها ئیبن تەیمییە ئەڵێت: "ئەو كەسەی سوور بێ لەسەر گوناهكاریی نابێت ژنی بدرێتیێ"[3]. جاری ئەمە ئاگربەستێكی چاكو پاك.

سكاڵا: تۆ باسی قورئانو فەرموودەم بۆ بكە، ئەوان سەرچاوەن.

دڵپاك: خوشكەكەم، ئەزانم كە قورئانو فەرموودە سەرچاوەی سەرەكیین، بەڵام باوەڕ ناكەم منو تۆ لە غەزالییو ئیبن تەیمییە چاكترو زیاتر لەو دوو سەرچاوەیە تێگەیشتبین، خۆ ئەوان ئەو قسانەیان لە گیرفانی خۆیان نەهێناوەتە دەرەوە، لە قورئانو فەرموودەوە هەڵیان گۆزاون.

قورئان ئەگەر نەیفەرمووبێت مافی هەڵبژاردن بدەن بە ئافرەت، یان خۆی با بۆخۆی هەڵبژێرێو لاقەی مەكەن، نەیشی فەرمووە ئافرەت لەو مافە بێبەش بكەنو بە زۆرو زۆرەملێی بیدەن بە شوو، بەبێئەوەی پرسی پێبكەنو ڕاوێژی لەگەڵا بكەن، گوێت لێبوو؟

ئاواز: بەڵێ، بەمجۆرە گەلێ جوانو چاكە، قسەم نەما، ئەی فەرموودە؟

دڵپاك: بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، مافی هەڵبژاردن بۆ ئافرەت هەیە، چونكە كەسوكاری ئەبێت پرسی پێبكەن، ڕای وەربگرن، پێش مارەكردنی ڕەزامەند بكرێت، پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەزانێ هاوسەریی هاوبەشییەكە لەنێوان ئافرەتو پیاودا، ئەو هاوبەشییە ئەگەر لەسەر بنەڕەتیی خۆشەویستیو ڕازیبوون نەبێت سەرناگرێ، بەردەوام نابێ. لەبەرئەوە ناچاركردنی ئافرەتی قەدەغە كرد، چ بێوەژنو چ كچ، نابێ بەزۆر بدرێت بە شوو، نابێت بدرێت بە كەسێك كە حەزی لێنەكات، تەنانەت مارەبڕیین لەپێش پرس پێكردنیدا، لە پێش ئیزن وەرگرتنیدا ڕاست نییە، ئافرەت مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەو مارەبڕینەی هەیە[4].

بێوەژن ئەبێت پرسی پێبكرێتو بەڵێی لەدەم ببیسترێن، كچیش ئەبێ ئیزنی لێوەربگیرێتو بێدەنگیی بەڵگەی ڕەزامەندییە.

"الثيب احق بنفسها من وليها، والبكر تستأذن في نفسها واذنها صماتها". (رواه الجماعة الا البخاري).

"لا تنكح الأيم حتى تستامر ولا البكر حتى تستأذن. قالوا يا رسول الله كيف اذنها؟ قال أن تسكت". (عن ابي هويرة).

ئافرەتێك بەناوی خەنسای كچی خیدام، بێوەژن بوون باوكی دای بە شوو ئەویش بەو كارە نەیار بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ، ئاگاداریی كرد، پێغەمبەریش ﷺ شووكردنەكەی ڕەتكردەوەو هەڵیوەشاندەوە. (اخرجه الجماعة الا مسلما).

كچێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرو گوتی: "باوكم داومی بە برازاكەی هەتا لەكەكەی خۆی بەوە بشواتەوە"، پێغەمبەریش ﷺمەسەلەكەی دایە دەست كچەكە بۆ ئەوەی پەسەندی بكات یان هەڵیوەشێنێتەوە، كچەكە گوتی: "ڕازیم بەوەی كە باوكم كردی، بەڵام من ئەمویست ئافرەتان تێبگەیەنم كە باوكان كاریان لەم مەسەلەیەدا نییە". (رواه ابن ماجة). جا نازانم ئیتر داوای چی ئەكەن خوشكان؟

ئاواز: باوەڕت ببێ، من ئەم جۆرە حوكمانەم لەمەوبەر لە دەمی هیچ كەسێك قەت نەبیستووە!، بەڵكو پێچەوانەی ئەوەم

---

[1] فقه السنة/ ج2/ اختيار الزوج، ل24.
[2] فقه السنة/ ج2/ اختيار الزوج، ل24.
[3] فقه السنة/ ج2/ اختيار الزوج، ل24.
[4] فقه السنة/ ج2، ل129.

بیستووە.

دڵپاك: خوشكێ گیان، تۆ ڕۆڵەی سەرخاكی ئیسلامیی، خوێندەوارو ڕۆشنبیری، نابێت ئەوەندەش بە سادەیی دەستخەڕۆ ببی، حەیفە مێشكو بیری خۆت نەخەیتە كارەوەو بەراوردی ئەو قسانەی كە بیستووتنو ئەیان بیستی، نەكەیت!، زانایانی ئیسلام ئەڵێن: "هەركە ئافرەت پێگەیشتو نیشانەو بەڵگەی ئەو پێگەیشتنەی لێدەركەوت، نیشانەی ژیریی و چاك جوڵانەوەی لێ بەدی كرا، ئاگاداریيكردنی ئاگادارییكەرو پێسپێردراو (الولي الموصي)، ئیتر بەسەرەوە نامێنێ، باوك بێ یان كەسێكی تر، چونكە ئەوكاتە بۆی هەیە كاروباری دارایی و كەسایەتیی خۆی بگرێتە دەست خۆی، دیارە مێرد هەڵبژاردنو شووكردن یەكێكە لە كاروباری كەسایەتیی خۆی، بەڵام بەو مەرجەی كە لەوەدا لە سنووری ئیسلام دەرنەچێت، ئەم مەرجە بۆ پیاویشە، نەك تەنیا بۆ ئافرەت"[1].

بەمجۆرە ئەبینین باوكی، كەسوكاریی، یان سەرپەرشتیكاریی، بۆیان نییە زۆری لێبكەنو ناچاری بكەن بۆ شووكردن، بەتایبەتیی بە كەسێك كە ئەو نەیەوێتو حەزی لێنەكات، با ئەو كەسە ئاییندارو ڕەوشت پاكیش بێت، چونكە كارەكە زیاتر پەیوەندیی بەوەوە هەیە، تایبەتمەندییەكی گەورەو گرنگیی ئەوە، ژیانی ئەوی پێوە ئەبەسترێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "ليس للولي مع البنت أمر"[2].

سكاڵا: ئەی هاوار! من نازانم چۆن بەو درۆو دەلەسانە كاتی خۆی وەها هەڵخەتام! سەیرە، بە قسەی پووچەڵی سەر كۆڵان، بە هەندێ وشەی هەڕەمەكیی، ئەم ئیسلامە پاكەیان لێكردبووین بە ئاگرو مار!، وام ئەزانی ئیسلام قەسابەو ئافرەتیش بەرخۆلە!!

## پەیڕەویی ئیسلام نەك باوو نەریت

ئاواز: ئەوەی باست كرد زۆر ڕێكو پێكو جوانە، بەختیاریی ئافرەتی تیایە، بەڵام ئەوەتا ئەبینین باوو نەریتیی كۆمەڵگە جۆرێكی ترە، ئەوەی كە بۆ نێرینە ئەكرێت، بۆ مێینە ناكرێت.

دڵپاك: ڕاست ئەكەی وایە، بەڵام كام كۆمەڵگە؟، كام باوو نەریت؟، ئەی نابێ بزانین كە ئیسلام شتێكەو باوو نەریتی كۆمەڵگەش شتێكی تر؟، تاكەی ئەو دووانە لە یەكتر جیا نەكەینەوە؟، مسوڵمان ئەبێ پەیڕەویی ئیسلام بكات نەك باوو نەریتی گەنیوی ناو كۆمەڵگە، جا ئەگەر پەیڕەویی ئەو باوو نەریتانەی نەكرد ئیتر بۆچی پێی بگوترێت مسوڵمان؟، من مەبەستی تۆ تێئەگەم، ڕاستە نێرینە سەربەستە لە هەڵبژاردندا، دایكو باوكو كەسوكاری هەموو جۆرە یارمەتییەكی ئەدەن، كەچی ئافرەت بە پێچەوانەوە، بەڵام ئەوە ژەنگو ڕەنگدانەوەی باوو نەریتی كۆمەڵگەیە، فری بەسەر یاسای ئیسلامەوە نییە، دەبا ئێمە پەیڕەویی ئیسلام بكەین.

جا هەر كە پەیڕەویی ئیسلام كرا، یەكێك لە ئەركە گرنگو پیرۆزەكانی سەرشانی دایكو باوكو كەسوكار، هەڵبژاردنی هاوسەرێكی لەبارو گونجاوو چاكە بۆ ئافرەت، هاوسەرێكی بە ئایینی خاوەن وێلو ڕەوشتی بەرزو پاكی ئیسلامیی، نەك چاوبرینە سەروەتو سامانو هەندێ شتی تر، هەژاری ڕەوشت بەرزو مسوڵمان دەوڵەمەندە، دەوڵەمەندی بەدڕەوشت هەژارە، چونكە بەدڕەوشت لە ماوەی شەوو ڕۆژێكدا ئەگونجێت هەرچی سامانێكی هەیە لەسەر مێزی قوماركردن بیدۆڕێنێ، یان بە ئارەق خواردنەوە، یاخۆ بە گەڕان بە دوای داوێن پیسییدا خەرجی بكات، تەنانەت تەندروستیی خۆیشی بە شەونخونیی كێشانو تووشبوونی نەخۆشیی جنسی لەو شوێنانەدا گوم بكات، دیارە زیانو ئەنجامی خراپی ئەوەش هەر بە تەنها ئەو ناگرێتەوە، بەڵكو ئەگاتە خەڵكی تریش، بێگومان یەكەمجار هاوسەرەكەی، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ئەفەرموێ: "فلينظر أحدكم اين يضع كريمته". حەز ئەكەم ئەم باسە لە پەڕاوی (البيت الاسلامى كما ينبغى أن يكون)

---

[1] الاسلام وقضايا المراة المعاصرة/ البهي الخولي والمرأة في القران والسنة/ محمد عزة دروزة.

[2] الاسلام وقضايا المراة المعاصرة/ البهي الخولي والمرأة في القران والسنة/ محمد عزة دروزة.

دانراوی (مقداد یالجن) بخوێننەوە.

مسوڵمانانی پێش ئێمە تا ئەگاتەوە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەم مەسەلەیەدا چاویان لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، شوێن پێی ئەویان هەڵگرتووە، لەبەر ئەوە ئافرەت لە هەڵبژاردندا بەشدارو سەربەست بووە، کەسوکاریش خەمخۆری بوون، چۆن نا؟ لە کاتێکدا ئیسلام داوا ئەکات لە باوکان، لە ئاگادارییەکەری ئافرەتان کە کچەکانیان، خوشکەکانیان بدەن بە کەسێك کە چاکییو لەخواترسیی تیا ئەبینن، پێغەمبەر ﷺ خۆی بە ئیمامی عەلی فەرموو کە ئامادەیە کچی بداتێ، عومەر بە عوسمانو ئەبوبەکری فەرموو، نموونە هەر زۆر زۆرە بۆ ئەم مەبەستە.

سکاڵا: های.. های!! جا با ئێستا خەڵك شتی وا نەکا! بە بڤەی ئەزانن.

دڵپاك: باشە، بۆچی بە بڤەی بزانن؟، بۆچی شتی وا نەکا؟، ئایا ئەم خەڵکە لە پێغەمبەرو چوار جێنشینەکەی چاکترە؟، بە شوورەیی ئەزانن؟، شتی وا شوورەیی تێدا نییە، کارێکی شەرعییە، ئەبێ شەرم لە شتێ بکرێت کە شیاوی شەرم لێکردن بێتو ئەبی نەکرێت، نەك شتێ کە ڕەوایەو ئەبێ بکرێت.

ئەو کارە بەجێهێنانی کاروباری ئایینییە، پاكو ڕەوایە، تۆ ئەڵێیت جا با خەڵك شتی وا نەکا، بەڵام کردوویەتیو ئەیشیکات. دوو دەستە خەڵك کردوویانەو ئەیکەن، هەر بە چاوی سەری خۆم دیومە.

دەستەیەکیان مسوڵمانن، یەکێك لە فەرمانو ئەرکی ئایینیان بەجێهێناوە، دەستەیەکی تر لەبەر بەرژەوەندیی دنیایی، بەزۆریی لەبەر دەوڵەمەندیی ئەو کەسەی کە کچەکەی ئەدرێتێ، وەك ئەوەی ئەم هۆنراوەیە گوتوویەتی:

کچ لەلای ئێمە گوڵێکە بۆیە پەروەردەی ئەکەن
تا بڕازێنێتەوە مێزی شەرابی دەوڵەمەند

ئاواز: ڕاستە، ئەم کۆمەڵەیانم دیوەو هەن، بەڵام ئەویان نا.

دڵپاك: ئاخر تۆیش لەو کۆمەڵەیانەوە نزیكو تێکەڵاو بوویت، نەك کۆمەڵە مسوڵمانەکەیان، ئیتر هەر دەنگو باسی ئەوەیان ئەزانیت.

با ئەوە بڕوا، ڕۆژێکیان ئافرەتێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، داوای کرد کە پێغەمبەر مارەی بکات، پیاوێك لەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو وتی: "ئای چەند بێ شەرمە، وا سؤتاه، واسؤتاه"، پێغەمبەر ﷺفەرمووی: "هي خير منك، رغبت في النهي فعرضت عليه نفسها". (رواه البخاري).

سکاڵا: ئەی هاوار! ئەم خەڵکە چەند لە ئیسلام دوور کەوتۆتەوە! بۆچی؟

دڵپاك: دوورخراوەتەوە، دوور نەکەوتۆتەوە، ئەوەم هەر بۆ نموونە نەك بۆ هەڵدان هێنایەوە، ئەگینا نموونە لەو بارەوە زۆرو زەبەندەیە، ئایا ئەوە سەربەستیی نییە بۆ ئافرەت؟

## سەربەستی مەرجی لەگەڵدایە

ئاواز: لەسەر ڕۆشنایی باسەکانی پێشوو، ئەتوانین بڵێن ئافرەت لەسەدا سەد شووکردنی بە دەستی خۆیەتیو هیچ کەسێك ناتوانێ دەست بخاتە ئیشوکاریەوەو خۆی هەرکەسی هەڵبژارد هەر ئەوە بێت؟

دڵپاك: نەخێر.. نەخێر، تۆ یان ئەتەوێ شت بگۆڕێت، یان بە خواروخێچ لەشت ئەگەیت، باسەکانی پێشوو ئەوەیان نەگەیاند کە تۆ بۆی چوویت، بۆچی پیاو لەسەدا سەد سەربەستیی پێدراوە، تا بە ئافرەت بدرێت؟

ئاواز: چۆن؟ ئەی پیاو سەربەستیی تەواوی نییە؟ ئەی بۆچی ئافرەت نەیبێ؟

دڵپاك: نە پیاوو نە ئافرەت سەربەستیی تەواویان بەمانای لەسەدا سەد نییە.

سەربەستی لە ئیسلامدا سنووری خۆی هەیەو نابێت لەو سنوورە دەربچێ، سەربەستیی تەواو بۆ ئادەمیزاد لەم سەرزەمینەدا بوون (وجود)ی هەر نییە، تەنها وشەیەکە لەزار دێتە دەرەوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی هەندێ کەس. مسوڵمان ئەبێ

لە ئیسلامەتیی نەچێتە دەرەوە، ئایا ئەتوانین بیکەین بەفریشتە؟ دەی ئەوە سنوورە، هەموو شتێ سنووری تایبەتی خۆی هەیەو نابێت لێی بچێتە دەرەوە، خۆ ئەگەر چووە دەرەوە، بێگومان ئەنجامەکەی زیانی تیایە، نەك چاکەو خێر، بەڵام ئاخ چی بکەیت لە مێشکی بێر تەسك!.

ئاواز: بەڵام بەو جۆرە سنووردارەی کە مەبەستە، ئایا ئافرەت ئەتوانێ بەرەو بەختیاریی هەنگاو بنێت؟

دڵپاك: نەخێر، ئەو بەختیارییەی کە ئێوەمانان بە بەختیاریی ئەزانن، ئیسلام ڕێگەی بوونی نادات، ناهێڵێ ئافرەت بەرەو ئەو بەدبەختییە هەنگاو بنێت، ئەوە بەدبەختییە، نەك بەختیاریی، زۆرسەیرە!، نازانم لەبەرچی ناوگەڵ چڵێسی بە بەختیاریی ئەزانن؟، ئەی بۆچی ئەگەر بە ڕێگەیەکی ڕەوای پاك ئەو کارە ئەنجام بدرێت بەدبەختییو چارەڕەشییە؟، ئەو کەسەی کە برسی بێ، دیارە تێرکردنی پێویستە، بەڵام ئەگەر بەخۆراکێکی پاکی ڕەواو حەڵاڵی بێ میکرۆباویی بێت بۆچی بەدبەختیو کڵۆڵییە؟!، ئەی ئەگەر بەد خۆراکی پیسی حەرامو میکرۆباوی بێت، بۆچی بەختیاریو کامەرانییە؟!.

مسوڵمان لە چوارچێوەی ئیسلامدا سەربەستە، سەربەستییو بەرەڵایی تێکەڵ ناکات بە یەکا، سەربەستیی مەرجی لەگەڵدایە، چ بۆ ئافرەتو چ بۆ پیاو، هەردووکیان ئەبێ پەیڕەویی ئەو مەرجانە بکەن.

## بەرژەوەندی ئافرەت ڕەچاو ئەکرێت

سکاڵا: گیرگرفتێ خۆی بە سەر بیرمدا سەپاندووە، تەماشا ئەکەیت ئافرەتێ کوڕێکی مسوڵمان کە مەرجی چاکەی تیابێت هەڵئەبژێرێ بۆ هاوسەری خۆی، کەچی لەولاوە دایكو باوکی یەکێکی تری بۆ هەڵئەبژێرن، ئەویش هەرمەرجی چاکەی تیایە، لێرەدا چی بکرێت؟، ڕای کام لایان پەسەند بکرێت؟.

دڵپاك: پێشەکیی هەرگیز نابێتو نەشبووە دوو کەس لە چەند مەرجێکدا کتومت هاوسان بن، قابل نییە یەکێکیان لە ئەویتریان زیادیی، یان کەمیی هەر هەیە، من ناڵێم زۆر بەڵام کەمێك هەر بووەو ئەشبێت، ئیتر گیروگرفتەکە بێ چارەسەر نامێنێتەوە، ئێمە ئەتوانین بڵێین ئافرەتەکەو کەسوکارەکەی هەریەکەیان ئەوە بە چاکتر ئەزانێ کە هەڵیبژاردووە.

سکاڵا: ئا.. ئا. ئەمویست وەها بڵێم، بەڵام بەو جۆرە بۆم نەهات.

دڵپاك: لەم حاڵەتەدا حوکمەکە ئەدرێتە دەست دادوەرو چەند کەسێکی لێزانو ژیر، ئەدرێتە دەست ژیرییەکی دووربیین، جا ئەگەر دەرکەوت کە ئافرەتەکە لەسەر هەقە ئەوا داواو مەبەستەکەی ئەو پەسەند ئەکرێت، خۆ ئەگەر کەسوکارەکەی لەسەر هەق بوون، داواو مەبەستی ئەوان پەسەند ئەکرێت. لەڕاستییدا، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خێرو خۆشی ئافرەت دێتە دی، شەرە شەقەکە بۆ بەرژەوەندیی ئافرەت ئەکرێت، دەی چ یاسایەکی سەرزەمینی بەو جۆرەو بەو وردەکارییە بەختیاری ئافرەتی بەلاوە مەبەستە؟!.

کاتێ دەرکەوت کە ئافرەتەکە لەسەر هەقە ئەوە (نور علی نور)ە، حەزو ویستی ئەبێ ڕێزی لێبگیرێت، پەرە بە کەسایەتیی بدرێت، چونکە کارەکە زیاتر پەیوەندیی بەوەوە هەیە، چارەنووسی خۆی لەوەدا، خۆی بڕیاری لەسەر دا، دوایی ئەگەر شتێکیشی هاتە ڕێگە، نایکات بە تاوانی کەسی تر، لەبەرئەوەی کە کاری خۆی بووە، بە سنگێکی فراوانەوە پێشوازیی گیروگرفت ئەکات، سەبرو ئۆقرەو ئارامگرتنی زیاتر ئەبێت، هەست ناکات بەوەی کە ستەمی لێکرابێ.

سکاڵا: خوشکە دڵپاك، دەی تۆ ئەمەم پێبڵێ ڕێگای هەڵبژاردن چۆنە، دەی بەپێی یاساو سشەریعەتی ئیسلام هاوسەر چۆن هەڵئەبژێررێت؟

دڵپاك: چاوەکەم، ئێستا ئێشی قوتابخانەکەم بەسەرەوەیە، کەمێکیش هەست بە ناساغیی ئەکەم. ئەگەر خوا مۆڵەتی داینو ماین، بۆت باس ئەکەم.

# بەشی شەشەم

## یەکتر بینین ڕەوایە

سکالا: خوشکە دڵپاك، سوپاس بۆ خوا واچاك بویتەوە، دوێنێش هیچم لێنەپرسیت، بۆ ئەوەی سەرت نەیەشێنم، جا نازانم..

دڵپاك: خوا پاداشتت بداتەوە، تێئەگەم مەبەستت چییە، بەسەر چاوان لەباسی چۆنیەتی هەڵبژاردنی هاوسەردا بووین، لە بیرمە.

ئاواز: هەڵبژاردن! ئەی تەماشاکردنی ئافرەت لە لایەن پیاوەوە، یان پیاو لە لایەن ئافرەتەوە، لە ئیسلامدا حەرام نییە؟ ئیتر هەڵبژاردن کامەیە؟ قابیلە ڕێگەی ئەوەیان درابێتی کە یەکتر ببینن و لە یەکتری بکۆڵنەوەو شارەزا بن.

دڵپاك: خوشکە ئاواز، تۆ هەرکە دەم ئەکەیتەوە، قسەکانت سەبارەت بە ئافرەت قین لەدڵی لێ ئەچۆڕێ، زیادە ڕۆیی بێبەڵگەیش ئەکەیت، گەلێ جار لە گوتنی ڕاستیشا گێلیت لێبەدی ئەکەم، جا نازانم ئەوە گێلی بێ یان خۆ گێل کردن بێت؟ باشە، پێم ناڵێیت تۆ ئەو قسانە لە کوێوە ئەهێنی؟ بۆچ ئەیانکەیت؟

ئاواز: سەیرە! ئەی تەماشاکردن لە ئیسلامدا حەرام نییە؟

دڵپاك: بەڵام تۆ دۆو دۆشاو تێکەڵ ئەکەیت! بۆچ هەموو تەماشاکردنێ یەك شتە؟ هەموو نانخواردنێ یەکجۆرە؟ ڕازاندنەوەی سفرەیەك بە خۆراکی حەڵاڵ لە مانگی ڕەمەزان و مانگێکی تردا لە نیوەڕۆژدا هەردووکیان ئەبێ یەك حوکمیان بەسەرا بدرێت؟

سکالا: نەخێر، لە ڕەمەزاندا گوناهە، بەڵام لە مانگەکانی تردا گوناه نییە.

دڵپاك: ئاواز خان، تەماشاکردنیش هەیانە ڕەوایەو هەیانە ناڕەوایە، یەکێك لەو ڕەوایانە هی کاتی هەڵبژاردنی هاوسەرە، هی دەسگیران گرتنە، نەك هەر ڕەوایە، بەڵکو زۆر گرنگیشە. بەڵام لە سنوری دیاریکراوی خۆیدا.

چۆن نا؟! یەکێك لەو هۆیانەی کە ژیانی ژن و مێرد پاراو ئەکات، بەختیاری پێ ئەبەخشێت، ئەوەیە کە ئافرەت و پیاو لەپێش داواکردنا یەکتر ببینن، هەتا چەندێتی (مقدار)ی جوانیی یەکتر بزانن، یاخۆ ناشیرینی یەکتریان بۆ دەربکەوێ، دوای ئەوە هەریەکەیان بڕیاری خۆی بدات. (الأعمش) ئەڵێت: "هەر بە هاوسەربوونێك کە لەسەر بنەڕەتی یەکتر نەبینین دامەزرێ ئەنجامەکەی غەم و پەرێشانییە"[1].

لەبەر گرنگی ژیانی هاوسەرێتی ئیسلام ڕێگەی داوە بە پیاو کە تەماشای ئەو ئافرەتە کە ئەیەوێ بیخوازێ بکات، وە بۆ ئافرەتیش هەروەها، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "اذا خطب أحدكم المرأة فأن استطاع أن ينظر الى ما يدعوه الى نكاحها فليفعل"[2].

ئەبو داود ئەگێڕێتەوە کە جابر گوتوویەتی "ئافرەتێکم لە بەنی سەلەمە داواکرد، خۆمم ئەشاردەوە بۆی، هەتا ئەوەی ئەمویست بیبینم، لێی، دیم، هەروەها (مغیره بن شعبه) گوتی: "داوای ئافرەتێکم کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أنظرت أليها)؟ گوتم، نا، فەرمووی: "أنظر اليها، فانة احرى أن يؤدم بينكما". (راوه النسائی وابن ماجة والترمذی وحسّنة).

پیاوێك داوای ئافرەتێکی لە پشتگیران (الأنصار) کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "أنظرت أليها"؟ گوتی: نا، فەرمووی:

[1] فقه السنة ، بەرگی دووە، ل28 : السید السابق.

[2] التاج الجامع الأصول لأحاديث الرسول ص284.

"فاذهب فانظر اليها، فأن فى أعين الأنصار شيئا" لە ئەبوهورەیرەوە.

سکالاّ: بەڕاستیی کارێکی چاکە، کە بەو جۆرە بووە، ئیتر دوایی هیچ کامیان ناتوانێ گلەیی لەویتر بکات، ئەگەر کردیشی گلەیی بێ سەرو بن ئەکات. دیارە دوو هاوسەر ئەگەر وەها یەکتر نەبینن، لەوانەیە دوایی ژیانیان لێ بێتە دۆزەخ، دنیا لەبەر چاویان ڕەش و تاریك بنوێنێ، خۆشیی ڕێی نەکەوێتە هەوارگەی دڵیان تا ئەو کاتەی کە لە یەکتر جیا ئەبنەوە.

ئاواز: دڵپاك خان، بەم تەماشاکردنە تەنیا لایەنی جوانی دەرئەکەوێ، خۆ تۆ گوتت، لە ئیسلامدا جوانیی مەرجی سەرەکیی نییە، ئایا وانەبوو؟

دڵپاك: بەڵی وابوو، ئەو کەسەی مەبەستی لە یەکتربینین جوانیی بێ ئەوا ڕێگە پێدراوە، خۆ ڕێگای لایەنەکانی تر گەلێ لەمەیان ئاسانترن. سك و زا، لە سەرنجدان لە خوشکانی، دایکی، خوشکانی دایکی، تاڕادەیەکی زۆر دەری ئەخات، ڕەوشت و کار چاکیی بە دیراسەکردنی خێزان و بنەماڵە لەسەدا هەشتا دەرئەکەوێ، بە تایبەتی ناسینی دایکی، چونکە "گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە"، یا وەك ئەڵێن: "مادەر ببینەو دوختەر بخوازە".

هەروەها ئادەمیزاد ئەتوانێ بە پرسیارکردن لەدەرو دراوسێ یان دەستە خوشکانی ئەو کچە، یاخۆ خزم و خوێشی پیاوەکە کە جێگەی باوەڕی ئەمن پرسیار بکات و گەلێ زانیاریی لە زۆر ڕووەوەو سەبارەت بەو ئافرەتە بەدەس بهێنێ ئەوسا داوای بکات و بیکات بە هاوسەری خۆی. تۆ بڵێی ئەمانە هەموویان بەس نەبن بۆ ڕەوینەوەی ئەو ترس و بیمەی کە خراوەتە دڵی ئافرەتەوە بە ناهەق؟

## کوێ و چەند؟

سکالاّ: لە سەرگوزەشتەکەی جابردا گوێم لە ڕستەی "هەتا ئەوەی ئەم ویست ببینم، دیم"، چی ئەگەیەنێ؟ ئایا پیاو بۆی هەیە هەموو لەشی ئافرەت ببینێ ؟ وە ئەبێ چەند سەیری بکات؟

دڵپاك: پرسیارەکەت زۆر جوانەو بەجێیە پێویستی بە ڕۆشنکردنەوە هەیە تا بە هەڵە نەچێتە دڵتەوە. جەماوەرو زانایان وای بۆچوون کە ئەبێ تەماشای دەمو چاوو دەستی بکرێت نەك شوێنێکی تر. چونکە دەموچاو جوانیی و ناشیرینی ئادەمیزاد نیشان دەدات، هەردوو دەستیش گۆشت و نەرم و نیانی یان لاوازیی و ڕەقی لەش نیشان ئەدەن.

لە ڕاستیدا فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ شوێنی تەماشای شوێن تەماشاکردنیان دیاری نەکردووە، بەڵکو ڕێگەی ئاچوخ کردووە بەڕادەیەك کە مەبەستی تەماشاکردنەکە ئامانج بدات بەدەستەوە. بەڵام نەك هەموو دەستێك. بەڵکو دەستێکی پاکی خواناس و لەخوا ترس. هەندێ شوێن بە هیچ جۆرێ تەماشاکردنیان ڕەوا نیەو ڕێی پێ نەدراوە. جا دوای یەکتر بینین ئەگەر یەککەوتن و بوون بە هاوسەری شەرعی ئەوا ئیتر پەردە لە نێوانیاندا لائەبرێت. خۆ ئەگەر یەکتریان دی و ڕێك نەکەوتن. ئەوە نابێت دوایی هەر نەنگیێ کە لەیەکتردا دیویانە بۆ خەڵکی تری باس بکەن و یەکتری پێ سوك بکەن لەبەر چاوی خەڵکی تر چونکە "لا ضرر ولا ضرار".

هەروەها تەماشاکردنی جارێ یان چەند جارێکە هەتا بە باشی چەندێتی جوانیی و گۆشتنیی و لاوازیی ساغ ببێتەوە، دوایی ئیتر ڕێگەی پێنادرێت چونکە لە وەسیلە دەردەچێت و ئەبێت بە مەبەست، ئەوەش پێچەوانەی گیانی پاکی ئیسلامە. دیارە موسڵمانیش نابێ پێچەوانەی ئیسلام بجوڵێتەوە، ئەوەی کە باسمان کرد بۆ ئافرەت و پیاو وەك یەك ڕەوایە، ئەو حوکمانە تەنها بۆ پیاو نین، بەڵکو بۆ ئافرەتیشە وەك پیاو، لەوەش زیاتر عومەر فەرموویەتی: "لاتزوجوا بناتکم من الرجل الدمیم، فان یعجبهن ما یعجبهم منهن". (دمیم) یانی ناشیرین و ناجوان.[1]

[1] تەماشای فقه السنة ج2 و البیت الاسلامی کما ینبغی ان یکون وة قضایا المرأة المعاصرة بکە.

دیارە مادام ئیسلام تا ئەو ڕادەیە بواری تەماشاکردنی دابێت، بواری شارەزابوونی کەسایەتیی و خوڕەوشت و کارچاکیی زیاتر دەدات، پیاو بۆی هەیە لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بە مەرجێ مەحرەمی ئافرەتەکەیان لەگەڵا بێت، بچێت لەگەڵیا بۆ ئەو شوێنانەی کە شوێنی پاکن، ئەی بەوەش شارەزایی ژیریی و دەروون و هەڵسوکەوت و ڕەفتارو جەو جووڵ و لایەنەکانی تری یەکتر نابن؟ لەوە زیاتر ئەبێ چییان لەیەکتر بوێت؟

ئاواز: هەندێ موسڵمان لەوەدا زۆر جکن و ناهێڵن پیاو کچ و خوشکیان تا ئەو ڕادەیەش ببینێ، گەرچی ئەو ڕادەیەش هەر بەس نییە.

دڵپاك: ڕاست ئەکەی لەوەدا کە گوتت هەندی موسڵمان لەوەدا جکن. بەڵام ئەی بۆچی نەت گوت هەندێ بەناو موسڵمانیش لەوەدا هەوسارو لغاو بەتەواوەتی بەرەڵا دەکەن بۆ کوڕو کچ، ئەمەیانت پێ پڤە بوو؟! بۆچی؟ هەندێ کەس بە ئێجگاری خۆی لەمەدا بەرداوەو بەرئەدات، کچەکەی یا خوشکەکەی یان خزمەکەی بەرەڵلا ئەکات، دەیداتە دەست دەستگیرانەکەی پێش ئەوەی مارەی ببڕێت، بۆ هەر لایەك کە بیەوێ ئەیبات، هەرکە بیەوێ خۆی ئەکات بە ماڵدا، دوو بە دوو کۆ ئەبنەوە، ئایا ئەنجامی ئەو کارەیان چاك دەرئەچێت؟ پەشیمانیی بەداوەو نابێت؟ ئای کە چەندەها ئافرەت لەو ڕێگەیەوە ئەتك کراوە، ئابڕووی براوە، بێگەردیی لە دەست چووە، ئەتکی خێزانەکەی کراوەو لە نیوەی ڕێگەدا دەسگیرانەکەی دەستی لێهەڵگرتووەو ئافرەتەکە بەدبەختیی بۆ ماوەتەوە!!

خوشکە گیان، ئیسلام ئیسلامەو سنوری بۆ هەموو شتێك دیاری کردووە، من و تۆ تەنها سەیری خۆمان ئەکەین، ئەویش لەو ساتانەدا کە تیایانا ئەژین، بەڵام ئیسلام ئەو ساتانە، پاشەڕۆژو ئەنجام، ژیانی ئەو دونیاش، ئەمانەی هەموو ڕەچاو کردووە. لەبەر ئەوە قەد ڕێگەی دوو بە دوویی (الخلوە)ی نەداوە و هەرگیز نایدات. چونکە سەرپێچی کردن، بەدکاریی، خۆدان بەدەستەوە، ڕوو ئەدەن، خۆگرتن کەم ئەبێتەوە، ئارەزوو و هەوەس گەلێ جار زاڵ ئەبن بەسەر ژیریی و گیاندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يخلون بامرأة ليس معها ذو محرم، فأن ثالثهما الشيطان" (عن جابر)، وە لە عامری بن ربیعەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "لايخلون رجل بامرأة لا تحل له، فان ثالثهما الشيطان الا محرم"[1].

لێتان ناشارمەوەو بەبێ پێچ و پەنا ئەیڵێم، ئیسلام وەك ڕۆژئاواییەکان نێرو مێ بەرەڵا ناکاتە ناو یەکتر، هەتا پاش بەرەڵاییەکی زۆری فراوان و لێ پەڕینی بێ سنوور، ئەوسا بڕیاری ڕازیبوون یان نەبوون دەربکەن. یان وەك ڕوسیا کە ماوەی سێ مانگ کوڕو کچ بەر ئەدرێنە یەکتر، بە هەوەسی خۆیان هەرچی بکەن (سەربەست) بن، ئەوسا بۆ یەکتر بن یا دەس لە یەکتر بەربدەن و هەریەکەیان لەگەڵ یەکێکی تردا سێ مانگی تر بچێتە دەورەوەو بەو جۆرە تا هاوسەنگەرێکی (گونجاو)!! ئەدۆزێتەوە. گوایا ئەوە پێشکەوتن و شارستانییەتە![2]

جا ئەگەر پیاو و ئافرەت، بەو شێوە ئاژەڵییانە بەرەڵلا بن، سێ مانگ، سێ مانگ، تاقیکاریی بەجێ بێنن، پەڕینێکی زۆرو فراوانی خۆڕایی و هەوانتە، بۆ کەسی کە خاوەن باوەڕ نەبێ (باوەڕ بە خوا) دەس بدات و مسۆگەریش بێت، ئیتر ژن هێنان و شووکردن یانی چی؟ چ نرخ و گرنگییەکی هەیە؟ لەسەرێشە بەو لاوە چی تری تیایە؟ بۆچ باسی بکەین؟ ئەی نابێ بزانین، هەر شتێ مسۆگەر بێت، ئیتر مرۆڤ ئەوەندە هەوڵی بۆ نادا؟ ئەگەر دەرچوون مسۆگەر بێ، قوتابی سەعی ئەکات؟

سکالا: سبحان الله، ئەم ئیسلامە، پاکە خاوەن یاسا بەرزە، من وام ئەزانی لە نوێژو ڕۆژوو بەو لاوە هیچی تر نییە! لە باسی زەکات و سەرفیترە بەدەر، باسی شتێکی تری نەکردووە! توخوا گوناح نییە بە خەڵك نەگەیەنرێ و نەخرێتە بەرچاو؟ ئای ناحەزی چی لێکردووە!

[1] هەر دوو فەرموودەکە لە گێڕانەوەی (أحمد)ن.

[2] المرأه في القرن العشرين، جرولن السابق.

دڵپاك: چاوەكەم، هەورو تەمو مژو دوكەڵ، چەندێ خەستو خوڵ بنو بتوانن خۆرمان لێبشارنەوە، بەڵام هەر ئەڕەوێنەوە، خۆر ئەكەوێتەوە، دنیا ڕۆشنو گەرم ئەكاتەوە، ناحەزیش هەر ماندوبوونی بۆ ئەمێنێتەوە، كوان ناحەزان دەستە بە دەستەن ئایا ئیسلام ڕیشەكەن كرا؟

خۆر لە تیشك پژان هەرگیز ناكەوێ

شەمشەمە كوێرەش تاریكیی ئەوێ

## ئەی مەبەستی چییە؟

ئاواز: مامۆستا دڵپاك ئەوەی كەبیستم لێت هەمووی ڕاستە، بەكەڵكە. بەڵام ئێمە مانان تازە لە دەست دەرچووین، سفوریی، نوێژنەكردنو ئەو جۆر ەشتانە، هەر بە منالیی هێناومانە، بووە بە خوو بۆمان، ئەم بەرنامەیەی كە تۆ باسی ئەكەیت، ئەگەر ئادەمیزاد لە منالییەوە بیهێنێ، ئەتوانێ لەسەری بڕوات، بەلاّم بۆ ئێمە نا، زەحمەتە. ئەی نالێن "دار بەخامەیی ئەچەمێتەوە؟" پێشینان ڕاستیان گوتووە "هەركەس بەپیری فێری پلاّو خواردن بێ، دەست بۆ لوتی ئەبات".

دڵپاك: سبحان الله، ئەمەشیان فێركردوون؟ لەپاڵ زوڕنای پەڕییندا، كە فرۆید لێیدەدا، دەهۆڵی پەروەردەشیان بۆ لێدان؟ ناهەقت ناگرم، هەرگیز بیرم نەئەكردەوە كە ژاری پەروەردە پیسەكەی فرۆید تا بەم ڕادەیە گەیەنرابێتە مێشكت!

ئاواز: ئەوە تۆ چی ئەڵێیت ؟ فرۆیدو مرۆیدی چی؟

دڵپاك: ئاواز خان، ئەو قسانەی تۆ لە هینەكانی فرۆیدەوە وەرگیراون، جا تۆ خۆت بەوە بزانی یان نەزانی گرنگ نییە، بەلاّم من لێت ئەپرسم بۆچ تۆ داری یا ئادەمیزاد؟ پیری یان گەنجی؟ تۆ هێشتا ئەوەتای لە سەرەتای بەهاری تەمەنتا، پیری چی؟

ئاواز: من ئادەمیزادم، نەك دار، بەلاّم فرۆید لەم ڕووەوە هیچ كارێكی نییە.

دڵپاك: نا، وا مەڵێ، خوشكەكەم، فرۆید لەم ڕووەوە قسەی كردەوەو بیردۆزی داناوە، دەڵێت: "كەسایەتی (شخصیە)ی ئادەمیزاد لە یەكەمین پێنج ساڵی تەمەنی منالّییدا دروست ئەبێت، ئیتر دوایی هەرچی كۆششێك بۆ چاك كردنی بكرێت هیچ كەڵكێكی نابێت"[1].

سكالاّ: جا فرۆید ڕاست ئەكات لەوەدا؟ ئەی مەبەستی چییە؟

دڵپاك: نەخێر ڕاست ناكات، بەلاّم بەوە ئەبێ خەنجەرە ژەهراوییەكەی لەیەك كاتدا بەر دوو سنگ بكەوێ، سنگی باوكانو سنگی منالّەكانیشیان.

ئاواز: بەلاّم من تا ئێستاش تێناگەم!

دڵپاك: وەك ئەزانین، باوكان تا تەمەنی منالّەكانیان نەگاتە شەش، حەوت ساڵیی، بە زۆریی، باوكان ئەوەندە گوێ بە پەروەردەكردنی منالاّنیان نادەن، منالّ هەرچی بكات (با هەڵەش بێ) باوك پێ ئەكەنێ بە دەمیەوە یان بێدەنگ ئەبێ، چونكە ئەڵێ، منالّە، نەفامە، ئەرەجی لەسەر نییە.

ئەمجا لە دوایی شەش یان حەوت ساڵیی، وە كە منالّ وورده وورده ئاوەز پەیدا دەكاتو كاتی پەروەردەكردنی دێت، فرۆید قوت ئەبێتەوەو پێی ئەڵێت: خۆت ماندوو مەكە، بێ كەڵكە، هەلی پەروەردە كردن لەدەستچوو، تازە هەوڵی ڕاستكردنەوە كەڵكی نابێ، چونكە تەمەنی لە پێنج ساڵ تێپەڕی كرد.

دیارە باوك بەوە ئەگەر باوەڕی كرد، ئەوا دەستی ساردو شل ئەبێو پاڵ ئەداتەوە، منالّەكەش لەو لاوە بێ خاوەنو بێبەرابەر ماوەیەك بۆ خۆی ئەسوڕێتەوە، تا دزێك دێتو ئەیدزێو ئەیكات بە شاگردی خۆیو دوایی ئەیخاتە ناو

[1] نحو علم نفس ألامی : د. حسن الشرقاوی.

کۆمەڵگەوە بۆ بەجێهێنانی مەبەستی مامۆستاکەی. باشە، ئەگەر فرۆید ڕاست ئەکات، ئەی بۆچ زۆربەی بەرنامەکەی ئاراستەی گەنج و پێگەیشتووەکان ئەکات؟ بۆچ پەروەردەی ئەو وەرئەگرن، ئەی بۆچ هی دایك و باوك وەرناگرن؟

ئەی هەزارەها ڕەحمەت بڕژێ بەسەر گیانی پاکی (غەزالی)دا، کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا، هاواری لە موسڵمانان کردووە تاکو وریابن و بەو جۆرە بانگەوازە پڕ لە درۆیانە هەڵ نەخەڵەتێن، ئەها ئەفەرمووێ: بزانە کە هەندێ لەوانە بێکاری زاڵبووە بە سەریاندا، خەبات کردنیان بەرامبەر بەدەروون (النفس) زۆر بە قورس داناوە، خەباتکردنیان بە پاککردنەوەی، جوانکردنی ڕەوشتی، بەگرانیان داناوە، ئەڵێت: کە ڕەوشت گۆڕینی بۆ نییە، سروشت هەرگیز ناگۆڕێت..

جا ئەگەر ڕەوشت گۆڕینی بۆ نەبوایە، ئامۆژگاریی و پەروەردەو لێدان هیچ کەڵکیان بۆ نەئەمایەوە، کەچی تاقیکاریی سەلماندی کە ئاژەڵیش پەروەردە وەرئەگرێ، مایین، لە سرکیی و یاخیبوونەوە، ئەهوەن ئەبێتەوەو بۆ سواریی و ڕاو پێکردن بەکارئەهێنرێت، سەگ بە پەروەردەو فێرکردن هونەری ڕاوکردن فێر ئەبێت، پاش ئەوەی ڕاوی بۆ خۆی کرد بۆ خاوەنەکەی ئەکات[1].

سکالا: الله! چەندە ڕاست ئەکات! بەڵام هەندێ کەس ناشگاتە هەندێ ئاژەڵ.

دڵپاك: لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ هەر بەهیوای چاکەو خێربین لە ئادەمیزاد، ئەی نازانێ (وەك غەزالی پێشەوا ئەڵێ) هەندێ سروشت پەروەردە بە خێرایی وەرئەگرن، کەچی هەندێکی تر بەیەواشیی و لەسەرخۆ وەری ئەگرن؟

سکالا: بەڵێ، ئەمەش ڕاستە.

## مێژوو واقیع سەلماندوویانە

ئاواز: دڵپاك خان، تۆ گوتت لەو مەسەلەی پەروەردە کردنەدا فرۆید ڕاست ناکات، من بەرگری لە فرۆید ناکەم بەڵام ئەتوانی بیسەلمێنی کە بیردۆزەکەی ڕاست نییە؟

دڵپاك: خوشکە گیان مێژوو واقیع هەردووکیان پێکەوە سەلماندوویانە کە بیردۆزەکەی هەڵەیە.

ئاواز: چۆن؟ ئەکرێ ڕۆشنی بکەیتەوە؟

دڵپاك: بەڵێ؟ بۆچی ناکرێ؟ بابگەڕێینەوە بۆ سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام، لە کاتێکا کە فرۆید ئەڵێت: کەسایەتی ئادەمیزاد لەیەکەمین پێنج ساڵی تەمەنی منداڵیدا دروست ئەبێت، ئیتر دوایی ئەوە هەرچی کۆششێ بۆ چاککردنی بکرێت، هیچ کەڵکێکی نابێت. ئێمە پێچەوانەی بیردۆزەکەی لە ئیسلامدا زۆر بە ئاشکرا ئەبینین.

چونکە بەشی زۆری ئەوانەی کە موسڵمان بوون لەو سەردەمەدا نەك تەمەنی منداڵیی، بەڵکو تەمەنی گەنجیەتیۆ لاوێتیشیان بەسەر بردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نەفامە چەقیوانەی ناو لیتەو بەنداوی بت پەرستی و دەمارگیریی و سووخۆریی و تەنانەت داوێن پیسی وەها گۆڕان لەسایەی بەرنامەی خوادا کە بوون بە فریشتەی سەرزەمین، بوون بە ژیرکەری ملهوڕان، بوون بە (رهبان اللیل وفرسان النهار) لەدوای ئەوەی کە لاواز بوون، بەهۆی ئارامگرتنەوە هێزیان تێکەوت، کە بوون بە حوکمڕانی هێزەکیان دادپەروەریی لێکەوتەوە. جا با چەند نموونەیەکت بە کورتی بۆ باسبکەم، تا چاك تێبگەیەت.

.. ئەبوبەکری سدیق لە تەمەنی (38) ساڵیدا موسڵمان بوو. پیاوێکی دڵنەرم بوو، دڵنەرمیی لێ ئەتکا، کەچی ئیسلام ئەو پیاوەی وەها گۆڕی کە بتوانێ لەیەك کاتدا یانزە سوپا ڕێك بخات و پیادە بکات. ئایا ئەو دڵنەرمییە نەگۆڕا بۆ هێزو پێزو سوور بوون لەسەر بڕیارێ کە ئەدرا؟

.. عومەری کوڕی خەتتاب، کە موسڵمان بوو پیاوێك بوو نەك منداڵ، شەڕانیی، دڵڕەق، کەچی ئیسلام گیانی گۆڕی،

[1] کتاب الله یاولدی : محمود غریب.

عومەر بوو بە سەرچاوەی خێرو بێر بۆ خەڵك، سەرزەوی پڕ كرد لە دادگەری، پاشاكانی ئەو سەردەمە بە بیستنی ناوی، تەختو تاراجیان ئەهاتە لەرزە، لەگەڵ ئەوەشدا كە گوێی لە گریانی مناڵێكەوە بوایە، ئەویش ئەگریا و ئەیگوت "ئەترسم بە هۆی ستەمی منەوە بگری". دەی ئەمە لە كوێو بیرشێوێنەكەی فرۆید لەكوێ؟

ـ عوسمانی كوڕی عەففان، تەمەنی لە سی ساڵیی بەرەو ژوورتر بوو كە موسڵمان بوو، كابرایەكی بازرگان، دیارە بازرگانیش هەمیشە سەیادی قازانجو سامان پێكەوەنانو دەوڵەمەندییە. كەچی ئەو پیاوە پاكو مەردەی لێدەرچوو كەبەشی هەرە زۆری سامانەكەی لە پێناوی بەرزیی ئایینەكەیدا خەرج كرد، ئایا ئەوەش گۆڕین نەبوو؟ بۆچ گۆڕیین شاخو گوێی هەیە یان زەردو سوورە؟

ـ عەلی كوڕی ئەبو تالیب، كاتی كە ئیسلام دەركەوت تەمەنی حەوت ساڵ بوو، دەی ئەبوایە بە پێی بیر خەڵوزییەكەی فرۆید هەوڵدان لە گەڵیا بێسوود بوایە، كەچی پیاوێكی لێدەرچوو كە بۆ خوا ژیا، لەڕێگەی خوادا ڕۆیشت.

ـ بیلال، بەندەیەكی حەبەشی بوو، هەر لەسكی دایكیا ژیانی بەندەگی چاوەڕوانی ئەكرد، كاتێ كە موسڵمان بوو، خوێنی هێزو دامەزراویی لەسەر هەق لە لەشیا جۆشاو ئەوەندە چاونەترساویی كەوتە گیانییەوە، لە ڕوویی جێگیركردنی حەقەوە ململانێی لەگەڵ عومەردا ئەكرد، بەڕادەیەكی وا عومەر ئەیگوت "اللهم أكفینی بلالا" دەی خۆی بیلال لەسەر قەمچی خواردنو گوێڕایەڵیی كردنی ئاغا ڕاهاتبوو، ئەی چۆن گۆڕاو بوو بە پیاوێكی وا بەرامبەر عومەر لەسەر هەق بوەستێ؟

ـ ئوسامەی كوڕی زەید، باوكی بەندە بوو، چۆن وەها گۆڕا كە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ببێت بە سەركردەی سوپایەك كە ئەبوبەكرو عومەر لەو سوپایەدا سەرباز بنو گوێڕایەڵیشی بكەن؟[1]

ـ نەتەوەی عەرەب، چەند هۆزێكی پەرتەوازەی بێ هێزی دوور لە زانستو زانیارییو هونەر، بە گژ یەكتردا چوو، بت پەرستی خاوەن خووی پیسی نەفامی، خۆ هەموویان تەمەنیان لە پێنج ساڵییدا نەبوو، ئەی چۆن بوون بە نەتەوەیەكی یەككگرتووی بەهێزی خاوەن فامو زانستو خوڕەوشتی جوان؟ ئەی نەگۆران بەرەو یەكتاپەرستی؟ دەی ئەمە لە كوێو بیرۆدزەكەی فرۆید لە كوێ ئاواز خان؟

ئاواز: ئەوە هەمووی ڕاستەو مێژو گەواهی لەسەر ئەدات، بەلاَم لە مێژووی نوێشدا وەها ئەبێت؟

دڵپاك: ئەی بۆچ نابێت؟ ئایا بە هەزاران پیاو ئافرەتی خوانەناسو خراپ، دژ بە ئیسلام، موسڵمان نەبوونو نابن؟ هەر بۆ نموونە، ڕۆجیە گارودی فەرەنسی، جلال الدینی فارسیی، لیوپۆڵد ڤایسی نەمساوی، تەنانەت ناوەكانیشیان ئەگۆڕن، جیر ڕوبن، كە گەنجێكی ئەمریكی بوو سەرۆكایەتی ئەو خۆپیشاندانانەی ئەكرد كە داوای بەرەڵلایی پەڕینیان ئەكرد، كەچی بوو بە ئامۆژگاریكارێكو داوای لە گەنجان ئەكرد كە وورد بین بنو زەبتی دەروونیان بكەنو زاڵ بن بەسەر هەوەسیاندا[2].

با دوری بۆ نەڕۆین لەمە زیاتر، تۆو هاوچەشنانی تۆن ئەم جۆرە ڕەفتارو گوفتارانە، لە دوای شەش ساڵیی یان لە پێش شەش ساڵیدا لە مێشكو بیروڕاتا ناڕوێنران؟ ئایا هیچ كامتان ئەم پەروەردەیەتان لە پێش تەمەنی پێنج ساڵیدا دەستكەوت؟ دەی ڕاستەو ڕوو بەو بێ پێچو پەنا وەلاَمم بدەرەوە؟

ئاواز: والله لە دوانزەو چواردە ساڵیی بەرو ژوور دەستمان كەوتووە. جا مناڵ لە پێش ئەو تەمەنی پێنج ساڵییەدا چی ئەزانێ؟ چی فێر ئەبێ؟

سكاڵا: سەد هەزار سوپاس بۆ خوا، ڕۆژ بەڕۆژ هەست بە سووكیی باری سەرشانم، دامەزراویی دڵو بیرم، ڕۆشن بوونەوەی دەروونم ئەكەم، هەست بە شەماڵی كامەرانیو بەختیاری ئەكەم، هەست بە نزیكبوونەوەی لە بەختیاریی

---

[1] تەماشای كتاب الله یا ولدی مەحمود غریب بكە.

[2] كتاب الله یاولدی : محمود غریب.

ئافرەت ئەکەم، ئۆخخەی .. ئۆخخەیی!

ئاواز: بەڵام گۆڕان کارێکی سووکو سادە نییە مامۆستا دڵپاك؟

دڵپاك: لەوەدا لەگەڵتام، ڕاست ئەکەی، بەڵام ئادەمیزاد ئەتوانێ وورده وورده هەنگاو هەڵگرێو بەرەو گۆڕان بڕوات، غەزالی پێشەوا ئەفەرموێ: ئەو کەسەی کە حەز لە کارچاکی ئەکات، بەڵام نەبووە بە خووی، ئەبێ لەسەرتاوە خۆی ماندوو بکات پێوەی، ماوەیەك زۆرانبازی بکات لەگەڵ خودیو نەفسی خۆیا تا ڕابێت لەسەری، بەوە دەقی پێوە ئەگرێو دواییش بەو دەستکەوتە خۆشیی ئەچێژێ، ئەوەی کە لووت بەرزە، ئەبێ زۆر بکات لە خۆی، ڕووخۆشییەکی دەستکرد بۆ ماوەیەك بنوێنێ، بەوە نەفسی خۆی ئەدا بەزەویدا، دواییش خووی پێوە ئەگرێ، زانیاریی بە فێربوون دەست ئەکەوێ، خووڕەوشتیش بە خوو پێوەرگرتن دەست ئەکەوێ"[1].

کار بێ ماندووبوون چۆن ئەنجام ئەدرێ؟

دار خزمەتت کرد، بەری چاك ئەگرێ

## بەشوودانی کچی بچوك

سکالا: خوشکە دڵپاك، بە ڕاستیی مەسەلەی هەڵبژاردنی هاوسەر، بەو جۆرەی کە باستکرد بۆ مان ئێجگار جوانو پڕ لە دادگەرییە، بەڵام ئەبینم یان ئەبیستم کە هەندێ کەس هەر بەبچوکی کچ ئەدەن بە شوو، بەبێ ئەوەی پرسی پێ بکەن، خۆ ئەگەر پرسیشی پێبکەن، ئەو نەفامەو چاکەو خراپە لەیەك جیاناکاتەوە، چونکە نافامێ، ئەوە چۆنە؟ ئایا ستەم لەو کچە ناکرێت بەو جۆرە؟

ئاواز: منیش ئەوەم بیستووەو هەیشە، قابیلە بشاردرێتەوە، پێغەمبەر هەر بە بچوکیی عائیشەی کچی ئەبوبەکری مارە نەکردو نەیگواستەوە؟ چۆن ئافرەت لەو مەسەلەیەدا، ئەتوانین بڵێین ستەمی لێناکرێت؟

دڵپاك: لەسەرخۆبە خوشکە گیان، پێویست بە هەڵچونو سووربوونەوە ناکات، ئایا تۆ بواری منت دا تا بزانی ئەیشارمەوە یان نا؟ بەڵێ ڕاستە پێغەمبەر ﷺ وایکردو ئەوەش لە هەموو ئەو پەڕاوانەدا کە باسی ژیانی ئەکەن تۆمارکراوە، ئیتر شاردنەوەی چی؟

باسی بەشوودانی کچی بچووك کە لە لایەن باوك یان باوکی باوکەوە ئەبێو پێی ئەڵێن (باوا)، باسێکی دوورو درێژو پڕ لەووردەکارییەو زانا موسڵمانەکان لێی دواونو شییان کردۆتەوە، بەواتایەکی تر مەسەلەیەکی فیقهی قوڵەو ئەبێ پسپۆڕێك لێی بدوێ، بەڵام لەبەر ناعیلاجی بەکورتەیەك باسی ئەکەم بۆتان، هەرچەندە حەزناکەم لەباسو ڕازی فیقهیدا بۆی دابچم، هیوادارم ڕێتان بکەوێتە لای موسڵمانێکی زاناو داوای لێبکەن کە بە جوانیی بۆتان ڕۆشن بکاتەوە.

ئەو کەسەی کە بۆی هەیە کچ بەبچووکی بدات بە شوو، پێی ئەگوترێ (ولی مجبر) بەزۆری ئەو مافە هی باوك یان باوایە، لەوەش زیاتر ئەو کارە بۆ حاڵەتی ناچارییەو تایبەتییە نەك گشتیی، وە هەموو مەزهەبە ئیسلامییەکان بڕیاری لەسەر نادەنو تەنیا مەزهەبی حەنەفی کاری پێ ئەکات، دڵنیام لەوەی کە ئەمەیان پێ نەگووتون.

سکالا: نا واللە ئەوەیان پێنەگوتوین، های!! چۆن شتی وامان پێ ئەڵێن؟

دڵپاك: ئەو مافە، واتە مافی بەشوودان، تەنها بۆ کچی بچووك نییە، بەڵکو بۆ کچی گەورەو بێوەژنو تەنانەت بۆکوڕو پیاویش کە ژنیان بۆ بهێنن هەیە. بۆ زیاتر ڕۆشن کردنەوە، بۆ ئەو کەسانەیشە کە شیاویی خۆیانیان لەدەستداوەو پێیان ئەگوترێت (فاقد الأهلیة) . وەك شێتو گێلو گەمژە (المعتوه). جا ئەم مافە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئەو جۆرە کەسانە ئەخرێتە کارەوە نەك دژ بە بەرژەوەندییان. خۆ ئەگەر هاتوو بە پێچەوانەی مەبەستە ڕەواکەوە خراپە کار، ئەوا ئەو مافە نامێنێو ئەو کارە هەڵ ئەوەشێتەوە.

[1] کتاب الله یاولدی : محمود غریب.

جا با بێینەوە سەر باسی بەشودانی کچی بچووك، گوتمان بەزۆریی بۆ حاڵاتی پێویستو ناچاریی پەنای بۆ ئەبرێو تەنیا مەزهەبی حەنەفی (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەری ئەڕوات، لەگەڵ ئەوەشدا، کچەکە کە گەورە بوو بۆی دەرکەوت کە مێردەکەی بە کەڵکی نایەتو شووکردنەکەی بە زیانی ئەو دەرچوو، مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەو مارە کردنەی هەیەو ئەتوانێ بچێتە دادگای ئیسلامییو مافی ڕەوای خۆی بەدەس بهێنێتەوە[1].

سکاڵا: دەی بەخوا بەمجۆرە هەر زۆر جوانو چاکە، ئیتر ستەمی چی؟

دڵپاك: ئەوەندەم مۆڵەت بدەنێ تا سەرێ لە چێشتەکە بدەم نەکو بسوتێتو دواییش بۆڵەو دگمەم بەسەرا بکەن.

* * *

سکاڵا: دەی فەرموو دانیشەرەوە، باسەکەمان بۆ تەواو بکە.

دڵپاك: باسەکەم بە کورتی بۆ کردن، با ئەوەشتان پێ بڵێم کە هەموو باوکێ یاخۆ هەموو باوایەك ئەو مافەی پێ ڕەوا نییە، کاتێ ئەو مافەی پێ ڕەوایە کە ئەم مەرجانەی تێدا هەبێت:

1. ئەبێ ئەو باوکە یا باوایە موسڵمان بێت، خۆ ئەگەر موسڵمان نەبوو ئەوا ئەو مافەی پێنادرێتو ناتوانێ بەکاری بهێنێ.

2. ئەبێ سەربەست بێت، واتە بەندەو کۆیلە نەبێت، چونکە کەسی کە کاری خۆی لەدەستی خۆیا نەبێت، کاری کەسێکی تری ناخرێتە ژێر دەست.

3. ئەبێ ژیر (عاقل) بێت.

4. گوناهبارێکی وەها نەبێت کە جێ پەنجەی گوناهی دیار بێتو کەڵکی ئەوەی پێوە نەمابێ کەپشتی پێ ببەسترێت.

5. دوژمنایەتیو ناکۆکیی لە نێوان ئەو باوکە یان باوایە لەگەڵ کچەکەدا نەبێت کە بیەوێ سزای بەوە بداتو ئەتکی بکات.

6. دوژمنایەتییو ناکۆکیی لە نێوان ئەو کچەو ئەو کەسەی کە ئەیەوێ بۆی مارە بکرێت نەبێت.

7. ئەو کەسە ئەبێ هاوشانی کچەکە بێت لە تەمەنا، لە چینا، لە گەلێ ڕووی ترەوە، هەتا دوایی هەست بەمەغدوریی نەکات، تەنانەت نابی کوێرو موێرو شتی وەها بێ.

8. ئەبێ ئەو کەسەی کچەکەی بۆ مارە ئەکرێت لە ڕوویی داراییەوە توانای مارەیی دانو ماڵداریی هەبێت[2].

دەی فەرموو پێم بڵێن، بزانم ئەو بەشوودانە چ ستەمێکی تیایە بەرامبەر ئافرەت؟ توخوا ئافرەتێکی زۆر خوێندەواری خاوەن بڕوانامەی بەرز، ئەتوانێ هاوسەرێکی وەها بۆ خۆی بدۆزێتەوە؟ هیچ بەرنامەو ڕێبازێکی داتاشراو ئا بەم جۆرە توانیویەتی بەرژەوەندی ئافرەت بپارێزێ؟

سکاڵا: نەك هەر ئافرەت، بەڵکو تیرەکەیشی، گەڕەکەکەیشی، هەرگیز ناتوانن ئەوەندە بە ووردیی بیر لە هاوسەر بکەنەوە، جا ئەگەر ئەوە ستەم کردن بێت لە ئافرەت، ئەبێ کامەو چی دادگەری بێت؟

ئاواز: دیارە، ئەوە هیچ جۆرە ستەمکردنێکی بەرامبەر ئافرەت تێدا نییە، منیش ئەزانم ئەگەر وەها بکرێ قازانجی ئافرەتە نەك پیاو، بەڵام ئایا خەڵکی ئەو مەرجانە ڕەچاو ئەکەن؟ پیاوی واهەیە هەر ئەوەندە داواکەری کچەکەی دەوڵەمەند بێ، ئیتر دەست ئەگرێت بە سنگییەوە بۆی.

دڵپاك: ئاوازخان، ئێمە نەباسی خەڵك ئەکەینو نەباسی ئەو جۆرە پیاوانە، بەڵکو باسی ئیسلام ئەکەین.. ئیسلام. بۆچ هەرکەس هەرچی بکات، ئەبێ ئێمە کارەکەی بدەینە پاڵ ئیسلام؟ ئەوەتا هەموومان ئەزانین یاخۆ ئەبینین، ئافرەت بە ڕووتو قوتیی لە مەلهەکاندا سەمای پێ ئەکەن، سوڕی پێ ئەدەن، بازرگانی پێوە ئەکەن، لەگەلێ وڵاتدا دەوری ئاودەس

---

[1] تەماشای فقه السنة، ج2، ل125ـ 130والفقه على المذاهب الأربع، بکە .

[2] فقه السنة، أعانة الطالبين ج3 ل308، التحفه ، المجلد السابع ل244.

ئەبینێ، هەرکەس تەنگاو بی خۆی خاڵی ئەکاتەوە تیایا، ئەویش بکەین بە تاوانی ئیسلام؟ ئەی بەرنامەی ئیسلام ناجەنگێ بەرامبەر بەو کارە پیسە؟ بەستەمو تاوانی زۆر گەورەی تەماشا ناکات؟

ئاواز: نا واللە ئەوە کاری ئیسلام نییەو پێچەوانەی ئیسلامە. نازانم.. نازانم بڵێم چی!

سکاڵا: دەی بزانە..بزانە، بۆچ بڵێی چی؟ بیر بکەرەوەو ددان بنێ بە ڕاستیدا، ڕاستیی خۆشە ئاواز گیان.

## خۆزگە ئەوانیش بە بچوکی بیاندانایە بەشوو

دڵپاك: ئاوازخان، ئەوەتا باسی بەشوودانی عائیشەیان لە لایەن باوكییەوە بۆ کردوویت، بەکێیدا؟ لە کێی مارە کرد؟ جا توخوا باوك هەبووە یان ئەبێت کە وەك ئەبووبەکر خاوەن بەزەیی و بەسۆز بێ لەگەڵ منالی خۆیدا؟ لەگەڵ هەموو موسڵمانێکی تردا؟ لە پێش ئەوەدا کە مێژوو تاریفی ئەبوبەکر بدات، خواو پێغەمبەر تاریفیان داوە:".. ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا.." (توبة40). جا کەسێ کەخواو پێغەمبەر گەواهیدەری بن، هەرگیز ژیری پەسەندیی ئەکات کە ستەم لە جگەرگۆشەی خۆی بکات.

چاوەکەم، ئەبوبەکر عائیشەی لە مامۆستاو پەروەردیارو کەسێ مارەکرد کە سەرزەویی ئادەمیزادی وەهای بەسەر پشتییەوە نەدیبووەو نابینێ. کەسێ کە خوا.. خوا گەواهیی بۆ بەرزیی ڕەوشتی ئەدات "وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ". (القلم: 4). کەسێ کە هەر لە سەرەتاوە خۆی فەرمووی "انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق" کەسێ کە لە دوای مەرگی پرسیاریان لە عائیشەی خێزانی کرد، ڕەوشتی پێغەمبەر چۆن بوو؟ وەڵامی دایەوەو فەرموویی: "كان خلقة القران". دەی ژیری ئەیگرێ کە ئادەمیزادی وەها ئافرەت لە سایەیا تووشی ستەم ببێ؟

پەروەردەکراوانی قوتابخانەی زایۆنیزم باسی بەشودانی خاتو عائیشە بەهەڵگەڕاوەیی بۆ بەچکە سادە موسڵمانەکان ئەکەن وەك بەشێوازو ڕێگەیەکی ڕەوا لەچاکترین ئادەمیزادی سەر ڕوی زەوی مارەکراوە، کەچی ئەو هەموو تاوانو ستەمکارییەی کە ئەمڕۆ خوانەناسان لەهەموو لایەکدا دەیکەن سەبارەت بە ئافرەت، ئەیشارنەوە لێیان و ناهێڵن بەر گوێیان بکەوێ! ئای لە سادەیی و بێ ئاگاییمان! سەد خۆزگە ئەمڕۆ سەربەستەکانی خۆرئاواو خۆرهەڵات کچەکانیان هەر بەبچوکیی و کاڵو کرچی مارە ئەکرد لە هاوسەرێك نەك خۆیان خۆیان ئەتکی جگەرگۆشەکانی خۆیانیان بکردایە.

سکاڵا: خۆیان ئەتکی جگەرگۆشەکانی خۆیان ئەکەن؟ چۆن؟

دڵپاك: بەڵێ، لە ڕاستیدا ئادەمیزاد کە باسی ئەو کارەساتانە ئەکات ئارەقی شەرمەزاریی لەناوچاوانی ئەتکێ، ویژدانی ئادەمیزادی خاوەن شەرەف خۆی گرژ ئەکاتەوە، ئاوات بۆ مەرگی ئەخوازێ.

باوك.. باوك، لە کچی ساوای خۆی بپەڕێت! گۆڤاری (هیکسا جون)ی پزیشکی باسی ئەوە ئەکات کە دەست درێژیکردنی جنسی لە لایەن باوکانەوە بۆ سەر کچە مناڵەکانیان زۆر لەوە زیاترە کە ئەگاتە دەستی ئێمە. هەروەك ژاراویی کردنی منالان بەژار پێدان یان هەندێ داو دەرمانی مەترسیدار لە لایەن دایکانو باوکانەوە تەشەنەی کردوە!

لە وولاتی سوییددا، کە بە چڵەپۆپەی شارستانیەت ئەژمێردرێت وە کە پلەی ژیان لەبەرزیدایە تیایدا، خەریکی دانانی یاسایەکن کە ڕێگە بدات بە خوشكو برا بۆ ئەوەی لەپەڕیندا لەگەڵ یەکتردا (سەربەست)!! بن. بەڵێ، ڕێیان بە داوێن پیسیدا، ڕێگەی نێربازییان دا، ئەمجار ڕێگەی لەباربرندنیان دا، ئەمجار کەوتنە پروپاگەندە کردن بۆ ئەوەی ڕێز بگیرێت لە کچە دایکەکان (الأمهات العذاري)!! بەوە هەموو تێریان نەخوارد، ئاگرو ئالۆشی ناو گەڵیان دانەمرکایەوە. دواجار کەوتنە داواکردنی مافی داوێن پیسیی کردن لەگەڵ خوشکدا، بەم زووانەش یاسایەك دەرئەچێت کە ڕێگەی پەڕیین لە کچ و دایك بدات!![1]

[1] عمل المرأه في الميزان : د. محمد على البارى ، ل139 ـ 141.

بەهۆی ئەوەشەوە بەرزترین تێکڕایی (معدل)ی خۆکوشتنەوە لە سویدا بەرچاو ئەکەوێ، بەرزترین تێکڕایی و ڕێژەیی تەلاقدانیش هەر لەوێدایە. ئەی ئەم جۆرە باسانەتان بۆچ بۆ ناکەن؟ بڤەن؟!

ڕۆژنامەی (هیرالد تریبیون) لە ژمارەی ڕۆژی 1979/6/29دا، کورتەیەکی ئەو توێژینەوانەی کە کۆمەڵی پسپۆڕ لە دادوەران و پزیشکانی ئەمریکا پێی هەڵسان، بڵاوکردەوە، ئەو توێژینەوانە سەبارەت بەبڵاوبوونەوەی دیاردەی هێنان (نیکاح)ی ئەو کەسانەیە کە لە یەکتر حەرامن (المحرمات). وەکو بەناو کۆمەڵگەی ئەمریکادا بە تایبەتیی و لە خۆرئاوادا بەگشتیی بڵاوبۆتەوە، توێژەرەوەکان ئەڵێن: ئەو دیاردەیە لەوەدا نەماوە کە بەدگمەن ڕووبدات، بەڵکو وەها تەشەنەی کردووە کە خەریکە ئادەمیزاد باوەڕ نەکات بە بیستنی. لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە (85٪)ی ئەو خێزانانەی دەستیان داوەتە ئەو کارەو کاری شروزیی ئەکەن لەگەڵ کچ و کوڕەکانیاندا یا کە خوشک و برا پێی هەڵ ئەسن، یاخۆ کوڕو دایک ئەیکەن، لە خێزانە (بەرز)! و (بەرێزەکان)ن!! ئەو خێزانانەی کە لە کارەکانیاندا سەرکەوتوون و دووچاری هیچ نەخۆشیی دەروونی نەبوون و بە تاوانبار نەژمێرراون پێش ئەو کارە، بەڵکو بە زۆریی پیاوانی کار (رجال الأعمال)و خاوەن پیشە سەرکەوتووەکان بوون چ لە بواری کاردا چ لە بوارەکانی تری ژیاندا. ئەمەش نەک بڵێین ئەو جۆرە کارانە لە بەرەڵڵاو بێکارە و بەدڕەوشتەکان ئەوەشتێتەوە.

سکاڵا: واتە لە سەدا دە (10٪)ی کۆمەڵگەی ئەمریکا ئەگرێتەوە!

دڵپاک: بەڵێ، لەوەش زیاتر ڕاپۆرتە کە دەڵێت: لە بیست ڕووداوی لەو جۆرە ڕووداوانە، دانەیەکیان ئەگاتە دەستی دەزگاکانی دادوەری و پزیشکەوانیی، زۆربەشیان لەو جۆرانەن کە باوک دەستدرێژی پەرینیی کردۆتە سەر کچەکەی خۆی، چەندەها کارەسات تۆمارکراوە کە کچی تەمەن سێ ساڵ تا کچی باڵغ بووی تێدایە!! وە کە بە هۆی ئەوەشەوە نەخۆشیی هەمەچەشنەی پیس و قورسی کۆئەندامی زاوزێ و نەخۆشیی ئاڵۆزی دەروونی سواری شانی ئەو کچانە دەبن.

ئاواز: ئەها، تەماشای سکاڵا بکە، چاوی پڕ بووە لە فرمێسک.

دڵپاک: چەندەها حاڵەتی سک پڕ بوون لە ڕاپۆرتەکەدا تۆمار کراوە، پاش ئەوەی کە دەرکەوتوە ئەو سک پڕ بوونە لە ڕێگەی باوکی کچەکەوە بووە، وە دەریش کەوتووە ئەو پەیوەندییەی نێوان باوک و کچەکەی، مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێك لەمەوبەر، بەڵام پەیوەندی نێوان خوشک و برا، هەرچەندە بە ناوێزەو زۆڵەك ناوی ئەبەن، کەچی بە زیانمەندی دانانێن و ئەڵێن نابی باوک و دایك زۆر گوێ بدەن بەو پەیوەندییە، بەڵکو واچاکە بیدەنە دەست ڕۆژگار، ڕۆژگار چارەسەری ئەکات، وا چاکە نەگەڕێن بە دوای چارەسەرو مارەسەردا بۆی.[1]

سکاڵا: ئوووی! سەرم... سەرم ژان ئەکات، مێشکم، تەقی، ئای.. ئای، لەرزمە، ئاواز، لێفیەك و بەتانییەکم بدە بە سەردا، ئای! سەرم.

ئاواز: بەڵێ، من باسی سەربەستیی جنسیم بیستوە، بەڵام هەرگیز بەبیرما نەهاتووە کە بەم جۆرە بۆی داچووبن!

دڵپاک: بەڵێ، خوشکەکەم، ئەم باسە سامناکانەمان لێ ئەشارنەوە، کەچی دێن باسی بەشوودانی کچی بچووکمان لەبەر چاو ئەکەنە تاکە گیروگرفتی ئەم جیهانە.

[1] عمل المرأه فی المیزان . د. محمد علی الباری.

# ئەگەر قەلەرەش ڕێنیشاندەر بێ

دڵپاك: سوپاس بۆ خوا ئێستا چاكیت، سەرئێشەت چۆنە؟

سكالاّ: باشترێكە، خوا پاداستت بداتەوە، باسەكەم پێ بچڕاندیت، داوای لێ بوردن ئەكەم، حەزئەكەم دەستی پێ بكەیتەوە.

دڵپاك: بەلاّم ئەگەر پێی تێك بچیت، من حەز ناكەم لە سەری بڕۆم.

سكالاّ: دەی من ئێستا حەزی لێ ئەكەم، ئەمەوێ زۆر چاك ئەو خۆرئاوایەی كە وایان لێكردبوو بە ڕووگەی خۆم ئەزانی، بناسم، فەرموو باسەكەم بۆ تەواو بكە.

ئاواز: دەی مادام خۆی داوا ئەكات فەرموو بەردەوام بە.

دڵپاك: بەڵێ، پەڕینو سواربوون، لە نێوان كەسانی خێزانێكدا یا لە نێوان ئەو كەسانەدا كە ناشێن بۆ یەكتر، لە خۆرئاوادا بلاّوبۆتەوە. هەندێ لە توێژەوەرەكانیان كە ویژدانیان هێشتا بە تەواوی نەگەیوە، هەست بە مەترسی ئەو كارە بۆگەنە ئەكەنو هاواریان لێ بەرز بووەتەوە، بەچەند شێوەیەك هەوڵی بەربەستكردنیان داوە، بەلاّم ئەوەش تەنها بەپێشنیارو خستنەڕوو. لەو پێشنیارانەیان: منالاّن لەگەڵ دایكو باوكیاندا لەسەر یەك نوێن نەخەوێنرێن. كوڕانو كچان لەیەك دوربخرێنەوە، ئەبێ دایكو باوك لەبەرچاوی منالەكانیان لەیەكتر نەپەڕن، دیمەنو وێنەی پەڕین نیشاندەر لە منالەكانیان دوور بخەنەوە، فلیمو گۆڤارو چیرۆكی جنسییان لێوە دوور بخەنەوە.

سكالاّ: دەی خۆ ئەو ولاّتانە پێشكەوتوون ئەی ناتوانن چارەسەرێك بۆ ئەو گیرگرفتە پیسە بدۆزنەوە؟ بەتایبەتی توێژەرەوەكانیان؟

دڵپاك: چاوەكەم، ئەوانە لە ڕووی تەكنەلۆژیاوە لەبواری مادەدا نەك لە بواری مرۆڤایەتیدا پێشكەوتوون. ئەبێ ئەوەش بزانیت كە پێشكەوتنو شارستانییەتی ڕاستەقینە ئەوەیە كە مرۆڤایەتیی لە هەموو شتێكی تر تیایانا خۆشەویست ترو پیرۆزتر بێت، دەی ئەوان پێچەوانەی ئەم حەقیقەتەن، لەماددەدا پێشكەوتوون بەلاّم لە ڕووی گیانو لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە بەرەو دوا گەڕاونەتەوە.

لە ڕاستیدا ئەو توێژەرانەش كە كەمێ هەست بە مەترسیی ئەو كارە بۆگەنە ئەكەن سەرگەردانن، چەواشە بوون، نازانن چیبكەنو چۆن بجوڵێنەوە! لەچییەوە دەست پێبكەن! گەیاندنی كارەساتەكان بۆ داداگاو بەردەمی دادوەر، یانی بەندكردنی باوكەكەو شێواندنی خێزانەكە، ئەویش ئەگەر داداگا ئاوڕ بداتەوەو بپرسێتەوە، لەبەرئەوە توێژەرەكان هەر ئەوەندەیان لێدێت كە منالە ئەتك كراوەكە دووربخرێتەوەو ببرێت بۆ خەستەخانەی دەروون چاك كردنەوە، خۆ ئەگەر كیژێكی پێگەیشتوو بوو، شوێن گۆڕكێی پێ بكرێتو لە ماڵ بكرێتە دەرەوەو بنرێت بۆ كارگە تا لەوێ دەست بكات بە كاركردن.

سكالاّ: دەی ئەمەیان خراپترە، ئەوە كەی بەچارەسەر دائەنرێت؟

دڵپاك: ڕاست ئەكەیت، پێشینانیش گوتوویانە"عوزر لە قەباحەت خراپترە" ئەوەی كە شایانی باسە ئەو دەستدرێژیكردنە وانەبێ تەنها لەلایەن باوكەوە ڕوویداتو بەس، بەڵكو لە نێوان دایكو كوڕدا، باپیرو مامو خاڵدا لەگەڵ كوڕو كچەزایا، یا برازایا ڕووئەدات، جا توێژەرەوەكان بە شڵەژاوییەوە، دەستەوسان تەماشا ئەكەنو پەی نابەن بە چارەسەرێكی ڕاستەقینەو شەپۆلەكەش هەمیشە لە فراوان بووندایە!!

لەلایەكی ترەوە، دەستی جوولەكەو شاگردە هەمە جۆرەكانیان هیچ كاتێ لەبرەو پێدانی ئەو دیاردە قیزەونەدا ناوەستێ، هەمیشە نەوتو بەنزین ئەڕێژن بەسەرئاگرەكەدا هەتا كڵپەو بڵێسەی بەرزتر بێتو كوژاندنەوەی بۆ نەبێت، ئەمەش كوچەڵەو بنێشتی ئەو توێژەرانە ئەشكێنێو ئەشواتەوە كە ئەیانەوێ ئاگرەكە بكوژێننەوە؟

سكالاّ: چۆن؟ بۆ چ هەیە پشتگیری ئەو گەنییوو پیسانە بكات؟

دڵپاك: ئەی بێ بەڵا بێ! ئەوە تۆ ئەڵێیت چی؟! کام هۆی ڕاگەیاندن کە زۆر چاك و بەناوبانگ بێ، ئیستغلالی ئەکەن و دای ئەبڕن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بیروباوەڕە پیسەیان، بەڕسمی بڵاوی ئەکەنەوە. هەر بۆ نموونە: لەم دواییەدا "تایم"ی ئەمریکی لە ژمارەی خۆیدا کە لە ڕۆژی 14ی ئیبریلی/ 1980دەرچوو، لە ژێر ناونیشانی (هێرشکردنە سەر دوا تابۆ) وە لە ژێر دێڕێکی تری فەرعییدا (توێژەرەکان لە کاردان بۆ ڕێگەدان بە هێنانی بۆ نەشیاو. نکاح المحرمات) ئەم دەقەی بڵاوکردەوە: "زانایانی پەڕیین پێیان خۆشە کە ماوەیەك نا ماوەیەك جەماوەر بە هەواڵێك سەرگەرم بکەن، بەڵام وا دیارە بە زەحمەت سەرگەرم ئەبن، چونکە جەماوەر لە خۆرئاوادا وا ڕاهاتووە کە پەیوەندیی پەڕیین، تەنانەت پەیوەندی ناوێزەش، بەساردو سڕیەوە تەماشا بکات، بەڵام توێژەرەکان ئێستا هەوڵی ئەوە ئەدەن و تەنانەت هەندێ لە کۆنەکانیشیان (الأکادیمیون) کە دوا بت لە بواری پەڕییندا، وە کە هێنانی بۆ نەشیاو (نکاح المحرمات)ە لە دایك و کچ و خوشك، ئەو بتەش بشکێنن.

توێژەر (جون مونی) لە دانیشگای جون هوبکنز کە یەکێکە لە بەناوبانگترین توێژەرانی نەتەوەی ئەمریکی ئەڵێت" تاقیکاریی پەڕین بۆ مناڵ کە دەستی بخرێت لە لایەن یەکێ لە خزم و خۆیشی گەورەی خۆیەوە یان لە لایەن کەسێکی ترەوە کە پێگەیشتوو بێت، هیچ زیان و مەترسییەکی پێوە نییە بۆ سەر ژیانی ئەو مناڵە".

توێژەری (گەورە) !! خانمی هاوڕێی (جیرترود ولیامز)، لە پەڕاوەکەیاندا (الأفعال الجنسیة الضارة وإهمال الأطفال)، سکاڵایانە بەدەس ئەوەوە کە جەماوەر هێشتا پەیوەندی پەڕیین لەگەڵ مناڵدا، هەرچەندە چاکیش بێت هەر بە پەیوەندییەکی زیانمەند ئەژمێردرێت و ئەو مندالە تێك ئەشکێنێ..

لەسەر باسەکەیان ئەڕۆن و بەوپەڕی بێشەرمییەوە ئەڵێن: کۆمەڵگا وای دا ئەنێت گوایا هەر کەسێ پەیوەندیی پەڕیین لەگەڵ بۆنەشیاودا وەك دایك، خوشك، کچ، بەجێنهێنێ، ئەوە لە ئایین لای داوە لە ناو کۆمەڵگەیەکی ئایین دۆستدا. دیسانەوە ئەو ئاغاو خانمە ئەڵێن: لەکاتێکدا کۆمەڵگەی ئەمریکیی توانێ زاڵ بێت بەسەر ئاییندا و بەو چاوە تەماشای مرۆڤ نەکات کە لە ئایین لای دابێ، بەداخەوە، کەچی تا ئێستاش، کۆمەڵگە بەو پلەو لەو ئاستە پڕ لە لێبووردنەدا تەماشای هێنانی خوشك و دایك و کچ ناکات.

سکاڵا: ئەمە قسەی توێژەرەکانیانە؟ جا حەیف نییە ناوی توێژەریان لێبنرێ؟ ئەگەر قەلەڕەش ڕێنیشاندەر بێ ئەبێ هەموویان خاکیان بەسەربێ.

دڵپاك: دەی ئیتر وایە، گوێبگرە لەم کەڵەتوێژەرە یان (واردل بومری): "بێگومان کاتی ئەوە هاتووە کەددانی پیادا بنێین و بڕیار بدەین کە هێنانی بۆنەشیاو ناوێزەیی نییەو بەڵگەی ژیریی شێواویش نییە.. بەڵێ لە واقیعدا هێنانی بۆ نەشیاو، بە تایبەتی لە نێوان مناڵان و کەس و کاریاندا سودبەخشە بۆ هەردوو لایان". زانای ئەنسرۆلۆبۆلۆجیا ( سیمور بارکر) لە دانیشگای (یوتاوا) ئەڵێت:" ئەوەی کە جێگەی گومان بوو لە هێنانی بۆ نەشیاودا و ئەبوایە نرخەکەی بە هەست بە تاوانکردن بدرایە، یا هەست بە ووشکی و ساردی لە نێوان کەسانی خێزانێکدا بکردایە، بەهۆیەوە، کارێکی زۆر پێویستە و تەنانەت لەحەز لێکراوەکانە. لەبەرئەوە ئەبێت ئەو هەست بە تاوانکردنە پامال بکرێت و نەهێڵرێت لە کاتی هینانی دایك و خوشك و کچدا، چ کەڵکێك دەستگیر ئەبێت لە هەستکردندا بە تاوان لە کاتی مارە کردنیاندا؟ بۆچ هەست بەنەحەساوەیی بکرێت، لە کاتێکدا کە ئەبێ خۆشەویستی و گەرم و گوڕیی لە هێنانی ئەو کەسانە پرش بهاوێژێ؟

سکاڵا: ئای لەو حەیاو شەرەفە! ئەوە زانای بێ حەیاییە.. بێ حەیایی.

دڵپاك: ڕاپۆرتێکی سیکسیی وەکو بڵاوکراوەیەکی ڕەسمی ئەنجومەنی زانیاریی و دەستخستن و ڕۆشنبیرکردنی جنسییە لە ئەمریکا، بڵاوکرایەوە، تیایا هێرشێکی زۆر توندو تێرتیژ کرابووە سەر قەدەغەکردنی هێنانی بۆ نەشیاو داوای کردبوو کە ڕێگەی لەبەردەمدا بۆ ئاچوغ بکرێت و بەناوی دوا بت (الصنم الأخیر) ناوی بردبوو، کە ئەبێ ڕابماڵرێت!!

جیمس ڕامزی (دانا) !! گوتبووی: ئێمە ئەمڕۆ (بەرامبەر ئەو کارە) هەڵوێستمان هەمان هەڵوێستی کۆنەپەرستییە کە

سەد ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ دەس پڕ (العاده السریه) دا ئەمان نواند".

ئاواز: یانی هێشتا ئەو گلەیی هەیە! هێشتا ئەو هەمووەی بەدڵ نییە!

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، سروشتو ویژدان کە گەنینو کەوتنە بۆگەن کردن، بۆنیان بەر لووتی هەموو کەسێك کە لەو ناوەدا بژی ئەکەوێت، ئەوانە وازیان لە هاوسەریی حەلاڵ هێناوە، شەو ڕۆژ لە ئاو دەستخانەی داوێن پیسییدا ئەژین، کەچی تێر خواردنیان دەستگیر نەبوو و نابێ، دەستیان دایە نێربازیو ئەو جۆرە بەزمانە ئەویش تێری نەکردن، ئەوەتا ئەیانەوێ لە کەسو کار پەڕیینیش یاسامانیان بەرەسمیی لە تەنەکەی یاساکانیاندا تۆماری بکەن. جا چەند ساڵێکی تر نۆرە دێتە سەر سەگو پشیلەو مەڕو بزن و مانگاو.. هتد مارەکردن.

جیمس ڕامزی دیسان دەڵێت: بوونی پەیوەندی لاشەیی بەشێوەیەکی فراوان لە نێوان کەسانی خێزانێکدا، گەرمو گوڕی دێنێتە دیو ئاگری بڵێسەداری پەڕیین لە تەمەنی هەرزەکارییدا دائەمرکێنێتەوە".

زانای ئەنسرۆپۆلۆجیا کوهین ئاغای یەهودی دەم ئەکاتەوەو گەوهەر ئەبارێنێو ئەم مرواریيانە دائەڕێژێ:" قەدەغەکردنی هێنانی بۆ نەشیاو، لە شوێنەواری ئادەمیزادی سەرەتایی بەو لاوە هیچی تر نییە، ئەو ئادەمیزادەی کە پێویستی بە پەیمانو ڕێککەوتنی بازرگانیی دەرەوەی چوارچێوەی خێزان هەبووە. جا ئەو کاتە دەستیکرد بە قەدەغەکردنی هێنانی بۆ نەشیاو. دەی لەبەرئەوەی کە ئێستا ئەوانە هیچ گرنگییەکیان بۆ نەماوەتەوە ئەو قەدەغەکردنەش ئەبێ ڕۆژگار چاوپۆشیی لێبکات".

خانمێکی توێژەر بەناوی (جوان نیلسون) کە لە دەرون ناسییدا بڕوانامەی ماجستێری هەیە پەیمانگا (معهد)یەکی کردەوە بە نیازی دیراسەکردنی ڕەفتاری پەڕیینو بە تاقیکردنەوە ئەیەوێ پەیوەندی بە کەڵكو بێ کەڵکی هێنانی بۆ نەشیاو لەیەکتر جیابکاتەوە.

چەندان کۆمەڵ پێکهێنراون کە داوای مافی پەڕیین لەمناڵو بۆ مناڵ ئەکەن لەولاتە (پێشکەووتوەکاندا)!! هەتا ڕێی پێبدرێتو چالاکیی پەڕیینی بنوێنێ چ لەگەڵ کەسانی خێزانەکەیداو چ لەگەڵ کەسانی دەرەوەدا.

لاری قسطنطین مامۆستای یارمەتیدەر لە بەشی نەخۆشییە دەروونیەکان لە دانیشگای تفتس ئەڵێت:" مناڵان مافی ئەوەیان هەیە کە حەزی پەڕیینی خۆیان بهێننە دی لەگەڵ هەر کەسێکا کە حەز بکەن با ئەو کەسەش یەکێك بێ لە ئەندامانی خێزانەکەی".

سکالا: ئەترسم ئەگەر بڵێم ئەوانە ئاژەڵن، ستەم لە ئاژەڵ بکەم، من قەد نەمدیوە نێرەکەریك لە جاشولکەیەکی بچووکی بپەڕێت.

دڵپاك: زۆر ڕاستە گیانەکەم هەرکە ئادەمیزاد لە پەیامو بەرنامەی خوا دوورکەوتەوە لە هەموو دڕەندەیەك دڕەندەتر ئەبێت، خوا لە قورئانا ئەم ڕاستییەی بۆ دەرخستوینو بە (بَلْ هُمْ أَضَلُّ) ناوی بردوون.

سکالا: ئەو پەڕاوەی بەدەستەوەیە ناوی چییە؟

دڵپاك: ناوی (عمل المرأه فی المیزان)ە، پزیشکێك دایناوە کە خۆی لەوێ خوێندوویەتیو ئەیانناسێ، ناوی (محمد علی الباری)ە.

# بەشی حەوتەم

## فریان بەسەر ئیسلامەوە نییە

سکاڵا: لەخوا بەزیاد بێت، هەست بە کراوەیی بیرم دەکەم، هەست بەسەربەستی ڕاستەقینە دەکەم، لەبەرئەوە هەرچی بەبیرما دێت، ئەتوانم دەری ببڕمو بیخەمە بەر دەستت، تاشیتەڵی بکەیتەوە بۆم.

دڵپاك: بەوەت زۆر خۆشحاڵم، وا دیارە مەبەستێکت بەدەستەوەیە، فەرموو قسە بکە بپرسە.

سکاڵا: تۆ باسی هاوسەریت لە ئیسلامدا بۆ کردین، منو هەموو کەسێکی ویژدان زیندوو، قایل بەوەین کە ئەو هاوسەرییە جوانترین شێوەی پەیوەندییە کە بتوانێ ئافرەتو پیاو کۆبکاتەوە، کۆکردنەوەیەکی وەها کە مافی هەردوولایان پارێزراو بێت، بەختیاریی و کامەرانیی لە ژیاندا تام بکەن، هەریەکەیان چوارچێوەو سنووری ئەرك و مافی خۆی بزانێتو پەیڕەوی یان بکات.

بەڵام وەك ئەزانین هەڵبژاردنو هێنانی هاوسەر کارێکی سادەو ئاسان نییە، ڕێگەیەکی بێ کۆسپ نییەو هەروا بێ زەحمەت کێشان بگیرێتە بەر. دەیان تەنگو چەڵەمەو گیروگرفت دێتە ڕێی ئەو کارە، دەیان بەربەست دێنە بەردەم ئادەمیزادو دەبێ ئەبێ یەك بە یەك بیان بڕێت، ئەوسا هاوسەرێکی دەست دەکەوێت لەوانەیە بەهۆی ئەو بەربەستو گیروگرفتەوە بێت کە ئەبینین دیاردەی عازەبیی و زگورتیی ئەوەندە زۆرو فروانە چ لە ناو پیاواندا، چ لە ناو ئافرەتاندا.

دڵپاك: قسەکانت هەموویان ڕاستن، دەمخۆش، بەڵام تاوانی ئیسلام لەوەدا ئەبێ چی بێت؟ ئایا ئەو شتانەی کە باست کردن لەگەڵ گیانی ئیسلامدا ئەگونجێن یاخۆ زادەی سەرەتاکانی ئیسلامن؟ بێگومان نەو. لەوەش زیاتر پێچەوانەی یاساکانی ئیسلامو دژ بە بەرنامەو گیانی ئیسلامن. بە دارشتنێکی تر ئەو شتانە هەندێکن لە بیرو پلان و ستراتیژێتیی کوفر، هەندێکن لە پاچ و چەکوش و نوێڵی کوفر بۆ ڕوخاندنی قەڵای باوەڕ لە دڵی موسڵماناندا، بەشێکن لە داب‌ونەریتی کۆمەڵگەی کوفر. کەچی وای دەرئەخەن کە ئەو شتانە ئیسلامیین. چونکە لە ناو موسڵمانە تێنەگەیشتووەکانیشا بەرچاو ئەکەونو پەیڕەویش ئەکرێن. لە کاتێکا فریان بەسەر ئیسلامەوە نییە. ئێستاش بۆتان ڕۆشن ئەکەمەوە.

## بەرزیی یاخود گرانیی مارەیی

ئاواز: تۆ هەر وەك خۆت نابەڵەد بکەیت وەهایە. ئەی نابینی خەڵك لە کاتی بەشووداندا چی ئەکات؟ بمانەوێو نەمانەوێ لە ڕوانگەی تەماعکارییەوە خەڵکی کچو خوشکی ئەدات بەشوو، هەروەك بازرگانێك کە هەموو ئاواتێکی ئەوەیە بەرزترین قازانج لە کۆتاڵەکەی بەدەست بهێنێ. کەی گوێیان لە ڕەوشتو تەنانەت ئاییندارییو بەرژەوەندی زاوایە؟ ئەو باوکەی کە کچێکی جوان یان خاوەن وەزیفەی هەبێت، خوانەخواسە ئەگەر بێتو هەڵگری بڕوانامەی کەمێك بەرز بێت، ئیتر ئەو باوکە دەماری زل ئەبێت، تەماشای زەوی هەر ناکات، لووتی بەرەو ئاسمان ئەکاتەوەو لە خۆیی بایی ئەبێ. ئەوسا ئەگەر کەسێك بوێرێ ڕووبکاتە ماڵەکەی بۆ خوازبێنی کردنی کچەکەی، ئیتر ئەو هەر بێزی نایەت قسە بکات، خۆ ئەگەر بێزو دەماری هێنای قسە لەگەڵ خوازبێنی کەرەکەدا بکات، ئەوا بە کەشخەو فشەیەکی زۆرەوە داوای شیری چۆلەکەش ئەکاتە سەرباری باری مارەیی وەها ئەکات لەو داواکارە کە نەزانێ چی بڵێتو چی بکات.

داواکار ئەوسا یان وەها ئەسڵەمێتەوە کە تۆبە لە ژنهێنان بکات، یاخۆ بارکردنەکە پەسەند ئەکات، ئیتر ئەبێ واز لە

بیروڕاو قسەی خۆی بهێنێ، ئەبێ کەسایەتیی خۆی بخاتە ئەولاوە، تەنیا بەڵێکردن و بەجێهێنانی فەرمان و داواکانی ماڵی خەزووری بکات و بەجێ بهێنێ. ئیتر لەم لاو لەولا دەستی خەڵك بپرێت پەنابەرێتەبەر هۆو ڕێگەی ناڕەواو ناپاك تا بتوانێ ئەرك و کاری سەرشانی جێبەجێ بکات. وە کە هاوسەرەکەشی گەشتە ماڵەکەی لە جیاتی خۆشیی و بەختیاری بیر لە قەرزدانەوە بکات، بەکورتیی وای لێکراوە ڕێگە لە بەختیی خۆی نەبات، زاقتر بڵێین خەساندوویانە. دەی دڵپاك ئەم دیاردەیە لەناو موسڵمانانیشدا باوەو هەیە!

دڵپاك: قسەکانت زۆر ڕاستن هیچ کەسێك ناتوانێ ئینکاری ئەو ڕاستیە بکات ئەمجارە تا ڕادەیەك لە بەکارهێنانی ووشەی (موسڵمانان)دا بەویژدان بوویت و ئەو تاوانەت وەك جاران نەخستە پاڵ ئیسلام. لەبەرئەوە سوپاست ئەکەم، هیوادارم ووشەی ئیسلام و ووشەی موسڵمان لەمەودوا لەیەکتر جیا بکەیتەوەو تێکەڵ بە یەکتریان نەکەیت.

ئەو کەسانەی کە تۆ باست کردن ( لەباوکان و سەرپەرشتی کەران) بەو هەڵوێستە گەنیوە پیسانەیانەوە سەبارەت بە مەسەلەی هاوسەریی، واتە لە گرانیی و زۆری مارەیی سەندنا، ئەوانە ستەمکارو خۆپەرست و چەوسێنەرەوەی ئافرەتن، دوور لە گیانی پاکی ئیسلامن.

ئەوانە جۆرە خەڵکێکن کە هیچ جۆرە حسابێك بۆ ئەو واقیعەی کە تیایا ئەژین ناکەن، دەربەسی حەیاو ڕەوشت نین، بیر لە ئەنجامی کچەکانیان یان خوشکەکانیان ناکەنەوە، بیر لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەو ڕەوشت پاکی کۆمەڵایەتی ناکەنەوە، کۆمەڵگە بەرەو ڕەوشت بەرزی یان بەرەو تیاچوون بڕوات، نەتەوە بەرەو بەختیاریی یان بەدبەختی بڕوات، بەلایانەو گرنگ نییە، هەروەك خۆیان بەشێك نەبن لەو نەتەوەو کۆومەڵگەیەی کە تیایا ئەژین، ئەوانە چاوداری نابینان، ستەمکارن، تاوانبارن.

ئەوانە جۆرە خەڵکێکن زرق و برقی دونیاو ژیان تەماعی ساماان سەرگەردانی کردوون و هەڵی خەڵەتاندوون. دیارە ئادەمیزادی وەهاش کێ مارەیی زۆری پێبدات، کچەکەی یا خوشکەکەی بەو کەسە دەدات، هەروەك ئەو مارەییە مافی ئەو بیت نەك ئافرەتەکە! هەروەك ئەو ئافرەتە پیتاك و شتومەکێکی ناو هەڕاجخانە بێت و خرابێتە مەزادی ئاشکراوە!

جا ئەو جۆرە کەسانە منیش وەك تۆ ددانی پیادا ئەنێم کە موسڵمانانیشیان لە ناودا هەیە. بەڵام تاوانی ئیسلام لەوەدا چییە؟! ئایا ئەو کارە بەجێهێنانی فەرمانی خواو پێغەمبەرە ﷺ؟ نەء .. نەء. ئەوانە لە گیانی بێگەردی ئیسلام، لە شەریعەتە بێوێنەکەی، لە جەوهەری ئایین دوورن و دوور کەوتوونەتەوە، تەنیا بەناو موسڵمان، هەرئەوەیان ماوە ئالای چوونە دەرەوە لە ئیسلام بە ئاشکرا هەڵگرن.[1]

سکالا: واتە ئەو مارەییە زۆرەی کە ئێستا باوە ( پێنج سەد لیرە، یاخۆ شەش سەد مسقاڵ ئاڵتون و.. هتد) بەشێك نییە لە یاسای ئیسلام؟

دڵپاك: بەشێك لە یاسای ئیسلام؟!! سەیرە! ئیسلام چۆن شتی وا ئەکات بە بەشێك لە یاسای خۆی! ئیسلام چۆن شتی نابەجێ ئەگرێتە خۆی؟

ئیسلام ڕەحمەتێکەو خوا ناردوویەتی کە ببێتە مایەی خۆشیی و بەختیاریی ئادەمیزاد، تا لە سایەیا گوشادیی بنج ببەستێ، دەی زۆریی و بەرزیی مارەیی زیان بەئادەمیزاد دەبەخشێ؟ تەنگ پێهەڵچنین کەی لەگەڵ ئیسلام دەگونجێ؟ ئەها خوا ئەفەرموێ:"وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ".

[1] تەماشای "عقبات الزواج"ی عبدالله علوان بکە.

# مارەیی لە ئیسلامدا

دڵپاك: خوشکەکانم، شەریعەتی ئیسلام ( وەك گوتمان) حەز بە گوشادیی‌و ئاسانکاریی ئەکات لە کاروباری هاوسەریدا، ئاڵۆز کاریی‌و تەنگ پێهەڵچنین‌و بەهانە گرتن، لەگەڵ گیانی پاکیدا ناگونجێن. وەك ئەزانین هاوسەریی یانی بەجێهێنانی یاسایەکی خوایی یان تەولو کردنی نیوەی باوەڕ، دەی چۆن ئیسلام حەز بە ئاسانکاریی نەکات لەو کارە پیرۆزە ڕەوایەدا؟

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ"ان من خیر النساء أیسرهن صداقا"[1]. ووشەی (أیسر) بە واتای ئاسانترو (صداق)یش مارەییە. دیسانەوە ئەفەرموێ: "أعظم النساء برکة أیسرهن صداقا".[2] هەروەها پیرۆزیی‌و بەرەکەت‌و خێری ئافرەت لە ئاسانیی مەسەلەی مارەییەکەیدایە "یمن المرأه تسهل أمرها فی صداقها"[3]. دیسانەوە فەرموویەتی "لو أن رجلا أعطی أمرأة ملیء یدیة طعاما (واتە لە جیاتی مارەیی) کانت حلالا له"[4]. جا فەرموون ئەمەو ئەوەی کە ئێوە باسی ئەکەن ئاسمان‌و ڕێسمان نییە؟

ئاواز: ئایا ئەم یاسایانە جێبەجێ ئەکرێن؟ یانی خەڵك پەیڕەوییان ئەکات؟

دڵپاك: ئەم یاسایانە لەلایەن موسڵمانە ڕاسیتەقینەکانەو پەیڕەوی ئەکرێن، جا هەر کاتێ کۆمەڵگەیەکی پاکی موسڵمان دروست بوو، ئەو کاتە دیارە پەیڕەوی ئەکرێن. خەڵك ئێستا کە جێبەجێیان ناکات، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو خەڵکە ئیسلامی نەکردووە بە بەرنامەی ژیانی خۆی، بەڵکو دوای داب‌و نەریتی نەفامانەی ناو کۆمەڵگا کەوتووە، پەیڕەوی ئەو داب‌و نەریتە ئەکات، لەوەش بەدەر، ئێستاش هەزاران کەس لەم سەر زەوییەدا هەن‌و باوەڕ بە خوا پاڵیان پێوە ئەنێت کە زۆر باش پەیڕەوی ئەو فەرمانانەی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بەڵام قابیلە گۆڤارو ڕۆژنامەکان لەسەر ئەوانە بنوسن؟

موسڵمانی ڕاست چۆن ناچێت بە شوێن ڕابەرەکەیدا؟ کاتێ ئەم فەرموودەی خوا هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) (النور: 32) پێغەمبەری ڕابەرمان لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا خۆی پێشدەستی کردو فاتیمەی کچی کەسێکی خاوەن ئایین‌و ڕەوشت‌و بەجەرگی هەڵبژارد بۆی تا ببێتە هاوسەری، مارەییەکەیشی بایی چوار پەنجایی بوو، (وکان صداقها ما قیمة أربعة دراهم) ئەو کەسەش دەوڵەمەند نەبوو ئەیناسن، عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو.

لەسەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتتابدا مارەیی ڕووی لەبەرزبوونەوە نا، ئەوەش یەکسەر عومەری داچڵەکاندو ووریاتر بۆوە، بۆ ئەوەی شتەکە تەشەنە نەکات‌و ئەنجامی خراپی نەدات بەدەستەوە عومەری جێنشین وتارێکیداو تیایدا فەرمووی:"لاتغالوا فی صداق النساء، فانها لو کان مکرمة فی الدنیا أو تقوی عند الله کان أولاکم بها النبی ﷺ ما أصدق رسول الله ﷺ امرأة من أثنتي عشرة أوقیة". (رواه الامام أحمد وأصحاب السنن). ئەو دوانزە ئوقیەش زیوو بووە نەك زێڕ، بەحیسابی ئەمڕۆ ئەکاتە (340 غرام) دیارە ئەوەش زۆر نییە.

جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتێکم لە ئەنسارەکان مارە کردووە، فەرمووی: لەسەر چەند؟ گوتی لەسەر چوار ئوقیە. فەرمووی لەسەر چوار ئوقیە! ئێوە وەك لە پانتایی ئەو شاخە زیو هەڵبکەنن وایە، هیچمان نییە بتدەینێ، بەڵام بەڵکو بە نێرراویی بتنێرم‌و شتێکت پێ ببڕێت". (مسلم).

بوخاریی‌و موسلیم ئەگێڕنەوە "پیاوێك داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە ئافرەتێکی لێ مارە بکات، پێغەمبەر پرسیاری

[1] گێڕانەوەی ابن حبان.
[2] أحمد والبیهقی
[3] آلوسی لە تەفسیرەکەیا لە خاتوو عائیشەوە گێڕاویەتییەوە .
[4] تەماشای "الاسلام وقضایا المراة "ی الخولی بکە.

لێکرد، هیچت هەیە. گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: بڕۆرەوە بۆ لای کەسوکارت بەشکو شتێك پەیدا بکەیت، ڕۆیشتو گەڕایەوە وتی: نە بە خوا هیچم دەست نەکەوت. فەرمووی: هەوڵبدە ئەگەرچی ئەموستیلەیەکی ئاسنینیش بێت، ڕۆیشت، گەڕایەوە گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، ئەموستیلەیەکی ئاسنینش نەبوو، بەڵام ئەم کراسە (ازار)ەم نیوەی با بۆ ئەو بێت! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی لە کراسەکەت بکا؟ ئەگەر تۆ لەبەری بکەیت، ئەو هیچی بەر ناکەوێ، ئەگەر ئەو لەبەری بکا تۆش هیچت بەرناکەوێ.

پیاوەکە بۆ ماوەیەکی زۆر دانیشت دوایی لێیداو ڕۆیشت پێغەمبەر ﷺ کە دی هەڵساو ڕۆیشت ناردی بە دوایا گەڕایەوە ئەمجا پێی فەرموو: چیت پێیە لە قورئان؟ گوتی: فلان سورەتو فیسار سورەت، ژماردنی. لێی پرسیی: لەبەرتن؟ گوتی: بەڵێ. فەرموی: ئەوا مارەم کرد لێت لەسەر ئەو قورئانەی لەبەرتە (واتە ئەم پێی لەبەر بکات)".

## هەزاران سەعیدی تر پێئەگەیەنێ

سکالاّ: بەو جۆرەی کە باست کرد، هەر فرە جوانو پەسەندە، کەواتە ئەم بەزمو ڕەزمەی ئێستا لەناو موسڵمانانی ئەوسادا نەبوون!

دڵپاك: نەخێر، هەرگیز بەو جۆرەی ئێستا گران مارەیی‌و بڕووبەهانەو ڕووتانەوە نەبووە، ئەوان لە بەشوودانو ژنهێناندا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئیسلام بوون. ئەمەی ئێستا لە دوورکەوتنەوە لە یاساو دەستورەکانی ئیسلام زیاتر، هیچی تر نییە. خۆ ئەگەر لەو ڕووەیشەوە تەماشای مێژووی ئیسلام بکەین، شتی وامان بەرچاو ئەکەوێ کەژیریی ئەم سەردەمەی کۆمەڵگای نەفامیی بە ئەفسانەی دائەنێتو لەوانەیە باوەڕی پێنەکات. لەگەڵ ئەوەشدا واقیع بووە مێژوو پڕ بەدەم گەواهی لەسەر ئەدات. با بۆ نمونە ئەمەت بۆ بگێڕمەوە: سەعیدی کوڕی موسەیب یەکێك بوو لە گەورە زانایانی تابعین، ئەم پیاوە زانایە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بوو، پێغەمبەری ﷺ کرد بە پێشەنگی ژیانی خۆی لە هەڵبژاردنی هاوسەریشدا بۆ کچەکەی خۆی، ئیتر گوێی لە سامانو پلەی کۆمەلاّیەتی نەبوو. قوتابییەکی خۆی بە ناوی (عبدالله ابن أبی وداعە) چەند ڕۆژێك لە وانەکانی دواکەوتو ئەمجا هاتەوە بۆ لای سەعیدی مامۆستای. مامۆستاکەی لێی پرسیی: لەکوێ بوویت؟ عەبدوڵلا ژنەکەم مردو بەوە پەشۆکام، سەعید: ئەبوایە ئاگادارت بکردینایە. تا بهاتینایە بەسەر دەمتەوە. پاش تەواوبوونی وانەکە عەبدوڵلا هەڵساو ئەیوست بڕواتەوە، سەعیدی مامۆستای لێی پرسی: هەوڵی پەیداکردنی هاوسەرێکت نەداوە؟ سەعید ئەی بەر ڕەحمەتی خوا کەوی کێ ژنم ئەداتێ جگە لەدوو تا سێ پەنجایی زیاترم پێ نییە. سەعید من ئەتدەمێ، عەبدوڵلاّ: جا شتی وا ئەکەیت؟ سەعید: بەڵێ.

ئەمجا سەعید سوپاسی خوای کرد، سەڵەواتی دا لەسەر دیداری پێغەمبەر ﷺ، کچەکەی لەسەر دوو پەنجایی مارەکرد لە عەبدوڵلاّ. عەبدوڵلا ئەڵێت: ئەمجا هەڵسام، لەخۆشیدا نەم ئەزانی چیبکەم، چوومەوە بۆ ماڵەوە، بیرم ئەکردەوە لەکێ شتێ قەرز بکەم! نوێژی مەغریبم کرد و چوومەوە بۆ ماڵ، چراکەم داگیرساند، نانی ئێوارەم هێنایە بەردەستم کە نانو زەیت بوو، کتوپڕ تەقەی دەرگاکەم هات، گوتم: کێی؟ گوتی: سەعید.

هەرچی سەعید ناوێ هەبوو ئەگەر بەبیرما هاتبێ لەو کاتەدا، سەعیدی کوڕی موسەیب بەبیرما نەهاتەوە، کە دیم ترسامو خەمم بوو شتێکی لێ قەومابێ، گوتم: ئەی باوکی موحەممەد ئەگەر بتناردایە بەدواما ئەهاتم بۆ خزمەتت! گوتی هەقوایە من بێم بۆ لای تۆ. گوتم: فەرمانت چییە؟ گوتی: تۆ پیاوێکی زگورتی بوویت، ژنت مارە کرد، پێم ناخۆش بوو ئەمشەو بە تەنیایی بتهێڵمەوە ئەمەش ژنەکەتە، عەبدوڵلا ئەڵێت: ئەبینم کچەکەی لە دوایەوە ڕاوەستاوە، ئەمجا دەستێکی گرتو کردیە ئەمدیوی دەرگاکەوەو خۆی گەڕایەوە.

منیش پاڵمدا بە دەرگاکەوە ئەمجا چووم بۆ لای ئەو ئامانەی کە نانو زەیتەکەی تێدا بوو، خستمە سێبەری چراکەوە تا لەو تاریکییەدا بێتو نەیبینێ، ئەمجا چومە سەربانو لەوێوە دراوسێکانم ئاگادار کردنو هاتن بۆ لامانو پرسییان ها

چ کارێکت هەیە؟ گوتم : (ویحکم) سەعیدی کوڕی موسیەب ئەمڕۆ کچەکەی خۆی لێ مارە کردمو ئەمشەو لە ناکاوا خۆی هێنای بۆ ئێرە، گوتیان: چۆن؟ سەعید کچەکەی لێ مارە کردیت ؟ گوتم : بەڵێ.

چونە خوارەوە بۆ لای، هەواڵەکە گەیشتە دایکیشم هاتو گوتی: دەك شیرم حەرامت بێ ئەگەر دەستت لێدابێت یان لێی بدەی تا سێ ڕۆژی تر، ئەبێ بیرازێنمەوە بۆت، منیش تا سێ ڕۆژ نەچووم بەلایدا، دوایی کە چووم بۆ لای دیم جوانترین ئافرەتە، لە هەموو کەس چاکتر قورئانی لەبەرەو شارەزایی لە سوننەتی پێغەمبەرا ﷺ هەیەو لە هەمو ئافرەتێ زیاتر شارەزایی مافی مێردی بەسەر ژنەوە هەیە.

بۆ ماوەی یەك مانگ نە من چووم بۆ لای سەعیدو نە ئەو هات بۆ لای من، دوای ئەو مانگە چووم بۆ لای لە حەڵقەی وانە وتنەوەدا بوو، سەلامم لێکردو ئەمجا پرسی هەواڵی ئەو ئادەمیزادە چۆنە؟ وتم لە خێرایە، ئەمجا چوومەوە بۆ ماڵ. ئەبینم بیست هەزار پەنجایی ناردووە بۆ ماڵەوە بۆم.

ئاواز: لە ڕاستیدا ئەو پیاوە هەنگاوێکی وەهای ناوە، خەریکە بڵێم وێنەو هاوچەشنی لە مێژوودا بەرچاو ناکەوێ، دەی تو خوا حەیف نییە بەو بگوترێ موسڵمانو بەو باوکەش کە شەش هەزار دینار حازرو پێنج سەد لیرەی مارەیی قەرز داوا ئەکات بگوترێ موسڵمان؟!

دڵپاك: موسڵمانەتی بەناو یان قسە نییە، ئەبێ کردەوە بیسەلمێنێ، ئەوەش بزانە ، سەعید لەسایەی ئیسلامدا ئەو هەنگاوەی نا، ئیسلامیش (سوپاس بۆ خوا) ماوەو هەر ئەشمێنێ، هەر ئەو ئیسلامەی کە سەعیدی پێگەیاند، هێزو توانای پێگەیاندنی هەزارەها سەعیدی تری هەیە، ئەوەش نمونەیەك بو لە نێوان چەندەها نمونەدا، وا نەزانی تەنیا نمونەیەك بووە، ئێستاش چەندان ڕووداوی موسڵمانانەی وەها ڕوو ئەدەن، بەڵام لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەکرێنو بکەرەکان ناوی خۆیان دەرناخەنو نایانەوێ کەشخەو فیزی پێوە بکەن. دیارە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی کوفریش نایانەوێ دەنگو باسی وەها بڵاوبکەنەوە.

حەز ئەکەم خاڵێکتان بۆ ڕوون بکەمەوە ڕەنگە بە دڵتان بێتو بڵێن، جا کێ هاتووەو داوای کچەکەی سەعیدی کردووە؟ لەوانەیە کەس داوای نەکردبێت و بووبێتە ملی خوا خوای ئەوەی بووبێ هەژارێکی وەك عەبدوڵڵای دەست بکەوێ بۆ کچەکەی، بۆچ ئەو هەلە لەدەستی خۆی دەربکات؟

عەبدوڵڵای کوڕی سولەیمان دەگێڕێتەوە:".. ئەو کچەی سەعید، خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان خوازبێنی کرد بۆ وەلیدی کوڕی، لە کاتێکا کە کردبوویە (ولی عهد)، کەچی سەعید ئەو کچەی نەدایە"[1].

سکاڵا: لااله الا الله..! بەڕاستیی ئەوە تەنیا لەموسڵمانی تێگەیشتوو دێتو بەس.. زۆربەی موسڵمانی ئێستا هەر بەناو یا بە چاولێکەریی موسڵمانن، بۆ نموونە: باوکم (با گاڵتەش بکات) هەموو جارێ ئەڵێت: هەر کە سکاڵام دا بەشوو ئەبێ چەندم بۆ خەرج کردووە، هەمووی لە زاواکەم بە مارەیی بسێنمەوە.

دڵپاك: جا مارەیی خۆ بۆ ئەو نابێ، ئەی نازانی مافێکی ڕەوای ئافرەتەکە خۆیەتی، نەك هی کەسو کارەکەی؟ باشە ئەی بۆچی بگەڕێ بەدوای هاوسەردا بۆ سەربەست، مەسرەفی ژن هێنانەکەشی بداتو ئامادەش بێ یارمەتی تری بدات؟ ئەمەیان یانی چی؟ ئەی هەردووکتان جگەر گۆشەی ئەو نین؟ خۆ بۆ ئەو زیاتری خەرج کردووەو ئەکات، ئایا سەربەست بۆی ئەبژێرێتەوە؟ ئایا باوکت ئەوەی ئەدا بە گوێدا؟ لە ئیسلامدا، بە تایبەتی لە مەسەلەی هاوسەرییدا، هیچ جیاوازییەك لە نێوان کوڕو کچدا نییە.

سکاڵا: من گلەییم لەباوکم ناکەم لەوەدا، بەسەرزمانە هەر ئەوەندەی لێئەزانێ، ئەو دیوویەتیو ئەبینێ کە خەڵك وایکردووەو وا ئەکات. جا گلەیی لە خۆم ئەکەم کە خوێندەوارمو کەچی بەرامبەر ئیسلام نەفامو نەزان بووم.

[1] عقبات الزواج: عبدالله ناصح العلوان.

## ئاسانكارییەك نەك دیاریكردن

دڵپاك: لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان یەكێكتان لەگەڵ كەسێكدا بكەوێتە گفتوگۆو باسی مارەیی بكاتو ئەم باسەی كە كردمان بیخاتەڕوو، ئەوكەسەش بڵێت: مشتێ خۆراك یان ئەنگوستیلەیەكی ئاسن.. هتد، ئەوە ئەگەیەنن كە ئافرەت لە ئیسلامدا بایی ئەوەندە بێت، ئەگینا ئەو جۆرە شتانە چ نرخێكیان هەیە؟

ئاواز: دەی ڕەنگە شتەكە وەهابێ دڵپاك. با واقیعیی بین.

دڵپاك: ئاواز خان، كام واقیع؟ خۆزگە ددانمان بە ڕاستی، بە واقیعدا ئەنا، ئای كە بەختەوەرو كامەران ئەبووین!

چاوەكەم، مشتێ خۆراك یان ئەنگوستیلەیەكی ئاسنین، هەروەها دوو پەنجایی یان چەند سورەتێكی قورئان، لە ئیسلامدا بەشێوەی واجب، دیاری نەكراون كە بكرێن بە مارەیی ئافرەت. ئەو جۆرە شتانە ڕەمزیی بوون ڕەمزیی. بۆچ سەعیدی كوڕی موسەیب خۆی یان كچەكەی ئاتاجی دوو پەنجایی بوون؟ ئەی دوایی بۆچ بیست هەزار پەنجایی نارد بۆ عەبدوڵلا؟ لە ئیسلامدا مارەیی نرخی ئافرەت نییە، مرۆڤ فرۆشتن نییە، مرۆڤ لە هەموو نرخی ئەم دونیایە بە نرختره، تۆ باسی كام واقیع بۆ من ئەكەی؟

مارەیی ئافرەت لە ئیسلامدا بە پێی كاتو شوێن و دەستەلات ئەگۆڕێت. مەبلەغێك پارە یان زێڕو زیو یاخۆ شتێكی تری بۆ دیاری نەكراوە، تەماشا ئەكەی لە شوێنێكا لە كاتێكا بۆ كەسێك مەبلەغێك سووك و ئاسانە، كەچی ئەو مەبلەغە بۆ كەسێكی تر لە هەمان كاتو شوێنا یان لە كاتو شوێنێكی ترا قورسو گرانە، بۆ نموونە: لەحەبەشەدا (أم حبيبه) كە پێغەمبەر ﷺ كردی بە هاوسەری خۆی، (نجاشی) پاشای حەبەشە، چوار هەزار پەنجایی مارەیی بۆ دا لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ. چوار هەزار پەنجایی لەو ڕۆژگارەدا زۆر زۆر بوو، بەڵام بۆ پاشایەك نا، چونكە خاوەن دارایی و دەستەڵات بوو.

سكاڵا: بە ڕاستی بەرنامەی ئیسلام ئەوەندە تێرو تەواوە بەهانەی هەموو كەسێكی بڕیووە، هیچ گرفتێكی بێ چارەسەر نەهێشتوەتەوە.

## با ئافرەتانیش چاو لە ئوم سلیم بكەن

سكاڵا: ئەگەر بێینە سەر باری ڕاستیی، زۆربەی هەرە زۆری دایكانو باوكان، لە بەشوودانی كچەكانیاندا بە تایبەتی لە مەسەلەی مارەییدا تاوانبارن دەبا ئەوانیش چاو لە سەعیدی كوڕی موسەییب بكەن، چی ئەبێت؟

دڵپاك: با ئێمەش تاوانەكە یەك لایەنە نەكەینەوە، بۆچ بە تەنها بیدەین بە كوڵ دایكو باوك یان كەسو كاری ئافرەتدا؟ ئایا ئافرەتە شووكەرەكە یان بەشوو دراوەكە لەو تاوانەدا بێلایەنە؟ ئەی بە بەشداری دانەنێین؟

ئاواز: بۆچ بە بەشداری دابنێین؟ ئەو چ تاوانێكی هەیە؟

دڵپاك: وا دیارە ئێوە خۆتان گێل ئەكەن، خۆ ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆرۆی ئافرەت لە سەرانسەری جیهاندا، خۆی هاوسەر بۆ خۆی ئەدۆزێتەوە، بە تایبەتی ئافرەتی (سەربەست)، تەنانەت دایكو باوكی كاتێ پێی ئەزانن كە گەلێ جار كار لە كار ترازاوەو ئاغایەك هاتوچۆیان ئەكاتو دەست ئەخاتە دەستی كچەكەیانەوەو بۆ هەر لایەك بیانەوێ دوو بە دو ئەڕۆن. بەبێ ئەوەی ئەو كچە هیچ پرسێك بەو دایكو باوكو كەسو كارەی كردبێت، بگرە ئەوان ئەو بەزمەشیان گەلێ پێناخۆش بێت.

كەچی لە كاتی مارە كردندا پەڵپو بەهانە گرتنەكە ئەداتە دەست دایكو باوكو كەسو كارەكەی، یان ئەگەر ئەوان پەڵپو بەهانە نەگرن ئەم خۆی دەیان بەهانە ئەگرێت، ئەیەوێ لە هاوچەشنەكانی زیاتری بۆ بكڕێت، زیاتری لە پێناودا بۆ خەرج بكرێت، مارەییەكەی لەوان زیاتر بێت! گوایا ئەم كارانە نیشانەی گەورەیی و بەڵگەو ڕێزو گرنگی ئەویان پێوەیە!

ڕاستە، هەقوایە دایكو باوك چاو لە سەعیدو خێزانەكەی بكەن، ئەوە كارێكی پەسەندی موسڵمانانەیە، بەڵام دەی با

کچانیش چاو لە ئوم سلیم بکەن، گوایا ناتوانن؟ ئەی بۆچ هەموو شتێکی تر ئەتوانن و ئەزانن؟

سکالاّ: ئوم سلیم کێیە؟ بۆچ چی کردووە؟

دڵپاك: ئافرەتێکی موسڵمان بوو، موسڵمانی ڕاستەقینە، ئەبو تەلحە داوای لێکرد کە شووی پێ بکات، پێی گوت: هەرچی لە زێڕو زیو داوا بکەیت لێم بۆت ئەکرِم بەو مەرجەی شووم پێبکەیت، ئەو ئافرەتە مەردە خواناسە، لەوەلاّما گوتی: مارەیی من نەزێڕو نە ئاڵتونە، موسڵمان بوونتە، موسڵمان بوونت. هەرکە موسڵمان بوویت شووت پێدەکەم و داوای هیچیشت لێناکەم، بەڵێ، ئەبو تەلحە موسڵمان بوو، ئوم سلیمی خواناسیش مەرجەکەی خۆی بە جێهێنا [1].

ئاواز: لەمەدا لەگەڵتام، زۆر ڕاستە، تاوانی هەرە گەورەو گرانی مارەیی لە پلەی یەکەمدا، لە ئەستۆی ئافرەتدایە، هەق وایە لەم ڕووەشەوە هەنگاو بنێین و جێی نەخشی پەنجەیان دیار بێت. چونکە بەم هەنگاونانە، پەیداکردنی هاوسەر مسۆگەر دەبێت، پیاوان لە ژنهێنان ڕاناکەن، کە چوونە ماڵی تازەیانەوە، بیرکردنەوە لە قەرزدانەوە خۆشی ژیانی هاوسەرییان ناشوێنێ، هێلانەی بەختیارییان سرو سارد نابێت.

دڵپاك: بەشوودانی ئافرەت لە ئیسلامدا نە بازرگانیی و نە ڕوتاندنەوەیە، نا. یاساییەکی خواییە، دەس هەڵگرتن لەو یاسایە، پەشێویی و بەرەڵاّیی و سەرگەردانی بەدەمەوەیە، هەر کۆمەڵگەیەکیش ئەمانەی تیابوو خەڵکەکەی بە گشتیی و ئافرەتی بە تایبەتیی، بەختیاری بەخۆیەوە نابینێ، ئیسلام مارەیی پێویست کردووە کە پیاو بیدات بەو ئافرەتەی کە ئەبێتە هاوسەری، بەلاّم مارەیی ڕوتاندنەوەو خەساندن بە هۆی قەرزارییەوە نییە. سەرەتا (مبدء)ی گشتیی شووکردن لە ئیسلامدا، چاکیی ئەو پیاوەیە کە ئەبێت بە هاوسەری ئەو ئافرەتە. پاکیی و گەرمیی باوەڕی موسڵمانەتی و بەرزیی ڕەوشتیەتی، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "أذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه الا تفعلوه تكن فتنة في الارض وفساد عريض" (رواه الترمذي).

سکالاّ: الله، یاسایەکی چەند جوان و دڵگیرە، چەند بەرفروانە!

دڵپاك: خوشکە بەڕێزەکانم، یاساکانی ئیسلام هەموویان، لە هەموو ڕووەکانی ژیانەوە جوان و دڵگیرو فراوانن، چەسپاوو گونجاوی، سروشت و فطرەی پاکی ئادەمیزادن، چۆن نا؟ ئادەمیزاد هەر ئەو خالقە خەلقی کردووە کە بەرنامەکەی ئیسلامی بۆ ناردووە، دیارە لە شتی وەهادا ناوێزەیی دروست نابێت، بەگژداچوون و فطرەی پاکەکەیان شێوێنرابێت و کرابێت بە ژێر زبڵ و مبڵی پیسی کۆمەڵگەوە، یانی لەسەر شێوە ڕەسەنەکەی خۆی نەمابێتەوە.

| | |
|---|---|
| وەرە بۆ دنیای ئەم دینە | یاساو دەستوری ببینە |
| دڵ و مێشك و بیرو گیانت | عیلم و تەجروبەی ژیانت |
| یەك یەك هەمووی بەکاربێنە | سەد یەکی ئیسلام بخوێنە |
| تاخۆت حەقیقەت بزانی | نەك بە زەحمەت بە ئاسانیی |
| دووریەرێزیی و ڕەخنەبازیی | بەڵگەی نەزانین، لاوازیی |

[1] تەماشای (الاسلام وقضايا المرأة المعاصرة : البهى الخولي) بکە.

# مارەیی مافی ئافرەتە بە تەنیا

ئاواز: یەك، دوو جارێ بەرگوێم کەوت کە وتت، مارەیی مافی ئافرەتە بە تەنها، لەوە تێنەگەیشتم، ئەوە یانی چی؟

دڵپاك: دەی لە ئیسلامدا مارەیی هی ئافرەتی شووکەرە، ئەوە پرسیاری ئەوێ؟

سکاڵا: هی ئافرەتی چی؟! ئەی نادرێت بە کەس و کاری ئەو ئافرەتە لە جیاتی ئەوەی بەخێویان کردووە؟ ئیتر چۆن هی ئافرەتە؟

دڵپاك: جا ناهەقمە ئەگەر بگریم بۆتان؟ ئەی هاوار! ئێوە چۆن ئەمەندە بێئاگان لە ئیسلام؟ چۆن ئەمەندە دوورخراونەتەوە؟ ئەی بۆچ ناوی سەدان سەماکەرو ئەکتەری گۆرانی بێژ فێربوونو ئەزانن؟ بۆچ قوماش نییە ناوی نەزانن و نرخەکەشی نەزانن؟ کەچی سادەترینو ئاسانترین حوکمی شەریعەتو ئایینەکەتان نازانن، لەوەش زیاتر هێرشیی ئەکەنە سەرو نەیاریی لەگەڵا ئەکەن؟!

سکاڵا: چونکە بۆ ئەوان کەسدارو بۆ ئەم بێکەس بووین، تێ ئەگەیت؟

دڵپاك: خوا پاداشت بداتەوە، بەڵێ تێئەگەمو وەڵامەکەت زۆر ڕاستو جوان بوو، خوشکەکانم مارەیی مافێکی پێویست (فرض) کراوە لەسەر پیاو کە بیدات بەو ئافرەتەی کە ئەبێتە هاوسەری، ئەم مافە خوای پەروەردگار پێویستی کردووە، لە یاسای ژمارە چواری سورەتی (النساء)دا خوا ئاشکرای کردووە. "وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَّرِيئاً" (النساء: 4). بە شێوەی پێویست (فرض و واجب) فەرمانی خواییە کە کراوە، مارەیی ئەبێ بدرێت بە ئافرەت، نەك قەرزدان، یا بەتەمای قەرەبووکردنەوەی، نا، شتی وانییەو نابێ، بەڵکو دانی ئەو مارەییە بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانی پیاوە، بەجێهێنانی فەرمانی خوایە.

جا با بە ووردی سەرنج لە یاسا قورئانییەکە بدەین، (الصدقات) ناوێکی کۆیەو تاکەکەی (الصدقە، الصداق)ەو بە کوردی پێی ئەڵێن مارەیی، ووشەی (نحلە) یانی پێدانێك لە لایەن خواوە واجب کرابێت، هەروەها (الصدقات) لە زمانی عەرەبیدا، لەم ڕستیەدا (مضاف)یشە بۆ (مضاف الیە) کە ڕاناوی لکاوەو ئەویش (هن)یە، واتە مارەیی پێدراوە، بەڵام بە کێ ئەدرێ؟ دیارە بە (هن) ئەدرێ، (هن) ش ئەو ئافرەتانەن کە شوو ئەکەن، خۆ کەس و کاریان لە جیاتی ئەوان شوو ناکەن.

سکاڵا: دەی بە خوا ئەمە یەکەمین جارە من ئەمە ئەبیستم و ئەزانم، ئاخ خ!

دڵپاك: دەی ئیتر زۆر چاك بزانە، کە مارەیی مافێکی ڕەوای پاڵفتەکراوی ئافرەتەو خوا بۆ ئەوی پێویست کردووەو هەرکەس، هەرچییەکی لێ ببات یان بخوات حەرامەو حەرامە. جگە لە یەك حاڵەتدا نەبێت، ئەویش ئەوەیە کە ئافرەتەکە بەبێ زۆر لێکردن بەبێ ناچار کردن یان فروفێڵ لەگەڵا کردن خۆی حەزو مەیلی ببێ، لەم حاڵەتەدا حەرام نییە، " فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَّرِيئاً ". ئیتر کەس و کاری چی؟ قەرەبووکردنەوەی ئەو مەسروفاتەی کە بۆی کراوە یانی چی؟ شتی وا چۆن ئیسلام ئەیگرێتە خۆی؟ زاوا ئاوەڕووتکردنو مارەیی خواردن، کاری ئیسلامی نین و پیشەی موسڵمانی ڕاستەقینە نین، موسڵمانە خواناسەکان لە سامانی خۆیشیان ئەخەنە سەر مارەیی کچانو خوشکانیان، من گەلێ جار ئەوەم بە چاوی خۆم دیوە، ئەوانەی کە خێڵی پێنج سەد یان شەش سەد لیرەن، ئەوانەی مارەیی کچەکانیان ئەگرنە ژێر دەستی خۆیانو دوایی ئەیخۆن، موسڵمانی تەواو نین، لەفەرمانی خواو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لایانداوە، بەر سزای خوا ئەکەون، وەك ماڵی هەتیویان خواردبێت وەهایە. نەکەس و کار، نەمێرد، هیچ کامیان مافیان بەو مارەییەوە نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانانی ئاگادار کردۆتەوە کە (هەر پیاوێك مارەیی ژنەکەی بەلاوە مابێ و بەتەمابێ نەیداتێ، کە مرد ئەو پیاوە لە دۆزەخییانە).

ئاواز: بەڵام هەندێ دایكو باوك یا بڵێین کەس و کار، ئەو مارەییە ئەگرنە لای خۆیانو دوایی ئەیکەن بە جەهازی شووکەرەکە.

دڵپاك: ئەگەر ئافرەتەکە پرسیی پێ بکرێت و بەڕەزامەندی خۆی مۆڵەتی ئەوە بدات، یا خۆی داوا بکات، ئەمەیان جوان و ڕەوایەو پەسەندە. ئەگینا نابێ و ڕەوانییە کە بەو مارەییە جەهازیی بۆ ڕێك بخرێت، دیسانەوە، ئەوەی کە ئەکرێت بۆ زاوا یان کەس و کاری زاوا، لەجل و بەرگ و پڕوپیتاك، یاخۆ ئاڵتون یان کەلوپەلی ناومالْ بەمارەیەکە، ئەویش هەر ناڕەوایە، حەرامەو موسڵمانەتی نییە، سا مەگەر ئافرەتەکە خۆی (عن طیب نفس) بیکات، ئەوەش بزانن جەهازیی ڕێکخستن بە مارەیی ئافرەت باوو نەریت و ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتییە نەك یاسایەکی شەرعی.

هەندێکیش هەن کە کچ یان خوشك ئەدەن بەشوو، بە نیازیی ئەوەی کە ئابڕوویان نەچێت، نەبنە بنێشتە خۆشەی ژێر ددانی خەڵك، یاخۆ هاوچەشمان کەم نەبن لەناو دۆست و دوژمندا، گوایا جەهازی چاك ڕێك بخەن زاوا ئەڕوتێننەوەو خۆیشیان قەرزار ئەکەن، بێگومان ئەم کارە نەخواو نە پێغەمبەر فەرمانیان بە ئەنجامدانی نەکردووە.

ئێمە ناڵێین جەهازیی ڕێکخستن خراپ و ناپەسەندە، بەڵام نابێ بە مارەیی ئەو ئافرەتە ڕیکبخرێت، لە کاتێکا خۆیی ڕازی نەبێت بەوە. هەروەها ئەبێ لە سنورو دەرنەچێت، چونکە هەرچی لە سنووری خۆی دەرچوو، چاکەکەی ئەبێت بە خراپە، بەم جۆرە باشترین جەهازیش ئەوەیانە کە ئاسان بێت، ڕوتاندنەوەو قەرزار بوونی بەدەمەوە نەبێت، خەڵك دوای شتی پڕو پوچ لە داهێنراوی بێ کەڵك و مۆدێل بازی نەکەوێت، زیادەی ڕەوی نەکات و لە یاساو ڕێبازی ئیسلام لانەدات، لە پێداویستییەکانی ماڵ و خێزان کە بە سەرەکیی ئەژمێررێن دوور نەکەوێتەوە.

ئاواز: یانی ئافرەت ئەتوانێ ئەو مارەییە بە ئارەزووی خۆی خەرج بکات؟

دڵپاك: ئەو مارەییە هی ئافرەتەکەیە بە تەنیا لەبەرئەوە زۆر بە چاکیی ئەتوانێ هەرچی لێبکات، لێی بکات، بەمەرجێ لە کارو مەبەستی حەڵاڵ لا نەدات.

خوشکی شیرینم، ئافرەت تەنیا لە سایەی ئیسلامدا ئەتوانێ بەرەو بەختیاری ڕاستەقینە بڕوات، ئەها چەند بە وردیی چاودێریی ئەکات، مافی ئەپارێزێ، چۆن مافی خاوندارێتیی بۆ دابینکردووە! لەسەردەمی نەفامیدا. وەك باسمان کرد. مافی ژێر پێ خرابوو، خاوەنداریتیی چیی و سامانی چی؟ ئێستاش لە کۆمەڵگە پێشکەوتوەکانی سەدەی بیستەمدا، ئەبێ بە پارەی ڕەنجی شانی خۆی جەهازیی ڕێك بخات بۆ ماڵی ئەو کەسەی کەئەیەوێ بیخوازێ! بە ڕاستیی ئافرەت زۆر زۆر قەرزاری ئیسلامە، بەڵام سەریان لێشێواندووەو هەستی پێناکات، لەوەش زیاتر بە هۆی درۆو دەلەسەوە، ناحەزان کردوویانە بە دوژمنی ئیسلام، کردوویانە بە پیك و چەکوشێك ئەیانەوێ قەڵای ئیسلامی پێ بڕوخێنن، جا هەق هەیە ئافرەتان ئیتر وریا ببنەوە، دۆست و ناحەزی خۆیان بناسن و لەیەکیان جیا بکەنەوە.

ئەو شۆڕشەی پلەو پایەی تۆی هێنایە ڕیزی پیاو
بێ وێنە بوو، خودایی بوو، لەگەڵ فطرەدا ڕێك، گونجاو
دەمەردانە لە سایەیدا هەنگاو بنێ و گومڕا نەبی
بە هاژەو هوژ تەفرەت نەدەن، خۆت نەخەیتە گێچی گێجاو

## هاوشانیی (الکفوء)

ئاواز: دڵپاك خان، لە ناو موسڵماناندا وشەیەك باوە، ئەیڵێن و ئەیڵێنەوە، تەنانەت لە تۆشم بیست، ئەویش وشەی هاوشانییە، ئایا ئەم وشەیە چینبازی (الطبقیة) نیشان نادات؟ دیارە ئەم ووشەیە ڕەگ و ریشەیەکی ئایینی هەیە، بۆیە وەها لە ناو موسڵماناندا بڵاوبۆتەوە!

دڵپاك: ئاواز خان، مەرج نییە هەرچی ئایینی بێت، بە ئاسانیی و فراوانی بڵاوبێتەوەو بکرێت یاخۆ کرابێتە یاسایەکی پەیڕەو کراوو هەموو بەش و چینەکانی کۆمەڵگە لەسەری ڕۆیشتبن یان بڕۆن. ئەو ووشەیەش تەنها موسڵمانان بەکاری ناهێنن، بەڵکو زیاتر ناموسڵمانان بەکاری دێنن، ئەی پەنجەت بۆ ئەوان بۆچ ڕانەکێشا؟

هەروەها هەزاران باو نەریت و یاسای کۆمەڵایەتیی هەن و لە ناو زۆربەی گەلەکانی جیهاندا بڵاوبۆتەوەو چەندەها زیانیشیان هەیەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش پەرە ئەسێنن، بەبێ ئەوەی هیچ ڕەگ و ڕیشەیەکی ئاینییان هەبێت، بگرە ئایین زۆر زۆر دژیشیانە.

لە ڕووی ئاینییەوە ئەگەر تەماشای مەسەلەکە بکەین چین و چینبازی لە ئیسلامدا هەر لە بنەرەتانەبووەو نابێ، چونکە موسڵمان برای موسڵمانە، " إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ"، پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: "المسلم أخو المسلم". دەی برایان لە ناو خۆیاندا ژیریی پەسەندی ئەکات کە چینبازی بکەن؟ ئایا لەدەم دوژمانیش بیستراوە کە ئیسلام بە هۆی چینبازییەوە هەوڵ بدات بۆ سەپاندنی خۆی و حوکم گرتنە دەست؟ ئەوە پیشەی ئیسلام نییە.

بەڵام با ژیریی و بیرو سەلیقەی خۆمان بخەینە کارەوە، با ووردبین بین، بە کوێرانە حوکم نەدەین بەسەر هیچ مەسەلەیەکدا، نموونەیەك بۆ ئەم مەبەستە بێنینە بەرچاوی خۆمان: کچی کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند ، بەناز پەروەردە کراو، خانمی ناو کۆشك و باخچە، بە ئۆتۆمبیل چووە بۆ گەڕان و ناوبازاڕ، خزمەتکارو کارەکەر هەموو کارێکیان بۆ کردووە، لە شارا لە دایکبوەوە پێگەیشتووە، قۆناغێکی بەرزی خوێندنی بڕیوە، لە نێو گوزەرانێکی گوشادی نەرم و نیان و خۆشدایە، نەبوونی یەك سات بە خۆیەوە قەت نەدیوە.

ئایا بە ڕاست و ڕەوای ئەزانی کە بدرێت بە کوڕە جووتیارێکی لادێی نەخوێندەواری هەژارو بێدەس؟ ئایا ئەو کچە ئەتوانێ بەبەرگرو تینی گەرمای خۆرەوە شەتڵ بنێژێ، پاچە کوڵە یان گەڵاشکێن بکات؟ ئەزانێ و ئەتوانێ لەسەر ساج نان بکات و بە پوش و چیلکە ئاگر بکاتەوەو چێشت لێ بنێت و منداڵیش بەخێو بکات؟ خۆ ئەگەر وانەبێت ئەو کوڕە ناژێ، هەموو خەزورێکیش سەعیدی کوڕی موسەیب نییە، کە بە هەزاران پەنجایی یان دینار بنێرێ بۆ زاواکەی. ئایا ئەو کچە دەوڵەمەندە ئەتوانێ لەگەڵ ئەو هاوسەرەیدا ـ کەگوتمان ـ بە بەختیاریی بژی.

ئاواز: دانی پیادا ئەنێم کە من هەرگیز بیرم لەوە نەکردەوەو قەت نەشمکردۆتەوە، تۆ ڕاست ئەکەی نموونەکە تێی گەیانم.

دڵپاك: ڕاستتر ئەوەیە ڕەخنە لە خۆمان بگرین، خۆمان، ئێمەی ئافرەتی ڕۆشنبیر کە مامۆستای خەڵکین و پەروەردەکردنی ئەم بەرەیە (الجیل)ەمان دراوتە دەست. تا ئێستاش کە هاوپیشەکانمان دێنە خوازبێنیمان، بە نەنگی ئەزانین کە شوویان پێبکەین، یەکسەر ئەڵێین:"تەباخی یەك چاو"، هەمومان بە تەمای پزیشك و ئەندازیارو ئەفسەری زلە زلەین، دەی خۆ هەموو پیاوێکیش ناتوانی ببێتە پزیشك و ئەندازیارو ئەفسەر!

سکاڵا: بەخوا ڕاست ئەکەیت. هەر ئەوەش گەورەترین هۆیە لە مانەوی زۆربەی کچە موچەخۆرەکاندا بە زگورتیی و بێ مێردی، ئەوەتا لەسەرەتاوە خوازبێنی کەریان زۆرە، کەچی کە لووت بەرزییان دەرکەوت، ئیتر خەڵك لێیان ئەسڵەمێتەوەو داوایان ناکات، تاسەر زوڵفیان سپیی ئەبێت و بەبێ مێرد ئەمێننەوە! لە هاوسەری ژیان بیبەش ئەبن.

***

دڵپاك: خوشکی بەڕێزم، هاوشانیی ژیریی و ژیربێژی پەسەندی ئەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئیسلاما جیاوازییەکی فیقهی زۆری لەسەرە، هەندی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەریان ﷺ کردوەو بە بەڵگە "قريش بعضهم أكفاء لبعض، والعرب أكفاء لبعض، حي بحي، وقبيلة بقبيلة والموالي بعضهم أكفاء لبعض رجل برجل". هەروەها فەرمودەیەکی تر "لايزوج نساء الا الأولياء الا من الاكفاء". ئەوانەی کە ئەم فەرموودانەیان کردوە بە بەڵگە ئەڵێن: ئەمە ژیانی هاوسەران بە چاکیی ڕاگیر ئەکات و دوورکەوتنەوەیان لە یەکترو جیابوونەوەیان کەمتر ئەکاتەوە، چونکە لەگەڵ یەکترا ئەگونجێن. دیارە ڕاکەیان جوان و پەسەندە. کەچی بەشی زۆری موسڵمانان ڕایان وایە کە ئەو فەرمودانە لە پەڕاوە ئیعتیبار پێکراوەکاندا نین و بەڵگەشیان بۆ گوێنەدان بە هاوشانیی زۆرو پتەوو بەهێزە. ئەم فەرمودانەش بەڵگەیانە:"أذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه، الا تفعلوه تكن في الارض فتنة وفساد عريض، قالوا يارسول الله وان كان فيه، قال اذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه ـ ثلاث مرات". فەرموودەیەکی تر "يا أيها الناس أن الله قد اذهب عنكم عصبية الجاهلية وتعاضمها

بآبائها فالناس رجلان بر تقي كريم على الله. وفاجر شقي هين على الله. والناس بنو آدم وخلق الله آدم من تراب قال الله تعالى:"يائيها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى...أتقاكم". (من خطبة يوم الفتح).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا: "المؤمنون تتكافأ دماؤهم وهم يد على سواهم ويسعى بذمتهم أدناهم". وە "ذمة المسلمين واحدة، يسعى بها ادناهم، فمن أقر مسلما فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لايقبل منه يوم القيامة صرف ولا عدل". عەلی کوڕی ئەبو تالیب نامەیەکی پێغەمبەری ﷺ پێ ماوە کە ئەم دوو فەرمودەیەی تێدا بوو.

ئاشکرایە کە کۆمەڵی دوەم بەڵگەکانیان زیاترو بەهێزترن، قورئانیش لایەنگیریان بە "إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ" ئەکات. ژیریی و ژیربێژیش پەسەندی ئەکەن و دژایەتیی و لێکدان دروست نابێت، چونکە کایەی (مَن) مەدلوولەکەی فراوانە، بۆ هەمووانە، بەتایبەتی کاتێ کە زانیمان کە ئایینی پڕ لە گوڕو ڕەوشتی بەرزو جوان ئەو دووربینەی کە ئیسلام تەماشای مەسەلەی هاوسەریی پێ ئەکات، بێگومان ئادەمیزادی ئایین پتەو و ڕەوشت چوان بە چاکیی تەماشای شت ئەکات و بە جوانیی ئەجوولێتەوە لەگەڵ هەموو کەسێکدا، بەتایبەتی خێزانەکەی خۆی.

هەروەها ئەم کۆمەڵەی دووەم، هەندێ یاسا لە سوورەتی (السبأ) ئەهێننەوەو ئەیانەکەن بە بەڵگەی ئەوە کە موسڵمانان نەکەونە دوای بەزمو ڕەزمی هاوسانی: "وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالاً وَأَوْلَاداً وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ"[1]. (سبأ: 35).

سکاڵا: بەوپێیەی کە بیستمان، ئەتوانین بڵێین: بەڵگەی ددان نا ن بە مەسەلەی هاوسەرییدا، لە ئیسلامدا، لەبەڵگەی ددان نان پیایا، زۆرتر و بەهێزەترە، خۆ ئەگەر ددانیشی پیادا نرابێت یان بندرێ، ئەو زەرەرو زیانەی تێدانییە کە بیکەین بەڕەخنەو ئیسلامی پێ لەکەدار بکەین، وە ئەگەر ددانی پیادا بنرێت و پەیڕەویش بکرێت، ئەوەلەبەر خێرو چاکەی ژن و مێردە، مەبەست پێکەوە سازان و گونجانیانە بە چاکیی، مەبەست بەردەوامبونی هاوسەرێتییەکەیانە، گەرمو گوڕی هێلانەیان ئەپارێزێ، ئەو بەرزو نزمییەی کە لە پێشەوە مامۆستا دڵپاك باسی کرد، بوونی لە نێوان دوو هاوسەردا ئەگەر خراپ نەبێت، چاکیش نییە.

ئاواز: ئەی ئەگەر ئەو پیاو ئافرەتە، بە قووڵیی و ووردیی لە ژیانی یەکتر شارەزا بن و نەخشەی ژیانی هاوسەرێتیی خۆیان بەدرێژی دراسە کردبێت و توێژینەوەی هەموو لایەنەکی ئەو ژیانەیان کردبێت، هەموو ئیعتبارێکی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی بخەنە ئەولاوە، چ دەبێت؟

دڵپاك: ئەگەر وایان کردبێت و مەرج و پەیمانەکە بەرنە سەر، هاوئایینیش بن، دیارە ئەوە خەیرێکی فراوانی خوایی باریوە بەسەریاندا و هەقوایە زۆر زۆر سوپاسی خوای تاك و میهرەبان بکەن. ئاشکرایشە کە ئەو پیاوو ئافرەتە زۆر بە چاکیی دوای بیروڕاو بۆچوونی کۆمەڵی دووەمی زاناترین زاناکانی ئیسلام کەوتوون، ئەو بیروڕاو بۆچوونەی کە لە دەریای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هەڵیان گۆزیوە.

خوشکە ئاواز، ئەگەر تۆ ئەم ڕایەت دەس نیشان کردبێت بۆ خۆت، بێگومان جوامێری و خوا یار بێت، بەختەوەریش ئەبێت.

ئاواز: مەبەستم بە تەنها خۆم نییە ، ئەی چی لە ئێوە بکەم، باشە، ئەی ئەگەر ئافرەتێك هاوسەرێکی خاوەن ئایین و خووی جوان هاتە خوازبێنی کردنی، ئافرەتەکەش ئەو پیاوەی بەدڵ بوو، کەچی کەس و کاری نەیاندا پێی چی بکات؟

دڵپاك: ئەگەر ئەو پیاوە موسڵمان و خاوەن خووڕەوشتی جوان بوو، ئەو کاتە ئافرەتەکە بۆی هەیە بچێتە دادگای ئیسلامیی و دادوەریش لە گرفتەکە ئەکۆڵێتەوە، کە بۆی دەرکەوت ئافرەتەکە لەسەر هەقە، ئەوا داوای ئافرەتەکە سەرئەگرێ، خۆ ئەگەر وانەبوو، دیارە داواکەی سەرناگرێ

[1] تەماشای (المرأة فی القرآن والسنة) محمد عزه دروزه، ل64و65 بکە).

# بەشی هەشتەم

## کێ دای هێنان؟

سکاڵا: هەرچی ئەیدەمە بەر بیرو هۆشم، زیاتر مەسەلەکەم لا ئاڵۆزتر ئەبێت، هاوسەریی ئەبوایە وای لێنەکرایە، ئەوەندە کۆسپیان لە ڕێگەدا دروست نەکردایە، بەو شێوەیە قورس و گرانیان نەکردایە! خوشکە دڵپاك، خۆزگە خەڵك لە سنووری مارەیی و شیربایی‌دا ئەوەستایەوە، کچە ئەی باسی پڕوپیتاکو ئەلەم‌و قەڵەمی تر بۆ ناکەیت؟!

دیاریی.. دیاریی!! لەهەر وەرزێکا جۆرە دیارییەك، لەهەر بۆنە( مناسبە) یەکدا جۆرە دیاریی‌و بەزمێك بۆ خانمی دەستگیران، دیاریی ڕۆژی پێخەسوو ناردن، باسەرباری دیارییەکانی خوازبێنی و مارەبڕین‌و گواستنەوەی بێت، ئەمە ئەگەر ماڵی خەزور داوای خزمەت‌و ڕەسەکێشانی سەردەمی دەزگیرانیی نەکەن! شایی‌و ئاهەنگ گێڕان، خەڵك بانگکردن‌و ناندان، دیاریی کڕین بۆ بەشی زۆری ئامادەبووان، لە کاتێکدا کە هەق وایە ئەوان دەستی یارمەتی بۆ زاوای هەژار درێژ بکەن، کەچی هەموو کەسێ دەمی بۆ کردۆتەوە!!

دەی ئەو زاوایەی کە دەرامەتەکەی کەمە، مووچەکەی سنووردارەو بۆی دەرناهێنێ، قوڕی کوێ بکات بە سەریا؟ بۆچ گلەیی لێ بکەین ئەگەر زگورتێتیی بۆ خۆی هەڵبژێرێ؟ ڕووئەکاتە بەر هەر ماڵێك بۆ هاوسەرێ، یەك لەیەك پەڵپ‌و بەهانەی زیاترە، داخوازی فراوانترە، ئەبێ چی بکات؟! لەکوێ قەرزو قۆڵە دەستخۆی بخات؟ دوایی چۆن بیداتەوە؟

دڵپاك: جا لەوەدا ئیسلام تاوانی چییە؟ ئایا ئەو خاوەن‌و کچ‌و خوشکانە، ئەو هەموو داواو پەڵپانەیان لە دەقی ئایەت یان لە فەرمودەی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووە؟ ئەو کارانە چ پەیوەندییەکیان بەبەرنامەی ئیسلامەوە هەیە؟ کێ دای هێنان؟ کی پەیڕەویان ئەکات؟

ئەو کۆسپ‌و تەگەرانە جگە لە داب‌و نەریتی کۆمەڵایەتیی هیچی تر نین. زادەی چاولێگەرییەکی کوێرانەن کە زاڵبوون بەسەر ژیریی‌و ژیربێژیی و گیانی کۆمەڵگەدا، داوی شەیتانەو تەنیویەتی تا ڕاوی خەڵکی پێ بکات‌و گیان لاواز و وێژدان مردووەکانی پێ بگرێت، کارێکە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ ڕەوشتدا نییە، دژ بە پاکیی‌و بەرژەوەندی کۆمەڵگەیە، ئەگەر بێتو هەر وا بمێنێتەوەو بڕوات، بێگومان بازاڕی هاوسەریی چۆڵ ئەکات، دەردو بەڵای عازەبێتیی تەشەنە پێ ئەکات، مەترسیی داوێن پیسیی و کارگەندیی هەموو لایەك لەوانەیە بگرێتەوە.

ئیسلام بە هیچ کلۆجێ ژیانی زگورتیی بەباش دانانێت، گلەییش بەتەنیا لەو کەسە ناکات کە بە زگورتیی ئەژی، بەڵکو گلەیی لە کۆمەڵگەکەشی ئەکات، هەر تاوانێك لەو عازەبە بوەشێتەوە، ئەو کۆمەڵگەیەش بە هاوبەشی ئەو تاوانە ئەژمێرێت‌و لەقیامەتا ئەوانیش بێبەش نابن لە سزای خوا، بە کورتیی ئەو کۆسپ‌و تەگەرانە نەك هەر ئیسلامیی نین ، بەڵکو پێچەوانەی بەرنامەو ویستی ئیسلامن، دژی ئیسلامن، دەستکردی کوفرن، بەوپەڕی دڵنیایی‌و سەربەرزییەوە ئەڵێین "ما أنزل الله بها من سلطان".

بەڵێ لە ئیسلامدا مارەیی هەیە، بەڵام شیربایی نەء، ناندان‌و ڕێزگرتنی میوان هەیە، بەڵام سووڕو سەماو دەڵەك و هەراو بەزمی تر نەو. ئەوەش کە ئیسلام بڕیاری لەسەرداوە یان ڕێی لێنەگرتووە ئەبێ بە پێی بوون‌و دەستەڵاتی دەستگیراندار یان زاوا بێت، ئەبێ لە سنور دەرنەچێت‌و زیادە ڕەویی تێدا نەکرێت، لەگەڵ یاساکانی ئیسلامدا بگونجێت.

با ووردبین، بیربکەینەوە، چاك‌و خراپ لەیەك جیابکەینەوە، ئادەی بۆم بدۆزنەوە لە چ سورەت‌و ئایەتێکدا لەچ

دەقێکی سوونەتا، لەسەر فەتوای کام پێشەوای ئیسلام، خەڵکی کە ژن ئەهێنێ ئەیبات بۆ شارێکی ترو لە ئوتێلێکدا کە هەموو جۆرە خراپەو خراپکارییەکی تیایە خۆیو هاوسەرەکەی ئەگێرسێنەوەو لەوێ ئەبێ بە زاوا؟ گوایا کاکی زاوا (شهر العسل) ئەکا، پێشکەوتنخوازە، ئەی ئەمەش هەر کاری ئیسلامە؟ ئای! خوشکە شیرینەکانم، بەخوا ئەگەر ئیسلام گیری نەخواردبێت بە دەست ئێمەوە ، ئێمە گیرمان نەخواردووە بەدەست ئەوەوە.

خەڵك ئەگەر ڕاست ئەکاتو دڵسۆزی کوڕو کچ و براو خوشکی خۆیەتی، ئافرەت دۆستان، ئەگەر ڕاست ئەکەنو ئەیانەوێ ئافرەت بەرەو بەختیاری ڕاستەقینە بەرن، ئیسلام تاکە ڕێبازێکە کە ئەوەیان بەپاکییو چاکیی بۆ بهێنێتە دی، ئەمە قسەیەکی ڕووتو بیردۆزێکی خەیاڵیی نییە، بەڵکو ڕووداو سەلماندی مێژوو گەواهیی لەسەر ئەدات، دراسەی واقیعی ئەمڕۆی ئافرەتیش داوای باوەش کردنمان بە ئیسلامدا لیَ ئەکات.

## بۆچ وابەستەی باوو نەریت بین؟

ئاواز: گیروگرفتەکە ئاڵۆزە لە هەموو سەرێکەوە، بە تایبەتیی بۆ قوتابی، بۆ ئەوانەی خەریکی خویندنن، لەلایەکەو پارەی ئەوێ، لەلایەکەو هاوسەریی ئەبێتە هۆی پەك کەوتنی خوێندن، لەلایەکی تریشەوە، کەسو کاری پیاو یان ئافرەت دەنگ ناکەن و لەو بارەیەوە دەم ناکەنەوە، دەی بۆ ئەو پیاوە یان بۆ ئەو ژنەش جوان نییە کە هاواری لیَ هەڵسێتو داوای هاوسەر بکات. باوو نەریتی گۆمەڵگە وای هێناوە، بەمن و تۆ چاك نابێت.

دڵپاك: ئەو شتانەی کە باست کردن، لە بڕو بەهانەی بێناوەرۆك بەولاوە هیچی کە نین، خەڵك خەڵەتاندن یا خۆ خەڵەتاندنە، دەی ئەبێ بۆچ هەوڵ نەدەین بۆ شکاندنو سڕینەوەی هەر باوو نەریتێ کە لە کۆمەڵگەدا هەیەو زەرەری هەیە بۆ ئەو کۆمەڵگەیە؟ ئایا نابێت و ناکرێت؟ بۆچ هەوڵ نەدەین کە باوو نەریتی جوانو بەکەڵك کاری پاكو ڕەوا لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوبکەینەوەو جێگیر بکەین؟ تاکەی بەندەی باو ونەریتی نابەجێی کۆمەڵگە بین؟ ئەوە بۆچ بە ئاشکرا دژی بەرنامەی خوا ئەوەستن، کەچی لا ناکەنەوە بەلای عادەتو تەقالیدی کوێرانەی کۆمەڵگەوە؟ کیَ وای لێکردن؟

ئاواز: بەڵام تەنیا منو تۆ هیچمان پێناکرێت دڵپاك! چیمان پێئەکرێت؟

دڵپاك: چۆن چیمان پێئەکرێت؟ کیَ ئەڵێ هەر منو تۆین بە تەنیا؟ ئەی ئەم هەموو موسڵمانانەی سەر زەوی چین؟ گوایا سەرزەوی موسڵمانی تێدا نەماوە؟ منو تۆ، ئەگەر بێتو هۆشو بیرمان بخەینە کار، جڵەوی ژیانمان بدەین بەدەست باوەڕو ژیریمانەوە، نەك بەدەست ئارەزوومانەوە، هەمو شتێکمان پیَ ئەکرێت، ئەتوانین ببینە نمونەیەکی پرشنگدار و خەڵك چاومان لیَ بکات. ئەگەر بێتو ئابڕوی خۆمان بپارێزین، کە داواکەرێکی گونجاو هات بۆ خوازبێنیمان، نەکەوتینە بڕوبەهانە گرتنی نەفامانە، لەسەر دەستووری ئیسلامیی شوومان کرد، زانیمان چۆن بجوولێینەوە لەگەڵ هاوسەرەکەماندا، کاتیَ خەڵك بینی بەختیاریمان بە دەست هێناوە، ئایا خەڵك هەوڵ نادات لاساییمان بکاتەوە؟ ئایا ئەگەر خەڵك چاویشمان لێنەکات ئێمە زەرەرمان کردووە؟

ئەی بۆچ لە ژێر تیشکی ئیسلامدا هەنگاو هەڵ نەگرین؟ بۆچ ئەبێ لە بەرنامەی خوا پشت هەڵ بکەینو وابەستەو ملکەچی باوو نەریتی کۆمەڵگە بین؟ ئەو گیرو گرفتانەی کە باست کردن، هەموویان لە ئیسلامدا چارەسەریان هەیەو بێ چارەسەر نەهێڵراونەتەوە، بەڵاَی دووریی ئێمە لە ئیسلام وای لێکردووین کە ڕۆژمان لێبێتە شەوو ڕێگە لە بەختیی خۆمان نەبەین، ئەمەش جێی داخە!!

وەك ئەزانین لە خاکی ئیسلامدا ئەرکی هاوسەریی لەسەر پیاوە نەك ئافرەت، بەوەش ئافرەت لە ژێر ئەو بارەدا تووشی ناڵیین یان ناڵان نابێت. جا ئەوکەسەی کە سەرپەرشتی کەری کوڕەکەیە، یان دەوڵەمەندە یان هەژار، ئەگەر دەوڵەمەندو خاوەن توانا بێت، ئەبێ یارمەتی کوڕەکەی یان براکەی بدات، هەوڵبدات کارەکەی بۆ ئاسان بکات، چونکە بەوە ئەو گەنجە لەسەرگەردانییو تیاچوون ئەپارێزیَ، لە ئاگری دۆزەخ دووری ئەخاتەوە، ئەو پارەو پوولەی کە لە

وڕێگەیەدا خەرجی ئەکات بۆی، بەلەمێکە ئەوو خۆیشی لە گوناهو تاوان و لەدەردەسەریی ئەپەڕێنێتەوە پێی.

ئایا ئەو سەرپەرشتی کەرە (ولی أمر)ە هەتا هەتایە ئەمێنێ؟ ئەو پارەو پوولەو سامانەی ئەبات لەگەڵ خۆیا بۆ ناو گۆڕەکەی؟ ئەی کە مرد میراتگرانی بەشی ناکەن؟ ناچێتە ژێر چنگی کوڕو براو کەسەکانی تری؟ ئەی بۆچ خۆی بە ژیرانە تا ماوە بەکاری نەهێنی؟ خۆ ئەگەر ژن بە شوودان بە موسڵمانانە بێت مەسرەف و ئەرك و مەینەتی بەم شێوەیەی ئێستا قورس و گران نییەو نابێ.

ئاواز: ڕاست ئەکەی، بەڵام بە من بۆچ ئەڵێیت؟ من چیبکەم؟

سکاڵا: ئاخر ئاواز گیان من و تۆین ڕەواج بە بیرو ڕای کوفر ئەدەین!

دڵپاك: ئاوازخان، ئەو داوو دەزگایانەی کە ووردو درشتی ژیانی خۆرئاواو خۆرهەڵهات ئەگەیەنن، بەدایکان و باوکان، ئەی ناتوانن وەعییەکی ئیسلامی پاکیان پێ بگەیەنن، تا لە مەسەلەی هاوسەریدا بە موسڵمانانە بجوڵێنەوە، ئەوە بۆچ هەرچی یاسایەکی فەرەنسیی هەیە ئەدرێت بە گوێی موسڵماناندا؟ ئەی بۆچ ئەم یاسا بەڕێزەی پێغەمبەر ﷺ ڕەچاو نەکریٚ؟ "دينار أنفقته في سبيل الله، ودينار أنفقته على رقبة، ودينار تصدقت به على مسكين، ودينار أنفقته على أهلك، أعظمها أجرا ما أنفقته على أهلك". (رواه مسلم).

سکاڵا: دەی کەس و کارو سەرپەرشتیکەر ئەمەی بیستووە؟ چۆنی ئەزانێ؟!

دڵپاك: لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا، زانایان، خێرخوازان، ڕۆشنبیران و دەوڵەمەندانیش دەوری خۆیان لەم ڕووەوە ئەبینن، دەوڵەتیش هاوکاری ئەکات، ئیتر هەژاریی بەم پێیەی ئێستا بۆچ ئەبێتە کۆسپ لە ڕێگەی هاوسەرییدا؟

هەروەها خوێندن (کە باست کرد) بەهۆی هاوسەرییەوە هەرگیز سەکتەی لێنادرێت، بە تایبەتیی بۆ پیاو، بەڵێ، کەمی گێرەو کێشەی بۆ ئافرەت تیایە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە بیری لێ ئەکەنەوە، خۆ ئەگەر ئافرەتەکە بزانێ چۆن ئەجووڵێتەوەو ئەرکی سەرشانی خۆی بزانێ، ئەو گێروکێشەیەش سووك ئەبێت و خوێندنەکەشی بۆ ئەچێتە سەر.

توخوا با ڕاست بڕۆین و ددان بە ڕاستیدا بنێین، ئەو هەندە ئیش و کارانەی کە ئەکەونە سەرشانی ژن و مێرد، وە ئەو خەیاڵ و بیرکردنەوانەی کە هەریەك لە کوڕو کچی پێگەیشتوو ئەیانکەنەوە لە هاوسەریی، ئەو بیرو هەست شێواوییەی کە وایان لێ ئەکات خوێندن و کۆشش کردن نەچنە مێشکیانەوە، کامیان گەورەو مەترسیدارترە؟ کامیان زیاتر کۆسپە لە ڕێگە خوێندن؟

سکاڵا: بێگومان ئەمیان گەورەتر و مەترسیدارترە.

دڵپاك: ئیسلام داوای بێشەرمیی لە هیچ کەسێك ناکات، بەڵکو شەرم کردن بە بەشێك لە عەقیدەداری دا ئەنێت. بەڵام نەك هەموو شەرمێك، هەندێ شەرم کردن نەخۆشیی دەروونییەو پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە. شەرمکردنی ڕاست و پاك ئەوەیە کە بەرامبەر حەرام و تاوان بێت. کاری حەڵاڵ و ڕەوا لە ئیسلامدا شەرمی ناوێ، گوناهی تێدا نییە، پێویستی بە شەرمکردن نییە.

توخوا کوڕێك، کە بە گوێی خواو پێغەمبەر ﷺ نەکات، شەوو ڕۆژ بەدوای کاری گەندا بسوڕێتەوە، سەرو گوێلاك و شێوەی لە بەچکەی کوفر بکات. یان کچێك کە لەگەڵ ناوگەڵ لەوەڕێنەکانی خۆرئاواو خۆرهەڵهات، لەسەرو شکڵ و جل و بەرگدا هیچ جیاوازیەکی نەبێت، بەو شێوە پیسەیەوە بەلەنجەو لارو کەشخەوە لەگەڵ خێزانەکەیدا هەڵس وکەوت بکات، بەوەش خۆی بە ڕۆشنبیر بزانێت، هەموو بیرو خەیاڵێکیشی ئاوڕدانەوەی چاوچنۆکان بێت لێی، ڕاوکردنی ڕۆڵەی خەڵکی بێت، ئەو کوڕو کچە، ئەو هەموو ئیش و کارانەیان مایەی شەرم نین! کەچی ئەگەر ڕای خۆیان دەرببڕن سەبارەت بەحەزکردنیان لە هاوسەر، شەرم ئەکەن؟! ئای لەم جۆرە بەهانانە!!

سکاڵا: ئاخر ئەمەیە کە ئەڵێن "گۆشتەکەی ئەخورێ بەڵام گۆشتاوەکەی نەء"!

دڵپاك: ئیسلام، قەت داوای شەرمکردنی لەشتی حەڵاڵدا لە موسڵمانان نەکردووەو هەرگیز داواشی ناکات. هاوسەریش کارێکی ڕەوای پاکە، پێداویستییەکی فطرییە، یاسایەکی خواییە، شەرمکردنی ناوێ.

# ئیسلام دۆستی هەژاران و ڕەش و ڕووتانە

ئاواز: تۆ بڵێی خەڵك وازی لە گران مارەیی هێنا، هەڵبژاردن بەو جۆرە بوو کە باستکرد، کەس‌وکار یارمەتی پیاوی دا، خوێندنیش بە ئاسایی ڕایی کرا. بەڵام گیروگرفت تەواو نەبووەو تەاویش نابێت، بۆچ نازانێ زۆربەی خەڵك لە چینی هەژارو ڕەش و ڕووتە؟ دەرامەتی ساڵانەی هەر زۆر کزە؟ ئەی چۆن ئەو دوو هاوسەرە بژین؟ خۆت ئەزانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژیان گرانتر ئەبێت، هەر ڕۆژێ مۆدێلێ دادێت، خۆ ئەبی خانوویەکیان هەبێت، چ هی خۆیان بێ، چ بە کرێی بگرن، لەوڵاتی ئێمەدا ئەمڕۆ خانوویەکی سادە، دە، پانزە هەزار دیناری تێدەچێ، ئەمەش بۆ هەموو کەسێك پەیدا ناکرێت، ئەگەر کرێچی بن، زیاتر لە نیوەی مووچەکەی یان مووچەکەیان ئەبێ بدەن بە کرێی خانووەکەدا، ئەمانەش کۆسپی سەر ڕێگەی هاوسەرین.

دڵپاك: لە گەڵێ سەرەوە، ڕاست ئەکەست و ئەوانەش کە ئاماژەت بۆ کردن یەکێك لە کۆسپی سەر ڕێگەی هاوسەریی. بەنیسبەت داهێنانی مۆدیلەوە، نەك هەرچینی ڕەش و ڕووت فریا ناکەوێ بەڵکو چینی دەوڵەمەندانیش پیا ناگەن. دەی خۆ مۆدیل بازیش ئاوو نان نییە؟ با بەشەیدایانە دوای نەکەوین، هیچ ئەبێت؟ با لە فێڵ و تەڵەکەدا کڕیاری داهێنراوانی سەهیۆنیزم نەبین، ئایا دونیا وێران ئەبێت.

دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئیسلامیی هیچ لایەنێکی ژیانی ئادەمیزاد فەرامۆش ناکات، هەرگیز چینی ڕەش و ڕووت ناخاتە پشتگوێ و قەت نەی خستۆتە پشت گوێ. چونکە بەرنامەی خوایی بەرژەوەندی هەموو کەسێك ڕەچاو ئەکا، سەرەتای جوان و ڕێك و بنەڕەتی پتەو و بەهێزی بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان داناوە، هەرکە پەیڕەوی بکرێن و جێبەجێ بکرێن، مسۆگەر کۆمەڵگە بەبەختیاریی و کامەرانی ئەژی.

هەندێ لەو چارەسەرانە، بەکورتیی ئەمانەن:

ـ دوانەخستنی کرێی کرێکار، واتە زوو کرێکەی بدرێتێ. "أعطوا الأجير أجره قبل أن يجف عرقه". (رواه أبن ماجة والطبراني).

ـ هەر کرێکارێك کرێکەی بەپێی تواناو لێ هاتنی خۆی بێت، بەم جۆرەش ستەم لەو کرێکارە ناکرێت، ستەمکاریش سزا ئەدرێت. "ثلاثة أنا خاصمهم يوم القيامة، رجل أعطى بي ثم غدر، ورجل أستاجر أجيرا فاستوفى منه ولم يعطه أجره.. " (رواه البخاري).

ئەمەی کە گوتم، دروشمێکی ڕووتەڵی خەیاڵاوی نییەو لە ئاسمانی ئەندێشەدا بۆ خەڵك هەڵخەڵەتاندن هەڵواسرابێت، بەڵکو لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئیسلام کت و مت جێبەجێ کراوەو بەجێهێنراوە، بۆ نموونە:

جارێکیان خاوەن کارێك دێتە لای خەلیفە عومەری کوری خەتتاب، سکاڵا ئەکا لە کرێکارەکانی کە هەندێ لە سامانەکەیانی دزیوە، ئەویش داوا ئەکات لە خاوەن کارەکە ماوەیەك مۆڵەتی پێبدات، تا لە هۆی ئەو دزییە بکۆڵێتەوە، گەورەی موسڵمانان بۆی دەرکەوت کە هۆیەکەی ئەوە بووە کرێی کەمی پێداون، کرێکەیان لەگەڵ ماندووبوونەکەیان هاوسەنگ نەبووە، ئەمجا خاوەن کارەکەی بانگکردو قیژاندی بەسەریا: "ئەی دز: جارێکی تر ئەوانە دزیی بکەن، من دەستی تۆ ئەبڕم". ئەمجا داوای لێکرد کە کرێیەکەیان بۆ زۆر بکات و هاوسەنگی ماندووبوونەکەیانی بکات، تا ناچار نەبن و پەنا نەبەنە بەر دزیی و گزیکاریی کردن، خاوەن کارەکەش فەرمانەکەی بەجێهێنا [1].

ـ ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە لە ئیسلامدا کە تەئمینی ژیانی میللەت بکات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "ان الله فرض على أغنياء المسلمين في أموالهم بالقدر الذي يسع فقراءهم، ولن يجهد الفقراء اذا جاعوا وعروا الا بما يصنع أغنياءهم، الا وان الله يحاسبهم حسابا شديدا، ويعذبهم عذابا أليما". (رواه الطبراني). ئەمەش بە پێی تازەترین زاراوەی ئابوریی پیی ئەگەترێت (هاوگوزەرانیی).

[1] (عقبات الزواج: عبدالله ناصح علوان)

.. عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لەسەر بێت، بۆ هەموو لە دایك بوویێك مووچەی ئەبڕییەوە و ئەخرایە سەر مووچەکەی باوکی، ئەمەش پێی ئەگوترێ قەرەبووکردنەوە (التعويض العائلي). لەو ڕۆژگارەدا سەد پەنجایی بوو، جا فەرموو ئەو سەد پەنجاییە بەراووردی بکە لەگەڵ پارەی ئێستاداو بزانە بۆ ئەو کاتە چەند زۆر بووە![1]

.. بە پێی یاسای ئیسلام، ئەبێ موسڵمان خانوی هەبێ، ژنی هەبێ، هۆی گواستنەوەی هەبێت، ژیانی تەئمین بێت، لەوەش زیاتر قەلاچۆی هەژاری بکرێت، ئەها گەورەی موسڵمانان (عومەری بەڕێز) ئەیفەرموو: "اذا اعطيتمن فاغنوا". "كرروا الصدقة (واتە بەسەر هەژاراندا) وان راح على أحدهم مائة من الأبل"[2].

لە کاتی خەلافەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، هەموو ڕۆژێ جارچی ئەگەڕا بە ناو خەڵکدا و هاواری ئەکرد :"کێ هەژارە، لەکوێیە؟ کوان قەرزاران؟ با لە (بيت المال) پارەیان بدرێتێ".

چینی هەژاران، ڕەش و ڕووتان، نەك ئێستا بەڵکو چواردە سەدە لەمەوبەر ئیسلام لای کردەوە بەلایەوە، گرنگیی پێداوە، چارەسەری گیرو گرفتەکانی کردوە، کەرامەتی پاراستووە، مافی خۆی داوەتێ، ستەمی لێ دوورخستۆتەوە، بەڵام، چیبکەین لە بەچکە موسڵمان کە نەشارەزایی مێژوویی و نەشارەزایی یاساکانی ئیسلامی هەیەو وا ئەزانێ ئیسلام باسی هیچی نەکردووە؟!

شەکری نەدیووەو پێی ئەڵێ تاڵە     ناشزانێ قسەی پووچ و بەتاڵە

سکالاٌ: ئەی! بەخوا ئەم بەرنامە خواییە پاکەیان لێکردبووین بە دوژمن، ئەیان گووت، لە نوێژو ڕۆژوو گرتن و ئافرەت خنکاندن بەولاوە هیچی تر نییە.

ئاواز: بەڵێ، منیش ئەزانم هەرکە ئەو کۆسپانەی کە باسمان کردن (گران مارەیی، هاوشانیی، تەئمین کردنی ژیان، دوانەکەوتنی باو و نەریتی نالەباری کۆمەڵگە، نەهێلانی هەژاران و ڕەش و ڕوتان) لە ڕێگەی هاوسەریدا لابران، دیارە ئەوسا ژیانی هاوسەریی خۆش و بە تام ئەبێت، حەسانەوەو بەختیاریی تێدا ئەبێت، خەڵك واز لە ژیانی زگورتێتی ئەهێنێت، سا مەگەر ئەو جۆرە کەسانە کە ویژدانیان گەنیووە، واتای ژیان نازانن، پیس و بەرەڵلان، ئەوانەش لە ناو کۆمەڵگەدا ناوێزەو زۆڵەکن، نرخیان بۆ دانانرێت.

دڵپاك: بەڵام سێ کۆسپی زۆر گەورە هێشتا ناومان نەبردوون. بەبێ لەناوبردنی ئەو سێ کۆسپە، ناگەینە ئەنجامی ڕێك و پێك و خاوەن بەرهەم.

ئاواز: سێ کۆسپی تری گەورە؟! من هیچ کۆسپێکی ترم نایە بەبیرا!

دڵپاك: بەڵێ، سێ کۆسپی تری گەورەو گرنگ. من ئەیان خەمەو بیرت! ئارەزو تێرکردن لە ڕێگەی ناڕەواوە، تەنگ هەڵچنین بە پیاوان لەلایەن ئافرەتەوە، کزیی باوەڕو بێ تینی عەقیدە.

سکالاٌ: ئێستا شەوگار درەنگەو کاتژمێر بەرەو دە ئەڕوات، ئەزانم زۆریشمان ماندوو کردوویت، بەڵام ئەبێ بەیانی، دوای دەوام ئەم سێ حاڵەشمان بۆ شی بکەیتەوە.

دڵپاك: خوا یار بێت، باسیان ئەکەین. دەی فەرموون بخەون.

[1] (عقبات الزواج: عبدالله ناصح علوان).

[2] (عقبات الزواج: عبدالله ناصح علوان)

## ئارەزوو تێرکردن لە ڕێگەی ناڕەواوە

دڵپاك: ئەمڕۆ زۆربەی گەنج و لاوەکان، لە زۆربەی وڵاتاندا، لاناکەن بە لای ژن هێنان و شووکردنەوە، چونکە مەبەستی سەرەکییان لە هاوسەریی تێرکردنی ئارەزووە. دەی ئەم تێرکردنەشیان بە فراوانیی و ئاسانیی بۆ ئەچێتە سەر، بەڵکو بۆشیان ڕازێنراوەتەوە.

گەنج چۆن بیر لە ژن هێنان یا شوکردن ئەکاتەوە، لە کاتێکا زوڕنای شەیتان هەمیشە پیقەی دێت و بانگی ئەکات، وەرە، وەرە بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزووت، بۆ بازاڕی خۆشترین لەزەت، تۆ لەسەرەتای بەهاری تەمەنتدایت، ڕای بویرە، گەنجێتی کاتی ڕابواردنە، هەر شەوێ لە باوەشێکا تەمەنت ببەرە سەر!!

گەنج چۆن بیر لە ژنهێنان و شووکردن ئەکاتەوە، لە کاتێکا شاشەی سینەما، لەگەڵ وڵاتدا تەلەفزیۆنیش، فێری ئارەزوو بازیی و بەدڕەوشتیی ئەکات، تەنانەت فێری شێوازی چۆنیەتی ڕاوکردن و پەڕینی ئەکات؟ ئایا ئەو فلیمانە، چیرۆك و نامەکاری (دڵداریی)! وێنەی ڕووت و قووت، هاوڕێیەتیی و دۆستایەتیی، قەراغ ڕووبارەکان و جێ مەلەکان (مسابیح) کە نێرو مێ تیایانا بەشدارن، یانەکان، مەلهەکان، (..) خانەکان، ئەمانە بە جارێکا بیری ژن هێنان و شووکردن لە مێشکا ناشۆنەوە؟ ئاگری ئارەزو پەرە پێناسێنێ؟ نابنە نەوت و بەنزین بۆی؟

گەنج چۆن بیر لە ژن هێنان و شووکردن ئەکاتەوە، لە کاتێکا سەربازەکانی شەیتان ڕێگەیان پێ ئەگرن و بەرو دۆزەخی داوێن پیسی ئەیاندەنە بەرو لەو لایشەوە دەرگاوانی لەزەت پەرستیی دەیان دەرگای بۆ واز ئەکات؟

سکاڵا: ئەم باسە ئەوەم بیر ئەخاتەوە کە جارێکیان مامۆستایەکمان باسی دواکەوتنی ئەفریقییەکانی بۆ ئەکردین، ئەیگووت: گەورەترین هۆی دواکەوتنیان ئەوەیە کە ناوچەکەیان دارو درەختی خۆڕسکی زۆری بەرداری تیایە، ئاژەڵی زۆری تیایە، ئەوانیش بەری دارەکان ئەخۆن و ئاژەڵەکان ڕاو ئەکەن، بەو جۆرە خواردنیان مسۆگەرە، لەبەرئەوە هیچ هەوڵێکی تر نادەن و بەدواکەوتوویی ماوەنەتەوە، ئەم باسەو ئەو باسە زۆر لە یەك ئەچن.

دڵپاك: زۆر جوانی بۆ چوویت، بەڵێ وایە. تێرکردنی ئارەزوو لە ڕیگەی ناڕەواوە، زاناکانی کۆمەڵناسیی ، پەروەردەکردن و ڕەوشت، بە گەورەترین کۆسپی ڕێگای هاوسەریی دەژمێرن، چونکە وایان لێ ئەکات کە هەوڵی هەڵبژاردنی هاوسەرێکی حەڵاڵ نەدەن. ئەو هاوسەرەی کە ئەبێتە ئارامگەی دەروون و دایکی منداڵەکانی، پارێزگەریکەری ڕەوشتی.

گەنجان تەماشای هەر لایەك ئەکەن، ئاوڕ بە هەر لایەکا ئەدەنەوە، چەپ و ڕاست، ئەبینین ئەوەی کە ئارەزووی ئاژەڵیی داوای ئەکات لێیان، بەشێوەیەکی فروانی ڕازاوە هەیەو بە ئاسانیش دەستیان ئەکەوێت، ئەمجا لە خۆیان ئەپرسن: بۆچ ژن بێنم یا شوو بکەم؟ بۆچ بەرپرسیاریی خێزان و مناڵداریی بگرمە ئەستۆ؟ بۆچ خۆشیی ژیان لە خۆم بشێوێنم؟ بۆچ .. بۆچ؟! بەم جۆرە پشت لە هاوسەریی حەڵاڵ ئەکات، ژن ناهێنێ و شوو ناکات، خۆی ئەخاتە ناو زۆنگاوی لەزەت پەرستییەوە، ئەم خان و ئەو خان ئەگەڕێت، هەر ڕۆژەو هەر شەوێ لەباوەشی داوێن پیسێکدا ئەیباتە سەر!

سکاڵا : بەڵام ئەو دەردە سامناکە چۆن گەیشتە خاکی ئیسلام؟ کێ گەیاندی؟

دڵپاك: پرسیارەکانت ئێجگار هەستیارن، وەڵامەکانیان دوورو درێژن، بەڵام بە کورتیی پێت ئەڵێم: ئەو دەردە سامناکە سەهیۆنیزم و سەلیبییەتی جیهانیی بە هۆی شاگردە جۆر بە جۆرەکانیانەوە گەیاندنە خاکی ئیسلام و ئەوانیش بە وردیی و لە ژێر چەند دروشمێکی بریقەداردا بڵاویان کردەوە بەناو بەچکە موسڵمانانداا، ئەمانیش وایان ئەزانی و وا ئەزانن پێشکەوتن و شارستانیەت لە دوو توێی ئەو دروشمانەدایە، تا ئێستاش هەر پەییان نەبردووە بەوەی کە نێرەرانی ئەو دروشمانە، تیاچوون و لە ناوبردنی ئەمانیان تیایە!!

لە (کارل مارکس)یان پرسی، چی بکرێتە هاوجێ (البدیل)ی باوەڕ بە خوا؟ لە وەڵامدا گوتی: "شانۆ ئەکرێتە هاوجێی، بەشانۆ بیان پەشۆکێنن تا بیریان نەبێت بەسەر باوەڕ بە خواوە. ڕەنگە ئێوە نەزانن، شانۆ چەند کاریگەرە بۆ

بەگژاچوونی باوەڕ بە خواو ڕەوشتو ڕووخاندن".[1]

یەکێك لە کەڵە سەرکردەکانی داگیرکەران ئەڵێت: "پێکێكو ئافرەتێکی (...) لە تێکشکاندنی ئوممەتی موحەممەدا کاریێ ئەکەن، کە هەزار تۆپ (مدفع) نەیکەن، لە ماددە پەرستیی و هەوەس بازییدا گومی کەن"[2].

قەشە (زویمر) لە کۆنگرەی (مبشرین)دا، لە قوسدا گوتی: ئێوە لە ناو موسڵمانەکاندا، لە خۆیان، بەر (جیل)ێکی واتان پێگەیاندووە کە پەی بە پەیوەندی بوون بەخواوە نەزانێ و نەیەوێ بیزانێ.. گوێی لەشکۆو بڵندی نەبێت، حەز لە تەمەڵیی و حەسانەوە بکات، هەموو ئاواتێکی ژیانی تەنها هەوەسو ئارەزوو بازیی بێت، فێربوونی هەر بۆ ئارەزو بازیی بێت، ئەو سامانەی پەیدای ئەکات هەر بۆ هەوەس بازیی بێت، وە بەرزترین پلەو مەنسەبی لەبار ئارەزو بازی بووێت"[3].

لە یەکێك لە پرۆتۆکۆلاتەکانی حوکامی سەهیۆنیزمدا ئەمە هاتووە" پێویستە هەوڵ بدەین بۆ ڕوخاندنی ڕەوشت لە هەموو شوێنێکا تا زاڵبوونمان ئاسان بێت، فرۆید لە ئێمەیەو پەیوەندی پەڕین لە ژێر ڕۆشنایی تیشکی خۆرا ئەخاتە ڕوو، بەوەش هیچ شتێك بە پیرۆزیی، لەبەرچاوی گەنجاندا نامێنێتەوە، بەوەش گەورەترین هەوڵ و کۆششی ئەبێتە تێرکردنی ئارەزوی پەڕیینی، ئەو کاتەش ئیتر ڕەوشتی وێران ئەبێت"[4]

سکاڵا: ئەی هاوار، ئەمە گەورەترین گەردش و موئامەرەیە دژی هەموو کەسێك، دژی مرۆڤایەتیی بە تێکرا، ئەی تاکەی پەی پێنەبەین؟ ئەوە کەی ئافرەت بەرەو بەختیاری ئەبات؟ هەر لە دنیادا ئافرەت ئەخاتە ناو دۆزەخەوە، جا با شەرمەساریی قیامەتیش لەولاوە بوەستێ!!

دڵپاك: تا کاتێ کە ئیسلام حوکمی لە دەستا بوو، کە موسڵمانان سەرگەردان نەکرابوون، فەرمانەکەی پێغەمبەریان ﷺ "یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج.." بەجێ ئەهێنا، تا ئەو کاتەی کە موسڵمانان بە گشتی وەڵامی حەزو ئارەزوی خۆیانیان بە پاکیی، بەپێی سروشتی فطرەو دروشمی (لارهبانیه فی الاسلام) ئەدایەوە، بازاڕی هاوسەریی قەرەباڵغ و پڕ لە کامەرانیی و خاوەن برەو گەرم و گوڕ بوو.

تا کاتێ ئیسلام خاوەنی دەسەڵات بوو، لەناو خەڵکا بەرەڵڵایی نەبوو، داوێن پیسی و ئارەزوو بازی ، هێلانەیان لە وڵاتی ئیسلامدا نەکردبوو، ڕەگی ژەهراویان دانەکوتابوو، هاوسەرییش بێ بازاڕی بە خۆیەوە نەئەدی و عازەبیی لە ناو خەڵکدا بەنەخۆشیی ئەژمێررا.

تا کاتێ داوێن پیس بە سزای خۆی ئەگەیشت، بوختان کەر داری حەدی لێ ئەدرا، کۆمەڵگەش بە پاکیی و ڕەوشت بەرزیی ئەمایەوە، ژن هێنان و شووکردنیی زوویش (الزواج المبکر) قەڵای خۆپاراستن بوو، سەنگەری بێگەردیی کەسانو کۆمەڵگە بوو.

## تەنگ هەڵچنین بە پیاوان لە لایەن ئافرەتانەوە

ئاواز: تۆ یەکێك لەو کۆسپە زلانەی ڕێگای هاوسەریت بە (تەنگ هەڵچنین بە پیاوان لەلایەن ئافرەتانەوە)، ناوبرد! ئەمەش زۆر پێچەوانەی واقیعە، چونکە هەمیشە ئافرەت تەنگی پیچ هەڵچنراوە لەلایەن پیاوەوە، ئەمەیانت بگوتایە بەڕاست دەرئەچوو.

دڵپاك: تۆ تەنها ئەوەیانت بیستووە مامۆستا ئاواز، یەکسەر باوەڕیشت بەو قسانە کردووە، بەبێ ئەوەی بیریان لێ بکەیتەوە، چاکتر وایە ئادەمیزاد یەکسەر باوەڕ ناکات بەوەی کە ئەیبیستێ، ئەبێ بیری لێ بکاتەوە تەتەڵەی بکات،

[1] (عقبات الزواج : عبدالله ناصح علوان)
[2] (عقبات الزواج : عبدالله ناصح علوان)
[3] (هەمان سەرچاوە پێشوو)
[4] (هەمان سەرچاوەی پێشوو)

بیدات لە لەنگەریی، هەتا ڕاستیی و چەوتیی بۆ ساغ ببێتەوە، چاك و خراپ لەیەكتر جیابكاتەوە.

ئێمە ئەمڕۆ ئەبینین و ئەبیستین، لەزۆربەی جیهاندا، ئافرەت لەناو ماڵ هاتۆتەدەرەوەو هێنراوەتە ناو دەزگاو دائیرەو كارگەو بوارە جۆر بە جۆرەكانی ترەوە، كاری پێ ئەكرێت و ئیش ئەكات، لە كاتێكا ملیۆنەها گەنجی خوێندەوارو نەخوێندەواری بازوو بەهێزی، ناوشان پانی، ئازاو بەكارو بە بەتاڵیی و بێكاریی ئەسوڕێتەوە، پاش ئەوەی كە بە دوای ئیش و كاردا زۆر سووڕاوەتەوەو دەستی نەكەوتووە، ئیتر بێ هیوایی دایگرتووە، پاڵی لێداوەتەوە، لەناو كۆمەڵگەدا وا هەست ئەكات كە زەلیل و دەست بەستراوە، لە پەراوێزی ژیاندایە نەك لەناو گوڵزاری ژیاندا، لەبەرئەوەشە كە بەرچاوی تاریكە، دڵ و دەروونی پڕ لە ڕق و پەستییە بەرامبەر بە كۆمەڵگە (دیارە ناهەقیشی نییە)، ئیتر ئەو گەنجە بەسەزمانە كەی بیر لە ژن هینان ئەكاتەوە؟ چۆن دڵی لێ ئەدات بۆی؟ ئەگەر حەزیشی لێ بكات، ئایا ئەتوانێ پێداویستی ڕێك بخات؟ ئایا كۆمەڵگەش بەزەیی بەو گەنجەدا دێتەوە؟ كە ئەو نەتوانێ ژن بهێنێ، ئەی كچ شوو بە كێ بكات؟ دەی ئەوە هەمووی تەنگ پێ هەڵچنین نییە؟ تاوانی ئافرەتی تێدا نییە؟

ئاواز: دڵپاك تۆ شتی سەیر سەیر ئەڵێیت، ڕێگە لە ئادەمیزاد ئەگری!

سكاڵا: ئەوەی خوشكە دڵپاك ئەیڵێت، هیچ سەیر نییە، بەڵكو واقیعێكی زۆر ڕوونەو هەموومان تیایا ئەژین، ئافرەت شوێنی كاركردنی لە پیاو بڕیووە. سەیر لەوەدایە، كۆمەڵگەش هانی ئافرەت ئەدات و فەزڵیشی ئەدات بەسەر پیاودا، لە هەر كارێكدا كە بۆی ئەڕوات!!

دڵپاك: لە سەرێكی تریشەوە، دەست خستنەناو ئیش و كاری هاوسەرییەوە لە لایەن ئافرەتەوە، گرێ كوێرە دروست ئەكات، ئەبێتە هۆی پەك كەوتن و هەڵوەشاندنەوەی دەسگیراندارییو كشانە دواوەی پیاو لە مەسەلەكە.

بێگومان ئافرەت بە سروشت سۆزاوییە، زوو هەڵ ئەچێت، ڕواڵەت و زوق و برق زوو سەرنج و دڵی ڕائەكێشن، حەزی زۆر لە جوانییە، زیاتر پەیڕەوی باوو نەریت ئەكات نەك یاساو بەرژەوەندی كەسانی تر. لەبەر ئەوەش دەسگیراندارییی لەگەڵیا زۆر زەحمەتە، ڕازیكردنی دڵی لە كاتی گواستنەوەدا زۆر گرانە. سا مەگەر ئافرەتێكی موسڵمانی ژیری پێگەیشتوو كە كاروبار بە تەرازوی شەرع بكێشی و شت بە پێوەری ژیریی بپێوێ.

لێرەدا تەنها مەبەستمان شوو كەرەكە نییە، نەخێر.. بەڵكو دایكی، نەنكی، خوشكانی و برا ژنانی، پووران و خاڵۆژنان و مامۆ ژنانی، هەریەكەیان ئەبێ ڕای خۆی دەربڕێت، قسەی خۆی بكات، بەزەو بەهانەیەكی تازە دروست بكات، سەدان مارە تۆپیو بخەنە سەر ڕێگەی ئەو ئافرەتە شووكەرە، سەیرە! شووكەرەكە دانەیەكە، كەچی كوێخاكانی دەیان دانەن! مەسەلەكە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەوەوە هەیە، كەچی ئەمان ئەبنە داواكارو بەهانە ئەگرن! ئیتر بیر ناكەنەوە لەوەی كە ڕەنگە زاوای هەژار توانای بەجێهێنانی هەموو فەرمان و داوایەكی نەبێت. لەوانەیە نەتوانێ داواكانیان هەڵسوڕێنێ و واز لە ژن هێنانەكە بهێنێ.

با بێینەوە بۆ لای ماڵی زاوا، ئەمیش و دایكی و خوشكانی و ..و .. هتد، هەریەكەیان ئافرەتێ هەڵ ئەبژێری بۆی، هەریەكەیان ئەیەوێ قسەی خۆی بچێتە سەر، هەریەكەیان هەندێ سیفاتی بەدڵە لەو ئافرەتەدا. هەروەك ئەوەی ژن بۆ ئەوان بهێنرێت نەك زاوا! ئایا ئەم دەست خستنە ناوەوە (التدخل) كۆسپ نییە لە ڕێگەی هاوسەریدا؟

ئای چەند دەستگیراندار بە هۆی ئەوەوە گوڵی هیوای دڵی هەڵوەری! پەپولەی نازی پەڕو باڵی سووتا! ئای چەند ژن هێنان و شووكردن لە كاتی تەواو بوونیاندا، بەهۆی بێ عەقڵی و دەست خستنە ناوەوەی هەندێ ئافرەتەوە بەبێ سەلیقەیی، هەڵوەشانەوەو پەكیان كەوت! لەوەش زیاتر ناكۆكیی و دوژمنایەتیی كەوتە نێوان دوو خێزانەوە، یاخۆ دوو تیرەوە، دەی ئەوە كۆسپ نییە؟

ئاواز: ئەوەی كە گوتت هەمووی ڕاستە، بەڵام چار چییە؟

دڵپاك: چۆن چار چییە؟ خۆ ئەمڕۆ بەشی زۆری ئافرەتان خوێندەوارن، وە خۆیشیان بە ڕۆشنبیرو زاناو سەربەست ئەزانن، خۆیان بە شیاوی یەكسانیی ئەزانن لەگەڵ پیاودا، لەگەڵ سەری ژیانەوە هەنگاوی زل و قەڵەویان ناوە، دەی خۆ

هەنگاوی هاوسەری پاك و ڕەواو زۆر گرنگە، ئەی بۆچ نەنرێت؟ تاكەی لەسەر هەڵەكاریی بڕۆین؟ بۆچ ئافرەت نەیەتە دەنگ و ڕای خۆی دەرنەبڕێت؟

سكاڵا: ئاخر چۆن خوشكە دڵپاك؟ ئافرەت چی بكات .. چی؟!

دڵپاك: چاوەكەم، ئافرەت كە خوازبێنی كەری هات، دوو شت هەن كە ئەتوانی بیانكات، بیگومان یان ئەو خوازبێنی كەرەی بەدڵ نییە یان بەدڵیەتی. جا ئەگەر بەدڵی نەبوو، ئەتوانێ بیداتە دواوە، بەمەش بەكورتیی ئەبڕێتەوە، خۆ ئەگەر بەدڵی بوو، ئیتر هەق نییە بڕو بەهانەی لێبگرێت و هەوڵی ڕووتانەوە وەرس كردنی بدات. هەروەها ئەتوانێ بە ئافرەتە خزمەكانی بڵێ: ئەگەر خوازبێنی كەرەكەم بە خراپ ئەزانن، بۆچ ئەمدەن پێی؟ ئەگەر بە چاكیشی ئەازنن و ئەمدەن پێی، نامەوێ بڕو بەهانەی لێ بگرن، خۆ گەر بێتو بەگوێم نەكەن من ئەو شووە ناكەم.

ئاواز: بە خوا ئەم گرێ كوێرەیە كرانەوەی نییەو هەر ئەمێنێتەوە!

دڵپاك: نەخێر وانییە مامۆستا ئاواز، لە ئیسلامدا هیچ شتسێك بە گرێ كوێرە دانانرێت، چونكە بۆ هەموو دەردێك دەمانێكی تایبەتیی نواندوە.

كاتێ خوازبێنی كەری شیاو هات، كچەكەش پێی ڕازیبوو، ئەو كاتە سەرپەرشتی كەر (ولی أمر)ەكەی، بۆی هەیە گوێنەگرێ لە قسەی هیچ ئافرەتێك لە داواكاریی و بڕو بەهانەیاندا، تەنانەت ژنەكە كە كچەكەیشی شوو ئەكات. مادام خوازبێنی كەرەكەی شیاوی بێ و شووكەرەكەش ڕازی بێ پێی، ئیتر بڕو بەهانوو یانی چی؟ كە هاتوو پیاوەكە بەپێی تواناى خۆی شتی بۆ كڕی و بۆی سەند و مارەیی پێدا، ئیتر ئەیەوێ چی لێبكات؟

ئاواز: بەڵام دایك مافی قسەكردنی هەیە. دایك لە باوك زیاتر ماندوو ئەبێت لەگەڵ منداڵیدا، چۆن ئەبێت قسەی نەخوات؟ كەواتە ئیسلام هیچ نرخێك بۆ ڕای ئافرەت دانانێت.

## ڕای بەكەڵكی ئافرەت بەڕێزە

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، هێرشی نارەوا، بەگۆترەو كوێرانە، پیشەی مرۆڤی ژیرو ڕۆشنبیرو سەربەست نییە، هەمیشە قسەكانت ڕەخنە بازیی و هێرشی كت و پڕی بێ تان و پۆیان لێ ئەتكێت، ئەمەش هەرگیز لەگەڵ گیان و ڕێبازی ژیر بێژیی و زانیاریدا ڕێك ناكەوێت.

تۆ ئەڵێیت: "كەواتە ئیسلام هیچ نرخێك بۆ ڕای ئافرەت دانانێت". ئەم قسەیەش پێچەوانەی ڕاستیە، چونكە بەڵگەت بەدەستەوە نییە، نا شارەزای لە ئیسلام، ئیتر قسەكەت بە ڕاست دەرناچێت.

ئاواز: بۆچ بەڵگەم نییە؟ تۆ گوتت سەرپەرشتی كەر لە ئیسلامدا بۆی هەیە كە گوێ بۆ قسەی هیچ ئافرەتێك نەگرێت! ئەی تۆ بەڵگەت چییە دڵپاك؟

دڵپاك: پەنا بە خوا! خێرا قسەكەمت هەڵگەڕاندەوە! من گووتم، هەر كاتی خوازبینی كەری شیاو هاتە خوازبێنیی و كچەكەش پێی ڕازی بوو، ئەوسا ئەمجا سەرپەرشتی كەر بۆی هەیە گوێ لە قسەی هیچ ئافرەتێك نەگرێت، لە داواكاریی و بڕوبەهانەدا. دەی ئەمەش بەرژەوەندی ئافرەتی تێدایە!

بەڵگەی من زۆر لەوە زیاترە كە بە ئاسانیی بژمێررێن، بەڵام بۆ نموونە: خوای گەورە خۆی، ئەو خوایەی كە پەروەردگاری هەموو كەس و هەمو شتێكە، ترخی بۆ ڕای ئافرەت داناوە، لە ناسكترین هەڵوێستا ڕای پەسەند كردوە، لە دەمەقاڵێ و گفتوگۆكردنی ئافرەتدا، لەگەڵ بەڕێزترین ئادەمیزددا، لەگەڵ سەرداری پێغەمبەراندا موحەممەد ﷺ، گوێی لە ڕای گرتووەو بیستوویەتی و ڕاكەی ئافرەتەكەشی پەسەند كردووە و كردوویەتی بە یاسایەكی گشتیی بۆ هەموو موسڵمانان لە هەموو سەردەمێكدا.

خەولەی كچی مالكی كوڕی سەعلەبە، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، و كەوتە دەمەقاڵێ كردن (المجادلە) لەگەڵیاو

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، (أوس بن صامت) مارەی کردن لە کاتێکا گەنج و پێکەوتوو بووم، ئێستا کە تەمەنم لەدەست دەرچووەو سکم چرچ و لۆچی تێکەوتووە، کردوومی بەندەیەکی خۆی (چونکە پێی گوتبوو "أنت كظهر أمي" بەوەش لێی حەرام ئەبوو، بەڵام تەڵاقیشی نەئەکەوت).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەبارەت بەم گیروگرفتەی تۆ هیچم لا نییە (تا ئەو کاتە حوکمی ظهار نەهاتبوو) خەولەش لەسەر دەمەقاڵەکەی ڕۆیشت و گووتی: "منداڵی بچووکم هەیە لێی، ئەگەر ئەو بیانباتە لای خۆی تیائەچن، ئەگەر منیش بیانبەمە لای خۆم برسیان ئەبێ". دواجار کە زانی چارەی دەست نەکەوت سکاڵای خۆی بەبێ واستە کاری گەیاندە لای پەروەردگار،"اللهم انی اشك اليك".

خوای گەورە یەکسەر سکاڵاکەی بیست و وەڵامی دایەوە، ڕێزی ڕاکەی گرت و یاسایەکی بۆ دیاریکردن لە پیناو ئەو ئافرەتەدا ئاسمان دەستی خستە ناو زەوییەوە، بڕیاری خوایی بە پەلە گەیشتە سەر زەوی، "قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ . الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَراً مِّنَ الْقَوْلِ وَزُوراً وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ"[1]. (المجادلة :1، 2 ).

دەی ئیتر گوناه نییە کە بە کوێرانە بگوترێ ئیسلام ڕێزی ئافرەت ناگرێ؟

سکاڵا: ئەی هاوار هەی! ئەم یاسا جوانە خواییە چۆن لە ئافرەتان شاراوەتەوە؟!

دڵپاك: دوو ڕووداوەکەی (خەنسای کچی خەدام) و کچەکەی تر کە باوکی دابووی بە شووی زۆرە ملیی، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بۆم باسکردن، لە بیرتانن و پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکەن، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ، مارە بڕینەکەی خەنسای هەڵوەشاندەوەو کچەکەی تریشی کردە سەرپشك (مخير) لە مارە بڕینەکەدا، ئەوەش کرا بە یاسایەکی گشتیی بۆ موسڵمانان. دەی ئیتر چۆن ئیسلام نرخی بۆ ڕای ئافرەت دانەناوە؟ ئیمام ئەحمەدو ئەبوو داوود ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "آمروا النساء (أی استشيروهن) في بناتهن"[2] ئیتر کەی ڕەوایە کە تۆو هاوچەشنانی تۆ ئەو هێرشانە بکەنە سەر ئیسلام ماموٚستا ئاواز؟

لەوەش گەورەو گرنگتر، لەکاروباری ئاییندا، لە ڕامیاریی ئیسلامدا، پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا ڕاوێژی ئەکرد، لە کاتی مۆرکردنی پەیمانی حودەیبییەدا، ئەوەبوو موسڵمانەکان ئەو مۆرکردنەیان پێناخۆش بوو، بەڕادەیەك فەرمانەکەی پێغەمبەریان زۆر بە سستی بەجێهێنا، خاتوو (أم سەلەمە)ی خێزانی پێی گووت کە پێغەمبەر ﷺ، خۆی لە خۆیەوە دەست پێبکات، ئەویش بە گوێی کردو گرێیەکەش کرایەوە، ئایا نرخ دانان بۆ ڕای ئافرەت لەوە گرنگتر ئەبێت.[3]

گەورەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب، ڕەزای خوای لەسەر بێت، چووە سەر دوانگەو ووتاری خوێندەوەو داوای کرد کە گران مارەیی نەکرێت، کەچی کاتی لە دوانگە هاتەخوارەوە ئافرەتێك ڕێگای پێگرت و گوتی: "تۆ چۆن شتی وا ئەڵێیت؟ ئەی نەت بیستووە کە خوا ئەفەرمووێ: "آتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً"؟! عومەر فەرمووی: "اللهم عفوا، كل الناس أفقه من عمر". ئەمجا سەرکەوتەوە سەر دوانگەکەو فەرمووی: "بێگومان من نەهیم لێکردن سەبارەت بە گران مارەیی، کە لە چوارسەد درهەم زیاتر نەسەنرێت، هەر کەسێ کە حەز ئەکات سامانی خۆی ببەخشێ، با بیبەخشێ". (رواه سعيد بن منصور و أبو يعلى بسند جيد). لەوەش گرنگتر فەرمووی: "أصابت أمراة و رجل أخطا". ئافرەتێك ڕاستیی پێکاو پیاوێك کە (عومەر)ە هەڵەی کرد".

ئاه .. ئاه!! خوشکە شیرینەکەم، ئەوەی کە ئیسلام کردوویەتی بۆ ئافرەت وێنەی و هاوتای هەرگیز نابێتەوە، بە ڕاستیی ئیسلام ئافرەتی لە ناخی زەوییەوە بەرزکردەوە بۆ چڵەپۆپە، گیانێکی نوێی کرد بە بەریان هاوسەنگی پیاوی

[1] (رواه ابوداود في سننه)

[2] (فقه السنه: السيدا سابق وعقبات الزواج : عبدالله علوان)

[3] (فقه السنه: السيد سابق و عقبات الزواج : عبدالله علوان)

کرد، زیندوویی کردەوە، وەها چاوو مێشکی کردەوە کە بتوانێ لەسەر رێگای عومەردا بوەستێ، عومەر سەلامی لێ بکات. ئەویش پاش سەندنەوەی سەلام، بێ ترس پێی بڵێت: "ئەی هاوار عومەر.. لەبیرمە کە پێیان ئەگوتیت عومەر لە، بە گۆچانێکەوە لە بازاڕی عکاظ دا مەڕت ئەلەوەڕاند، ڕۆژگار زۆری نەخایاند تا بە عومەر بانگ کرایت.. ئەمجا ڕۆژگار زۆری نەخایاند، پێان گوتی گەورەی موسڵمانان! سەبارەت بەژێر دەستە لە خوا بترسە.." .[1]

سکاڵا: دا با بگەڕێین بە سەرانسەری جیهانی سەدەی بیستەمدا، سەدەی مووشەك و کەشتی ئاسمانیی و ئەلەکترۆن و ئەتۆمدا، سەدەی بە ناو سەربەستیی و ئازادییدا، بزانین ئافرەتێکی ڕووتەڵی چینی چەوساوە، ئەتوانێ ئا بەو جۆرە لەگەڵ کاربەدەستێکا، نەك سەرەك کۆمارێکا، بدوێت و ڕای خۆی دەربڕێت لە ڕامیاریی گشتیی دەوڵەتدا؟ تو خوا تاوان نییە کە ئافرەت خۆی نەخاتەوە ژێر سایەی بەرنامەی خوا؟ حەیف نییە گوێ بگرێ لە ناحەزانی خوا مرۆڤایەتیی و پڕو پاگەندە بکات دژی پاك ترین ئایین؟

ئاواز: ئەی بۆچ ئەم جۆرە باسانە لەمەوبەر باس نەئەکران تا خەڵکیش لە ئیسلام نەسڵمێتەوەو سەرگەردان نەبێت؟

دڵپاك: ڕابرووردو ڕۆیشت و بڕایەوە. باباسی ئێستا و داهاتوو بکەین.

## کزیی باوەڕو بێ تینی عەقیدە

سکاڵا: نازانم لە یادت ماوە کە گوتت، کزیی باوەڕ و بێ تینیی عەقیدەش یەکێکن لە کۆسپە گەورەکانی سەر ڕێگەی هاوسەریی؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، زۆر چاك لە یادمە، بەڕاستیی ئەمەیان دایکی ئەوانی ترە، سەرچاوەی هەموو تاوان و گیروگرفتێکە لە هەموو ڕۆژگارو کاتێکا ئادەمیزاد لە هەر شوێن و هەر کاتێکدا، کە باوەڕو عەقیدەی بە خوا کزو بێ تین بوون شۆڵەیان لە دڵدا کوژایەوە، ئیتر هەست و فام و ئاوەزی گێژو شێواوی گوم ئەبن، هەوسارو جڵەوی ڕەفتارو گوفتاری لەدەست ژیری خۆیی ئەسەنرێن و ئەدرێنە دەستی ئارەزووی. ئەوسا هەروەك ئاژەڵ گەردن کەچی ئارەزووی ئەبێت، بەهەر لایەکدا جڵەوی ڕابکێشێ، ئەمیش دوای ئەکەوێ، تا بە تەواوەتیی ویست و سەربەستی لێ ئەسێنێت. دیارە ئارەزووش هەرگیز لە سنورێکدا ناوەستی، تا بدەی بە دەمیەوە ئەو زیاتری ئەوێت. خۆ هەر کاتێ ئارەزو جادەی بۆ تەخت کراو ئەوەی حەزی لێ ئەکات لەبەردەمیا ڕازایەوە، دیارە کڵپەو بڵێسەی ئاگری زیاتر پەرە ئەسێنێت.

جا وەك ئەزانین ، ئەمڕۆ جادەی ئارەزوو بازیی ڕازێنراوەتەوە، زۆر هونەری تێدا بەکارهێنراوە، زۆربەی بەشی ڕووی سەرزەوی پڕ کراوە لە هۆی هەوەس و ئارەزو بازیی، لە هەمان کاتیشدا، لە هەموو لایەکەوە، دوژمنانی باوەڕ بە خوا، بەهەموو هۆیەکی کۆن و تازەوە خەریکی ڕووخاندنی قەڵای باوەڕن، خەریکی لە ڕەگ دەرهێنانی داری عەقیدەن.

ئاواز: بەڵام ئەم باسە پەیوەندی نییە بەمەسەلەی هاوسەرێتییەوە!

دڵپاك: بەپێچەوانەی قسەکەتەوە، هۆی سەرەکیی لەو مەسەلەیدا ئەمەیانە. گەنجان، چ نێرو چ مێ، چۆن بیر لە هاوسەریی ئەکەنەوە لە کاتێکا کە هۆی تێرکردنی ئارەزووی پەرینییان زۆر بە ئاسانیی و فراوانیی دەست ئەکەوێت، یاسا قەدەغەی ناکات لێیان، لە هەمان کاتیشدا باوەڕو عەقیدەیان لەدڵ و مێشك و ویژدان یان مرێنراوە یاخۆ کز و بێ تین کراوە؟

کەسێك کە لە باوەڕ بە خوا، بە زیندوو بوونەوەو موحاسەبەکردن و پاداش و سزا و تۆڵە سەندن، ئاوەڕووت کرابێ، یان باوەڕەکەی لەق و لۆق و ساردو سڕ کرابێت، ژیریی و بیری ئارەزوو زاڵ بوو بێت بەسەریاندا، کەی لە ڕەواو ناڕەواو پاك و پیس و سوودمەندو زیانبەخشی ئەپرسێتەوە؟ چۆن بەتەنگ شەرم و حەیاو ئابڕووەوە دێ؟ کەی گوێ بە هاوسەریی

[1] کلمات مضیئة مهداة الی المرأة ـ القسم الأول ـ ناجی نجار.

ئەدات؟ ئەی ئەو ئارەزووی خۆی بەمسۆگەری بۆ تێر ناکرێت؟ ئیتر چییەتی و چیداوە لە سەرێشەو ماڵ پێکەوە نانو هاوسەر پەیدا کردنو خێزانداریی و منداڵ پەروەدرە کردن؟ خۆ یاسا داتاشراوەکانیش لاقەی ناکەن؟

بەڵام، گەنجی خاوەن باوەڕ، کاتێ هەر بە منداڵیی بە موسڵمانانە لەسەر باوەڕ بوون بە خوا لەسەر لە خوا ترسان، زیندووبوونەوەو بەهەشتو دۆزەخ، لەسەر حەیاو شەرەف پەروەردە کرا، تێ گەیەنرا کە خوای پەروەردگارو بینەر و بیسەر، هەمیشە ئەیبینێو گوێی لە هەموو قسەو گوفتارێکی هەیە، لە دەروونو ویژدانیدا داری لە خواترسانو هەستکردن بە بەرپرسیاریی گەلاًی کرد، بێگومان ئادەمیزادێکی ڕێکو پێکو ئاساییو خاوەن هەستو فام ئارەزووی لێدەر ئەچێت. ئەوسا نابێتە پیاوی ئارەزوو، نابێتە کچی هەوەسی کوێرانە. ژیریی و فامی لەدەست ناسەنرێت، هەست بە ئادەمیزادێتی خۆی ئەکات.[1]

ئەو کاتە ئەگەر کەسێکی تری جوان یان خاوەن پلەو سامان، بۆنی داوێن پیسی دا بە لووتیا، ئەو پێی ئەڵێت (معاذ الله)، (أنی أخاف رب العالمین)، ئەگەر شەیتان چووە بن کڵیشی، هەر خۆی بە خۆی ئەڵێت: "لیس لك علي سلطان". ئەگەر هاوڕێی بەدکار ڕێگەی خراپکاری بۆ ڕازاندەوە، ئەو ئەڵێت:" لا أبتغی الجاهیلین".

دیارە، هەر کاتێ گەنجان بەو جۆرە پێگەیەنران، ئیتر نزیکی ئارەزو بازیی و داوێن پیسی ناکەونەوە، ئارەزوی سروشتی خۆیان لە ڕێگەی نارەواوە تێر ناکەن، خۆ ئاشکرایە ئەو ئارەزووەش پشت گوێ ناخری لە ئیسلامدا، بەڵکو ئەبێ تێر بکرێت. جا کە لە ڕێگەی نارەواوە لێی یاساغ بکرێت، دیارە ئەبێ گەنج و ناگەنج پەنا بەرنە بەر ڕێگەی ڕەوا، ئەویش برتییە لە ژن هێنان و شووکردن، ئایا بەوەش بازاڕی هاوسەریی ڕەواج پەیدا ناکات؟

سکالاً: زۆر ڕاستە، ئێستا تێگەیشتم، خۆزگە هەموو گەنجێك ، بە تایبەتیی چینی ئافرەت ئەم ڕاستییەی ئەزانیو پەیڕەوی ئەکرد!

دەرمان، خۆگرتنە بە بەرزیی

ئاواز: باوەڕم بە ڕاستییو کەڵکی باسەکانت هەیە دڵپاك، بەڵام وەك ئەزانی ئێستا پەروەردەکردن بە گشتیی موسڵمانانە نییە، ڕێگەی نارەواش زۆرو فراوانە، هی واش هەیە هاوسەریی بۆ دەست نادات، ئەی چی بکات؟

دڵپاك: پرسیارەکەت جوانو بەجێیە. بەڵام پەروەردە کردن لە سەر یاساو بەرنامەی ئیسلامیی، ئەگەر بەگشتیی نەکرێت خۆ هەرکەسێ کە بیەوێت ئەتوانێ بە تاك تاك پەنای پێ بەرێت، واتە بۆ تایبەتی سەرئەگرێ ، ئایا من، ئەمو ئەو، دەستمان بەستراوە؟

ئەوانەش کە ئێستا هاوسەریی دەست نادات بۆیان، مەرج نییە کە تا کۆتایی ژیانیان هەروا بە بێ هاوسەر بمێننەوە، واتە بێ هاوسەرییەکەیان هەمیشەیی نییەو نابێت، بەڵکو کاتییە. جا تۆ پرسیت، ئەو جۆرە کەسانە چیبکەن؟ منیش لە وەڵامدا ئەو دەرمانەت ئەخەمە بیر کە پێغەمبەر ﷺ نواندوویەتی: ومن لم یستطیع فعلیه بالصوم فانه وجاء له". رواه الجماعة. چونکە ڕۆژوو تیغێکەو پەتی هەوەسو ئارەزوو ئەبریتو ئادەمیزاد ناخاتە گێژی هەوەس بازییەوە. ئەمجا لەو دەرمانەش فرواناترو گرنگتر، ئەم دەرمانە خوایەیە، کە لە یاسای ژمارە (33) سوورەتی (النور) دایە:"وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ..".

ئاواز: بەڵام دڵپاك گیان، ئەوەش کارێکی سووكو ئاسان نییە!

دڵپاك: منیش ناڵێم کارێکی سوکو ئاسانە، هەروەها ئەو دەرمانە دادی ئادەمیزادی ناموسڵمان نادات. بەڵکو بۆ موسڵمان دەست نیشان کراوە. موسڵمانێك کە باوەرداریێکی دامەزراو بێت. لە خوا بترسێ. پەیرەوی بەرنامەی خوا بکات، چاوەڕوانی پاداشو سزا بکات. ئەو کاتە ئەو موسڵمانە هێزی باوەڕەکەی ئەتوانێ وای لێ بکات کە خۆی بە بێ گەرد گرتن بەلاوە ئاسان بێت نەك قورس. تۆیش ئەزانی کە ئیسلام بۆ موسڵمانانە نەك بۆ ناموسڵمان. دەی

[1] بۆ زیاتر شارەزابوون لە کۆسپەکانی ڕێگەی هاوسەرێتی) تەماشای (عقبات الزواج)ی عبدالله علوان بکە.

جێبەجێکردنی ئیسلام، ئاشکرایە بۆ ناموسڵمان قورس و زەحمەتە. چونکە باوەڕی پێی نییە.

ئادەمیزادی ژیر ئەو کەسەیە کە ئەهوەنترین شەر هەڵبژێرێ، هەر کە هاتوو شەڕ یەخەی پێگرت، باشە تۆ ئەگەر پەنجەیەکت (خوا نەکردە) نەخۆش بکەوێ، پزیشك پێت بڵێ ئەگەر نەبڕڕێت دەردەکەی تەشەنە ئەکات بۆ هەموو لەشت، چی ئەکەی؟

سکالآ: دڵنیام دەستی پزیشکەکە، ماچ دەکات و داوای برینی پەنجەکەی بەپەلە لێ ئەکات، وانییە مامۆستا ئاواز؟

ئاواز: وایە. ئادەمیزاد پەنجەیەکی نەمینێ چاکترە تا قۆڵێکی ببڕن.

دڵپاك: ئەی سەد ڕەحمەتی خوا لە گیانی پاکی مامۆستا (علی طنطاوی) کە بە نموونەیەکی جوان، لەم ڕووەوە دەرسمان ئەدات و ئەفەرموێ: خۆ کتری ئاو گەرمکردنت دیوە، کە لەسەر ئاگر دێتە کوڵ، ئەگەر بێتو سەرەکەی بە توندی دابخەیت و ئاگری بدەیت، هەڵمە دەرنەچووەکەی ئەیتەقێنی. ئەگەر کونی تێ بکەیت ئاوەکەی ئەڕژێ و ئەبێ بەهەڵم و لە ئەنجاما کترییەکە ئەسوتێ. بەڵام ئەگەر لولەیەکی پێوە پەیوەند بکەیت، ئەو هەڵمە کەڵکی ئەبێت و لەوانەیە کارگەیەك (با بچکۆلەش بێت) بخاتە ئیش و گەلێ کاری سەرسورهێنەرت بۆ ڕاپەڕێنێ.

جا حاڵەتی یەکەم وەك حاڵەتی ئەو کەسانەیە کە ئارەزووی خۆیان بەند ئەکەن، بەڵام زۆر بیری لێ ئەکەنەوە و لە خەیاڵیان دەرناچێت.

دووەمیان وەك حاڵی ئەو کەسانەیە کە ڕێگەی سەرگەردانی ئەگرنە بەر و ئەکەونە زۆنگاوی لەزەت چەشتنی ناڕەواوە.

سێهەمیشیان وەك حاڵی ئەو باوەڕدارانە وایە کە ڕێگەی خۆ بە بەزەیی گرتن (التسامی) ئەگرنە بەر.

خۆ بە بەزەیی گرتن ئەوەیە کە بە هۆی تێکۆشانێکی گیانیی یان عەقڵیی یان دڵی یاخۆ لاشەییەوە ئادەمیزاد هەناسەیەك بداتە دەرەوە، بەو هەناسەیە ئەو هێزە پاشەکەوت کراوە، ئەو وزە بەندکراوە کە لە لەشیا هەیە، بەشێکی خەرج بکرێت و لابرێت. ئەمەش بە خواپەرستیی، کارکردنی خاوەن بەرهەم، بەهونەری جوانی ڕەوا کە وەلآمدانەوەی ئەو ئارەزووە دەربڕێ، بەوەرزش کردن و .. هتد دێتە دی"[1].

سکالآ: بەڵێ، باوەڕم هەیە بەوەی کە ئەوە دەرمانێکی چاك و کاریگەرە، ئادەمیزاد بەبەدەستهێنانی سەرکەوتن لە یەکێك لەو بوارانەدا، لەزەتێکی وای دەست ئەکەوێ کە چەند قاتی لەزەتی جنسیی بێت.

[1] عقبات الزواج : عبدالله علوان.

# بەشی نۆیەم

## ناندان و ئاهەنگگێڕان لە کاتی ژن هێناندا

ئاواز: بە پێی باسەکان، کاتی ئەوە هاتووە کە بووك بگوازرێتەوە.

دڵپاك: بەڵام من مامۆستا سکاڵا بە بیر پەشۆکاو دەکەوێتە بەرچاوم، هەروەك گیری بەدەست تەنگ و چەڵەمەیەکەوە خواردبێت وەهایە!

سکاڵا: بە ڕاستیی وایە کە گوتت، مەسەلەی ژن هێنان و شووکردن لە ئیسلامدا زۆر جوان و ڕێك و پێکە، لەسەر بنەرەتێکی ڕاستی بەهێز دائەمەزرێ، هەموو لایەنەکانی زۆر بە وورده‌کارییەوە ڕەچاو کردووە.

بەڵام شایی کردن لە کاتی بووك گواستنەوەدا، کارێکی خۆشە، ئامادەبوونی خزم و خوێش و دۆست و برادەر لەو کاتەدا، ئاهەنگ گێڕان و شادیی نواندن، ئەمانە هەموویان موناسەبەتەکە جوانتر ئەکەن، ڕەنگە ئەم جۆرە شتانەش لە ئیسلامدا ناڕەوابن، منیش بیرم بەمەوە پەشۆکاوە!

دڵپاك: نا.. نا، خەمت نەبێت خوشکە سکاڵا، لەوە مەترسە. ان شاء الله کە شووت کرد جوانترین ئاهەنگت بۆ ساز ئەکەین، حەز ئەکەی خەڵکی شار هەمووی بە جارێکدا بانگ ئەکەین.

چاوەکەم، ئیسلام بەرنامەی خوایە، خوایش بە نهێنییەکانی دڵی ئادەمیزاد زاناو شارەزایە. ئەزانێت کە ئادەمیزاد هەروەك خەم و پەستیی ڕوی تێ ئەکەن، ئەبێ شادیو خۆشیش ڕووی تێبکەن. ئەزانێت کە ئادەمیزاد حەزی لە شادمانیی و بەختیارییە، جا هەروەك ژن هێنان و شووکردن بەختیاربوون لە سایەیاندا ڕەوایە، هەر بەو جۆرەش شایی و ئاهەنگ گێڕان ڕەوان، بەو مەرجە کە لە سنووری پاکیی نەچنە دەرەوەو لە چوارچێوەی یاساکانی ئیسلام لانەدەن.

بەڵێ، بووك گواستنەوە موناسەبەتێکی خۆش و کارێکی پاك و ڕەوایەو هەست بزوێنە، شتێکی سروشتی و عادەتییە کە کەس وکارو یارو یاوەری تێدا کۆئەبێتەوە، جا هەر خۆی لە خۆیا پێویست ئەکات کە خواردن و خواردنەوەی خۆش و بە تامی بۆ ئامادە بکرێت. ئەی ئەوانەی کە ئامادە ئەبن. میوانی خاوەن شاییەکە نین؟ دەی خۆ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمویٚ: "من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیکرم ضیفه..". بەڵام بەو مەرجەی کە خواردن و خواردنەوەکە حەڵاڵ بن.

ئاواز: خۆ ئەڵێن، لە ئیسلامدا دوو کەس قۆڵی بوکەکە ئەگرن و کپ ومات و بێدەنگ ئەیبەن بۆ ماڵی زاوا!

دڵپاك: گیانەکەم، (ئەڵێن) شتێکەو (ئیسلام) شتێکی تر، بەپێی شەرع وا چاکە کە هاوسەریی بە شێوەیەکی ئاشکرا بکرێت، هەتا لەگەڵ جۆرە هاوسەرییە ناڕەواییەکانی تردا جیاواز بێت و شادیی و کامەرانیی بەرامبەر بەوەی کە خوا بۆی ڕەوا کردووین پیشان بدرێت، ئەو کارە پاکە چاکە بۆچ بە نهێنی ئەنجام بدرێت؟ بۆچ هەموو کەس پێی نەزانێت؟ بە ئاشکراکردنی زگورتەکان دڵیان ڕائەچڵەکێت و بێدار ئەبنەوە، بازاڕی هاوسەریی برەوی پێ ئەدرێت. ئیتر بۆچ بە نهێنی بکرێت؟

کە فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی کرا بۆ (علی کوڕی ابوطالیب) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "أنه لابد للعرس من ولیمة". (رواه أحمد). دەی خۆ (أن) بۆ تەئکیدە، (لابد)ەش یانی ئەبێ ببێ، جا تەئکیدو هەر ئەبێ ببێ، بخەرە سەر یەکتر بزانە چی لێ دەرئەچێت ئەم جۆرە نانداانە ئەگەر واجب نەبێت، سوننەتێکی تەئکید لەسەر کراوە.

پێغەمبەر ﷺ خۆی کە (زینب بنت جحش)ی مارە کرد، مەڕێکی سەبڕیی و کردی بە دەعوەت. بۆ (صفیە) دەعوەتی خورماو کەشك و ڕۆنی سازکرد، بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی فەرموو: مەڕێك سەر ببڕە بۆ دەعوەت (نانداان)" (رواە

الجماعة).

ئەمەوش وای لە هەندێ زانایان کردوە کە ناندان بە واجب و پێویست دابنێن، کەچی جەماوەری زانایان بە سوننەتی تەئکید لەسەر کراوی دائەنێن[1].

ئەبێ ئەوەش بزانین کە جۆرو چۆنیەتی ئەو ناندانە لە ئیسلامدا بەپێی دەسەلاتی زاوا ئەبێت. دیارە هەندێ کەس دەس ڕۆیشتووەو زۆریش مام ناوەندییو هەژارن، جا هەریەکە بە گوێرەی توانای خۆی ئەجوولێتەوە.

سکالاّ: کەواتە پیاو بۆی هەیە لە کاتی ژن هێناندا خزمو کەسو کارو دۆستو برادەرو ناسراوی موسڵمانی خۆیو هاوسەرەکەشی بانگ بکات، نانیان بۆ ئامادە بکات، (نان بە هەموو واتاکانییەوە).

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، بەلاّم نابێت دەوڵەمەندان بانگ بکات و هەژاران باذگ نەکات، چونکە ئەوە کارێکی ناپەسەندە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "شر الطعام طعام الوليمة، يدعى لها الأغنياء وتترك الفقراء". (رواه البخاري) ئەم بانگ کردنو نان پێدانە، ئەوەندە گرنگە کە بانگکراو بۆی نییە کە نەڕوات بۆ لای شاییەکە. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: ".. ومن لم يجب الدعوة فقد عصى الله ورسوله". (رواه مسلم) لەم ڕووەوە (البغوی) ئەڵێت: "هەرکەسێ بەهانوویەکی هەبێتو بە هۆی ئەو بەهانووەوە بۆی ڕێك نەکەوێ ئەمەیان قەید ناکات"[2].

تەنانەت ئەگەر بانگکراوەکە بە ڕۆژوویش بێت، ئەبێ بڕواتو لەوێ بلێ، من هیچ ناخۆمو بە ڕۆژووم، ئەمجا دوعای خێریشیان بۆ بکات، بەلاّم بانگکراو هەر شتێکی ناشەرعیی بینی، ئەبێت شاییەکە بە جێی بهێڵێتو بگەڕێتە دواوە، "ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يقعد على مائدة يدار عليها الخمر". (رواه أحمد والترمذي).

دەی سکالاّ خان، لەمە زیاتر چیت ئەوێ؟ ئیتر پێویست ناکات کە مێشکی خۆت بپەشۆکێنی، جا هەرکە شووت کرد، ئەگەر بانگمان نەکەی ئەوا ئێمە گلەییت لێ ئەکەین، ئەگەر بانگت کردینو نەهاتین ، دیارە ئەوا ئێمە گوناهبار ئەبین.

سکالاّ: من ناهێڵم گلەییم بێتە سەرشان.

***

ئاواز: بەلاّم من هێشتا لەبارەی ئاهەنگ گێڕانەکەوە ماومە تێ بگەم!

دڵپاك: خانمە کوڵێ گیان، گوتمان ژن هێنانو شووکردن ئەبێ بە شێوەیەکی ئاشکرابن، نابێ بە نهێنی بکرێن. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "أعلنوا هذا النكاح واجعلوه في المساجد واضربوا عليه الدفوف". (رواه أحمد والترمذي). دیارە زۆربەی قەرەباڵغیش لە مزگەوتایە، بەمەش زۆر چاك هەواڵی کارەکە بلاّو ئەبێتەوە، هەروەها ئەفەرموێ: "فصل مابين الحلال والحرام ألصوت بالدف". (رواه الترمذي وحسنه). ئەمەش لەلایەکەوە ئاشکراکردنە و لە لایەکی ترەوە ئاهەنگ گێڕانە.

بە واتایەکی تر ئیسلام ڕێگەی گۆرانیی گوتنو ئاهەنگ گێڕانی لە کاتی ژن هێنان و شووکردن و هەموو موناسەبەتێکی تری پاكو پیرۆز و ڕەوادا داوەو خۆشەویستیشی کردوە لەبەرچاوی موسڵماناندا، تا ببنە مایەی حەسانەوەی دەروونی ئادەمیزادو چالاکیی پێبدەن. بەلاّم ئەبێ ئەو ئاهەنگ گێڕانو گۆرانیی گوتنە، بەرەڵلاّیی و بێ ئابڕوویی و خۆناشیرین کردن و شتی لەو بابەتەیان تێکەڵ نەکرێت.

ئاواز: جا گۆرانیی چ شتێکی نارەوای تێکەڵ ئەکرێ؟

دڵپاك: نا، وانییە، ئەی ووشەی پیسو هۆنراوەی ئابڕووبەرو نارەوا نین؟ بەڕاستیی، هەندێ گۆرانیبێژ، هۆنراوەی گۆرانییەکانیان ئەوەندە ناشیرینو نەفامانەیە، ئادەمیزادی بە ئابڕوو، بەبیستنیان وا شەرم دای ئەگرێت، کە دەس دەس ئارەقی شەرمەساریی لێ بتکێت، بۆ نموونە:

هاتووە لە لای ئەو دێیە باری قۆخو هەرمێیە

---

[1] فقه السنة ج2، السيد سابق. ة(الاسلام وقضايا المرأة المعاصرة) للاستاذ : البهي الخولي.

[2] فقه السنة.

هەرمێکەی با بۆ من بێت ئەی قۆخەکەی بۆ کێیە؟

توخوا ئەوە هۆنراوەیە؟ مانای قۆخو هەرمێ لەم هۆنراوەیەدا ئەزانی؟ ئەوە لێ شوبهاندنە، لەناو زەماوەندیانا، چ نێرگەلو چ مێگەل، گوتنی شورەیی نییە؟ ئادەمیزادی بەشەرەف قیز ناکاتەوە لەو وشەی (قۆخ)ە، لەو کاتو شوێنەدا؟ یا ئەم دێڕە:

شتێکم ئەوێ ها وەلاتەوە هاوەمابەینی هەردوو پاتەوە (!!)

دەی فەرموو، ئەمە گۆرانیی گوتنە یان خراپتر لە (..) خواردن؟ دەی هەرگیز ئیسلام ڕێ بە گۆرانیی گوتنی وەها نادات. بەڵام گۆرانیی گوتنی مرۆڤانە، کە وشەو هۆنراوەکانی پاك بن، کارێکی ڕەوایە، چ بۆ پیاو چ بۆ ئافرەت، ئاهەنگ گێڕانو شادیی و هەڵپەڕکێ (نەك تێکەڵاوو ڕەشبەڵەك) ڕەوان، دەف لێدانو تەپڵ ڕەوان، زانایان ئەڵێن، بە (قیاس) لەسەر دەف ، هەندێ ئامێری تری مۆسیقیش ، ڕێیان پێ ئەدرێت، هەندێ یاریی‌و نواندنو مەنەلۆج، وەك ئەوەی کە حەبەشییەکان لە بەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەیان کرد، ئەوانە ڕەوانو کردنیان پاكو چاکە[1].

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، لەوانەیە ئەوەی کە گوتت ڕای خۆت بێت؟

دڵپاك: پەنا بەخوا لەو قسەیە! من چیم؟ ڕای منی چی؟ من ڕام کوا؟ من تەنها قوتابییەکی سەرەتاییم لە سەرەتای قۆناغەکەشدام، وە خوا خوامە لەو قۆناغەدا خوا لە قوتابخانەی ئیسلامدا وەرم بگرێت!

عامری کوڕی سەعد ئەڵێت: "چووم بۆ لای قرظةی کوڕی کعب و أبی مسعودی ئەنصاری لە شایی ژن هێنانێکا، ئەبینم کەنیزەکەکان گۆرانی ئەڵێن، وتم: ئێوە هەردووکتان دویار (صاحبان)ی پێغەمبەرن و لە ئەهلی (بدر)ن، ئەمە لەلای ئێوەدا ئەکرێت!! گوتیان: ئەگەر ئەتەوێت گوێ بگرە لەگەڵمان، گەر ئەتەوێ بڕۆیت، بڕۆ. بێگومان لە کاتی ژن گواستنەوەدا مۆڵەتمان پێدراوە". (رواه النسائي والحاكم وصححه).

خاتوو عائیشە (فارعە بنت أسد)ی کرد بە بووك بۆ (نبیط بن جابر الأنصاريی) و لەگەڵیا چوو بەرەو ماڵی هاوسەرەکەی فارعە، کە گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "یاعائشة ماكان معكم لهو؟ فان الأنصار يعجبهم اللهو". (رواه البخاري) وە لە چەند گێڕانەوەی تردا هاتووە: "فهل بعثتم معها جارية تضرب بالدف وتغني؟" قالت عائشة: نقول ماذا يا رسول الله؟ قال تقول:

أتيناكم أتيناكم فحيونا نحييكم

ولولا الذهب الأحمر ماحلت بواديكم

ولولا الحنطة السمراء ماسمنت عذاريكم

بەم جۆرە، هەر گۆرانییەك مانای هۆنراوەکانی پاك بێت، ڕەوایە. ئەوەتا مامۆستای مرۆڤایەتی بەو شێوەیە بایەخی بە مەسەلەی شایی و ئاهەنگ گێڕان داوە لە کاتی ژن هێناندا، بۆ ئەوەی ژیان کاڵای خۆشیی و کامەرانیی بپۆشێ، چالاکیی دەروون ببوژێتەوە، ژیان لە نێوان خواپەرستیی‌و خۆش بیستنو (طرب)دا دەساودەس بکات، یارانی پێغەمبەر ﷺ لەو سنورەدا درێغییان نەئەکرد، دائەنیشتن گوێیان ئەگرت لەو موناسەبەتەدا بەشداریی تەرەبیان ئەکرد.[2]

ئێستاش هەر بەڕای منی ئەزانی مامۆستا ئاواز؟

ئاواز: نەخێر .. نەخێر. بەڵام من لەمەوبەر ئەم شتانەم نەبیستووە!

دڵپاك: بەڵێ، ئیسلام لەو کاتانەدا و لە هیچ کاتێکی تردا، ڕێگەی مرۆڤ نادات کە ئاهەنگ بە ویسکیی و شامپانیاو مەسیحو شەراب و بیرەو میرە، خۆی بەد مەست بکات، ئەمجا نێرو مێ بەر بدرێتە یەكو تویستی ڕۆژئاوا یان سەمای ڕۆژهەڵاتیی پێکەوە بکەن، لەسەر ئاوازی مۆسیقا خۆیان با بدەنو دەست بکەنە گەردنی ڕووتو قووتی یەکتر، گوایا

[1] الاسلام وقضايا المعاصرة: للاستاذ البهي الخولي . وفقه السنة ج2.

[2] الاسلام وقضايا المعاصرة للاستاذ البهي الخولي.

پێشکەوتوون.

سکاڵا: بەڕاستیی ئیسلام ئایینو ڕێبازە بۆ مرۆڤ .. مرۆڤ.

## با سەرزەنشتیان نەکەین

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، ئەی ئاواز چی لێهات؟

دڵپاك: مەکینەی بەرگ دوریینی ماڵی فەڕاشەکەمان تێکچوو بوو، داوای لێکرد کە بچێت لەگەڵیا، تا چاکی بکاتەوە بۆیان.

سکاڵا: شتێکت پێ ئەڵێم، بەڵام لە نێوان خۆمو خۆتا بمێنێتەوە.

دڵپاك: فەرموو، ان شاء الله وا ئەبێت کە داوات کرد.

سکاڵا: حەزناکەم ئەوەندە لەگەڵ ئەو کچەو هاوچەشنانیدا خۆت ماندوو بکەیت، ئەوانە لە دەست دەرچوون، فەوتاوون، گەنیون، بەکەڵکی هیچ نایەن، شەیتان چووەتە کەوڵیانەوەو چاك بوونیان ئەگەر موستەحیل نەبێت، ئەوا هەر زۆر دوورە.

دڵپاك: نا .. نا، خوشکە سکاڵا، شتی وا مەڵێ، واز لە م جۆرە قسانە بێنە. ئەم قسانە، قسەی بێ هیواو ڕەشبینەکانن، موسڵمان نابێت ڕەشبین و بێ هیوا بێت: "ولا تيأسوا من روح الله..". ئێمە ئەبێ بە گوێی خوا بکەین، نەهێڵین بێهیوایی ڕوومان تێ بکات.

چاوەکەم، هەموو کەسێك شیاو و قابیلی گۆڕانە، ئەوانەی کە تۆ باسیان ئەکەیت، هەموویان ڕۆڵەی موسڵمانانن، لە خاکی ئیسلامدا لە دایکبوون، هەوای ئاسمانی وڵاتی ئیسلام هەڵ ئەمژن، ئەی نازانی کە باوەڕیان بە خوا هەیە؟ خۆ ئەوەش شتێکی گرنگە.

ئەوانە پاك بوون، بەڵام پیسکران، بێ کەس بوون.. بێ کەس، دەی ڕاستە کە هەر بەبێ کەسیی بمێننەوەو ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لە لیتەی گومڕاییدا بچەقن؟ من بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم: ئەوانە هەموویان لە بێ کەسییدا گومڕابوون، لە بێ کەسیدا بوو کە دوژمن توانی بیاندزێ، لە بێ کەسیدایە کە بە گومڕایی ئەمیننەوە، کەس نەبووە کە قسەیەکی خێریان بۆ بکات. لە کاتێکا سەدان کەس بە سەدان قسەی پڕوپوچی زڵی بۆ کردوون و مێشکی بەو قسانە پڕ کردوون. لەبەر ئەوەش من هیچ سەرزەنشتیان ناکەم.

خوشکەکەم، کێ ئەڵێ کە ئەو باسانەی من و تۆ نابنە ڕووناکییەك بۆیان؟ کێ ئەڵێ کە خوا نەیان کات بە چرایەکی ڕۆشن بۆ دڵو دەروونو مێشکیان؟ تۆ ئەتەوێ یەکسەر کاریان تێ بکات؟ بۆچ قیرو زفتە، سیکوتینە؟ ئەها جووتیار پایز تۆو دائەچێنێ، کەچی لە بەهارا یان هاوینا خەرمانی سوور ئەبێت! خۆ ئەگەر ئێمە خەرمانیشمان سوور نەبێت، ئەوا ئەرکی سەرشانی خۆمانمان بەجێهێناوە، دەی خۆ پاداش دەرەوەکەمان ئاگادارە و پاداشمان ئەداتەوە، ئەی ئەوە کەمە؟

منو تۆ خۆمان ئافرەتینو لە ناو ئافرەتاندا پێگەیشتووین. ژیانو شێوازی ژیان و بیرکردنەوەیان شارەزاین نازانی چەند بێکەسو بێ خەبەرن؟ لەهەر لایەکدا کۆ ئەبنەوە لەباسو ڕازی جلو بەرگو شووکردنو ژن هێنانو مۆدەو میکیاج و بۆیەو سەیرانو ڕابواردن و کەلو پەلی ناوماڵو گۆڕیینی خانوبەرەو چەرەس قرتاندنو دەعوەتکاری هەر ئەوەندەیان پێوەیە کە فێری بوون. وا ئەزانن ژیان هەر ئەوەیەو هەر ئەوەندەیە!

لەو لایشەوە، سینەماو تەلەفزیۆن، گۆڤارو ڕۆژنامەو پەڕاوەکان، ئەوەی کە بە کەڵك بێت و ببێتە مایەی چاوکردنەوەی ئافرەت بۆ ڕوونان بەرەو بەختیاریی، نایخەنە بەردەستیان، بەڵکو هەرچی دەستوورێکی چەوتی بەرەڵڵاکانی خۆرئاواو خۆر هەڵات هەیە، هەرچی باوو نەریتێکی پیسی زیانبەخش هەیە، هەمووی ئەخرێتە بەردەست.

ئەوی بەسەرزمانیش کە ئەوە ئەبینێ، دیارە وەری ئەگرێت، گەرچی پڕاو پڕ لێشی تێناگات، بەڵام لاسایی ئەکاتەوە،

بەسەلمێنراوێکی راستو تەواوی ئەزانی، هەندێ لەو وێنەو نوسینانە ئەبنە ئالۆش و خرۆشێکی زۆر بە تین و بەر ئەبنە گیانو لەش، ئەویش کاتی خۆی چەکی بەرگی پێنەدراوە تا بتوانی بەرگریی پێ بکات! دەی باسەرزەنشتیان نەکەین، با ڕێگەی خێرو بەختیارییان بۆ ڕۆشن بکەینەوە.

سکالا: ڕاست ئەکەیت مامۆستا دڵپاك: بیبوورە، من .. من ئەوەم نە ئەزانی. بەڵام ئەی تاوانی نەزانییو گومڕایی ئافرەت لەسەر خاکی ئیسلامدا، لە ئەستۆی کێدایە؟ لە کاتێکا کە ئەم خوایەش هەبووەو ئەم هەموو یاسا نایابە بێ وێنانەیشی تێدا هەبوە؟

دڵپاك: پرسیارەکەت زۆر ووردە، باسی مەکە ئێستا، وەڵامەکەی زۆر دوورو درێژە، خوا یار بێت، خۆت ئەیگەیتێ، بەڵام بە کورتیی، لە ئەستۆی هەموومانایە. ئەوەی کە ڕۆیشت، ئێمە تیایا تاوانبار نابین. دەی وا ئەمڕۆ سەدەی من و تۆیە، با کار بکەین ، با لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین.

## مافی ژن بەسەر مێردەوە

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، ئێمە باسێکی دوورو درێژی ئافرەتمان کرد، تەنانەت دایشمان بەشوو. ئێ.. وا چووە سەر ماڵی خۆیی، با بڵێین گەیشتە هێلانەی نوێی خۆی. ئێستا ئەمەوێ بزانم لە ئیسلامدا مافی ژن چییە بە سەر مێردەکەیەوە؟

سکالا: بە خوا پرسیارەکەت جوانە! ئای بەدەم خەڵکەوە لەم ڕووەوە چەند پڕوپاگەندە ئەکرێت! ئای درۆو دەلەسەم بیستووە ! لەبەرئەوە منیش زۆر حەز لەو باسە ئەکەم.

دڵپاك: ئای خوشکان! ئەی بۆچ ناپرسن: ئەرکی سەرشانی ئافرەت بەرامبەر مێردەکەی، خێزانەکەی چییە؟ ئەها گیانی خۆپەرستیی و منایەتییتان چەند بەهێزە و هەر خۆتانتان لەیادە!

ئاواز: دەی وایە دڵپاك، ئادەمیزاد خۆی لە هەموو کەسێك بەلاوە خۆشەویستترە، لەبەرئەوە حەز ئەکەین یەکەمجار مافی خۆمان بزانین و بناسین. ئەوسایش ئەرکی سەرشانمان بزانین، ئەی ژیان وەرگرتنو پێدان نییە؟

دڵپاك: با وابێت! دڵنیام سەبارەت بە پەیوەندی ژنو مێرد، زۆرتان بیستووەو هەندێکیشتان بەچاو دیوە، بەڵام لە شێوەیەکی سامناکی دوور لە گیانی بێ گەردی ئیسلامییدا. دیوتانە و بیستووتانە لەو کەسە نەزانو نەفامانەی کە خەڵك بەرۆڵەی ئیسلامیان دائەنێت، ئافرەت بەندەو خزمەتکاریی پیاوە، پیاوی پیاوانە، ئەبێ لەگەڵ ژنەکەیا مۆنو ڕووگرژو کەم قسەبێ، زبرو دڵڕەق بێ، چونکە پیاو بەوە ویقار پەیدا ئەکات، بە بەڕێز ئەکەویتە بەرچاوی ژنەکەی!!

نەرمو نیانییو ڕووخۆشیی، دەمی بەخەندە، قسەی خۆش، ئارامییو هێمنیی، خۆشەویستی دەربڕین، ڕاوێژ کردن لەگەڵیا، چاك جووڵانەوەو یارمەتیدانی، ئەمانە بەڵگەی سستێن بۆ پیاو، نیشانەی کزیی و لاوازیی پیاون، ئەو پیاوە (ژن ئاغایە)! پیاوی ژن ئاغاش لەسەر مردووان دائەنرێت نەك زیندووان، ئافرەت ئیستغلالی ئەوە ئەکات، بگرە ئەیکات بە پلەکانەو زاڵ ئەبێت بەسەر مێردەکەیا، بەوەش ژن ئەبێتە مێردو مێردیش ئەبێتە ژن!!

پێش هەموو شتێك، ئەم قسە پڕوپوچانە، قسەی موسڵمانی زاناو ڕاستەقینە نین، بەرنامەی ئیسلام شتی وەهای نەگرتۆتە خۆیو نایشی گرێتە خۆی، لەوەش زیاتر دژ بە گیانی پاکی بەرنامەی خوان و لەوانە کە "ماأنزل الله بها من سلطان". جا پیاو ئەگەر خۆی نەدا بەدەم هاوسەرەکەیەوە، ئەی خۆی بەدەم کێوە بدات؟!

ئەو کەڕە نەفامانە، نازانن کە ڕێزگرتنی ئافرەت، چاك جوڵانەوە لەگەڵیا، یارمەتیدانی، نەرمو نیانی نواندی بەرامبەری، قسەی خۆشو ژیریی بەکارهێنان و سەلیقە خستنە کارەوە لەگەڵیا، ڕەوشتی بەرزو کەسایەتیی دروست ئەکەن لەدڵی ئافرەتدا! ناشزانن کە قسەی پیسو توڕەیی و شەڕە جنێوو لێدان و شێوازی تری توندو تیژی جگە لەوەی کە ئەبنە هۆی ناکۆکیی و کامەرانیی خێزان ئەتۆرێنن، پیاو لەبەرچاوی ژنەکەی سووك و بی نرخ ئەکەن، زیاتر سەر لە

ئافرەت ئەشێوێنن‌و ئەیسڵەمێننەوە، دووچاریی بێ هیوایی ئەکەن، لە ئەنجاما ئەو خێزانە بەدبەخت و سەرلێشێواو ئەبێت. ئەو پیاوەش بەر هەڕەشەو تووڕەیی خوا و پێغەمبەر و سزای قیامەت ئەکەوێ.

ئاواز: ئەوە تۆ چی ئەڵێیت؟! چۆن! ئیسلام ئا بەو جۆرە باسی ژیان و پەیوەندی نێوان ژن‌و مێرد ئەکات؟! لەو فرگە (منطلق)ەوە بۆی ئەچێت؟ بەڵام.. بەڵام ئەی بۆچ ئەم باسانە کەسێکی تر نایانکات؟

دڵپاك: ئەگەر خوا مۆڵەتی داین‌و ماین و تۆش گوێت گرت، ئەوسا گەلێ شتت بۆ دەرئەکەوێ، ئەوەی کە لێت شارراوەتەوە، ئاشکرا ئەبێت لێت. لەوانەیە بەشی زۆری ئەوەی کە فێری بوویت‌و بەڕاستی ئەزانی دەمەونخون ببێتەوە، ئەوەش کە کراوە بە دوژمنت، بە دۆستێکی گونجاو و دڵسۆزی بزانی و وەری بگریت.

بەتاریف دان‌و باس‌و ڕاز ناگەینە تامی ئەم دینە

فەرموو دەمێ تیا بژی، ئەوسا ئەزانی شیرینە

ڕێچکەی خوارو خێچی خەڵکی لە ئاستی شاڕێگەی خوادا

وەك سوتاندنە بە ئاگر لە ئاستی نازو نەوادا

سکاڵا: دڵپاك گیان، با چایەك لێبنێم، سەرو پیاڵە بخۆینەوە، تۆیش مێشکت وورپاتر ئەبێتەوەو قوڕگیشت تەڕ ئەبێتەوە. باسەکەم بەلاوە زۆر گرنگ‌و جوانە.

### 1- خەرجی کێشان (النفقة)

دڵپاك: خەرجی کیشان، یانی ئامادەکردنی ئەوەی کە ئافرەت پێویستی بێ، لە خواردن‌و خواردنەوە، جێی ژیان (مسکن)، داو دەرمان‌و هەموو خزمەتەکانی تر، لە لایەن پیاوەوە، با ژنەکە خۆیشی دەوڵەمەند بێ. ئەمانەش پێویست واجب)ن لەسەر پیاو. بە پێی قورئان‌و سوننەت‌و ئیجماع، واتە لەسەر مێرد پێویستن[1].

لە یاسای ژمارە (233)ی سورەتی (البقره)دا خوا ئەفەرموێ: "وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا". مەبەست لە (الْمَوْلُودِ لَهُ) باوکە. ڕۆزیش لەم حوکمەدا، خۆراکی تەواو، پۆشاك‌و جل‌و بەرگ ئەگرێتەوە، (المعروف)یش یانی ئەوەی کە خەڵك لە چوارچێوەی شەرعدا لەگەڵی ڕاهاتووە، بەبێ زیادەڕەویی و کەم ڕەویی. دیسانەوە لە یاسای ژمارە (6)ی (الطلاق)دا ئەفەرموێ: "اَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ و.."وە لە ژمارە (7)ی (الطلاق)دا ئەفەرموێ: " لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا".

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: "ولهن عليكم رزقهن و كسوتهن بالمعروف" (مسلم) دیسان ئەفەرموێ: تطعمها اذا طعمت، وتكسوها اذا اكتسيت..". (رواه البخاري ومسلم).

لە ڕووی (ئیجماع) بەکۆمەڵ بڕیاردانەوە (ابن قدامه) ئەڵێت: "ئەهلی عیلم ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی مەسرەف کێشانی ژن لە لایەن مێردی باڵقەوە پێویستە جگە لە ئافرەتی ناچیزە"[2].

بەم جۆرە ئەبینین لە ئیسلامدا پیاو ئەبێ خەرجی بگرێتە ئەستۆو خەرجی ژن‌و ماڵ‌و منداڵ بکێشی. کەچی ئافرەت با دەوڵەمەند و خاوەن سامان و داراییش بێت. پێویست نییە لەسەری کە خەرجی ماڵ، تەنانەت خۆیشی بکێشی. ئەم خەرجیکێشانەش لەو ساتەوە کە ئافرەتەکە لە پیاوەکە مارە ئەکرێت، دەست پێ ئەکات.

سکاڵا: لەو باوەڕەدام کە هیچ ڕێچکەیەکی دنیا لەو ڕووەشەوە ناگات بە تۆزی ئیسلامدا.

دڵپاك: بێگومان وایە. جا با ئەوەشتان بیر بخەمەوە کە جۆرو شێوەی مەسرەف کێشان بە پێی کات‌و توانا‌و دەسەڵاتی ئابووریی مێرد ئەگۆڕێت لە زیادیی‌و کەمیدا. چونکە مێردان هەموویان لەیەك پلەو ئاستی ئابووریدا نین، هەیانە دەوڵەمەندەو هەشیانە کەم دەستە.

[1] فقه السنة ج2 السيد سابق.

[2] فقه السنة ج2 السيد سابق.

سکالاَ: ئەی ئەگەر ئافرەت بە ئارەزووی خۆی هاوبەشیی پیاو بکات لە خەرجیکێشانی ماڵو خێزانیدا، چی ئەبێت؟ ئایا گوناحە؟

دڵپاك: گوناحی چی؟ ئەوەیان (نور علی نور)ە، ئیسلام لە هەموو کارو بارێکی ڕەوادا هانی ئادەمیزاد ئەدات. ئافرەت بەوە خێری ئەگاتو دڵی مێردەکەشی خۆش ئەکات و پەیوەندی خێزان بەتین تر ئەبێت. بۆچ تۆ ئەتەوێ هاوکاریی هاوسەرەکەت بکەیتو لە کاروباری خەرج کردنا دەسباری بدەیت، سکالاَخان؟

سکالاَ: بە خوا نیازی ئەوەم هەیە، نامەوێ وەك هەندێ ژن بجووڵێمەوە.

دڵپاك: خوا هاوسەرێکی چاكو گونجاوت بۆ بگەیەنێت.

**2ـ چاکیی هەڵسوکەوت (أحسان العشرة)**

ئاواز: بەلاَم خەرجی کێشان بە تەنها هەموو شتێك نییە دڵپاك.

دڵپاك: ئێمەش تەنها خاڵی یەکەممان باسکرد، هەی بێ بەلاَ بی! بۆچ پەلەت کرد لە حوکمدانەکەتا؟ ڕاستە خەرجی کێشان هەمووشتێك نییە.

لە ئیسلامدا، ئافرەت هەروەك پیاو (وەك باسمان کرد) ئادەمیزادە. ئەبێ ڕێزی هەست و نەستی ئەدەبیی و مرۆڤایەتیی بگیرێت ، بەتایبەتی لەکاتی میوان هاتن و میوانداری، لەو کاتانەدا کە لەگەڵ کەسانی تردا بێ، چونکە لەو کاتو شوێنانەدا، بچوکترین هەڵەکاریی پیاو کار ئەکاتە سەر دڵ و دەروونی ئافرەت. توندوتیژیو ڕەقیی نواندن لەگەڵ ژندا کاری موسڵمانی تەواو نین، لێدان لەسەر ناهەقو جنێو پێدانو قسەی ناشیرین و کەسایەتیی شکاندنی ژن، لەگەڵ ئاینی خوادا یەکناگرن.

پەروەردگار، لە یاسای ژمارە (19)ی (النساء)دا ئەفەرموێ:"وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً". دیارە، ئافرەت لەسەدا سەد بە دڵی مێردەکەی نابێت، هەر ئەبێ سیفەتێکی تێدا بێت کە بە دڵی مێردەکەی نەبێت. جا لەم حاڵەتەدا، نابێ پیاو هەموو سیفەتە جوانەکانی ژنەکەی فەرامۆش بکاتو حیساب بە تەنیا بۆ ئەو دانە سیفەتە بکات، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: "لایفرك مؤمن مؤمنة، ان کره منها خلقا، رضی منها خلقا آخر". (فقه السنة ج2 ل186).

ئافرەت بە پێی پێکهاتنی بایەلۆجی خۆی لە نیازو ویستی خۆیدا، لە کەسایەتیدا کزو لاوازە، نابێت چاوەڕوانی تەواوەیی (الکمال)ی لێ بکرێت، پیاویش ناگاتە پلەی تەواویی، لەبەرئەوە ئەبێ مێردەکەی بەپێی توانا چاوپۆشی لە زۆربەی هەڵەکانی بکاتو هەوڵی ڕاستکردنەوەیان بە ژیریی و سەلیقە نواندن بدات. ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کە مێرد ژنەکەی بەرەڵڵا بکاتو پشتگوێی بخاتو هەوساری بۆ شل بکات، چونکە بەمە زیاتر بەرەو چەوتیی و لە دوایدا جیابوونەوە ئەڕوات.

پەروەردگار ئەفەرموێ: "ولاتضاروهن لتضیقوا علیهن". بەم جۆرە زیانگەیاندن بە ژن، بەهەر جۆرێ ببێ، چ ئاشکرا و چ نهێنی، ناڕەواو حەرامە، دەی ئەمەش تەنها تین و کاریگەریی ئایین ئەتوانن پیاوی لێبگێڕنەوە، چونکە دەستی یاساو دەستوورە دەسکردەکانی دنیا ناگاتە دڵو مێشكو ناخی ئادەمیزاد.

ڕەوشتو هەڵسوکەوتی پیاوی موسڵمان، لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ باسکراوە، بە پێی ئەو باسکردنە، موسڵمان لەگەڵ ژنی خۆیدا نەرمو نیانە، لەگەڵیا چاکە "أکمل المؤمنین أیمانا أحسنهم خلقا وخیارکم خیارکم لنسائهم". (أحمد والترمذي)، "خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي". (الترمذي وصححه).

ڕێزگرتنی ئافرەت بەڵگەی پاکیو بەرزیی کەسایەتیی پیاوەکەیەتیی، ناڕەحەت و ڕیسواکردنی بەڵگەی نابەچەیی و ڕیسوایی مێردەکەیەتی، "ماأکرمهن الأ کریم، وما أهانهن الأ لئیم". (حدیث فی فقه السنه ج2 ل185). چاکیی هەڵسو کەوت زۆر بەرفراوانە، ووردو درشتی ژیانی ژنو مێرد ئەگرێتەوە، هەموو لایەنێك تەی ئەکات.

ئاواز: هەندێ پیاو درێژدادڕن، شتێکی وورد لە ئافرەت ئەکەنە کێوێك!

دڵپاك: ئێمە باسی ئیسلام ئەكەین، نەك هەندێ پیاو. لە ئیسلامدا نابێت پیاو حیساب بۆ هەموو جوڵەو وورتەیەكی ژنەكەی بكات و لێی بپرسێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی ئەوە نەبێتە هۆی لێڵ بوونی ڕوونیی ژیانی ژن و مێرد، نەهیی لەوە كردووە" نهى نبي الله ﷺ أن يطرق الرجل أهله ليلا، يتخوفهم او يطلب عثراتهم"[1].

پیاو ئەبێ تێكۆشێ بۆ بەدەستهێنانی بەختیاریی و كامەرانیی ژنەكەی، هەمیشە هەوڵبدات كە شادمانی بخاتە دڵییەوە، پەستیی و غەم و دڵتەنگیی و غەم و خەفەتی لێ دوور بخاتەوە، هەوڵی تێگەیاندن و ڕۆشنبیركردنی بدات.

مەدای ووشەی (المعروف) فراوان و بەربڵاوە، بە پێی كات و شوێن و پێشكەوتن ئەگۆڕێت، هەموو چاك و ڕەوایەك ئەگرێتەوە، هەموو لایەنێكی ژیانی سروشتی و پاكی تێدا بەرچاو ئەكەوێ، چۆن نەء؟ بەرنامەی خوا یاسایی خوایی، چۆن بەرژەوەندی بەندەكانی خوا فەرامۆش ئەكات؟!

بەڵێ، خوشكەكانم، ڕێزگرتنی ئافرەت، دیاریی كردنی ڕۆڵی لە ژیاندا، بە ئەرك و مافەوە، لەلایەن ئیسلامەوە گەشتۆتە پلەیەك كە لەوە پیرۆز ترو بەرزتر مەگەر تەنها لای خوا بێت و خوا خۆی بیزانێت. ئەمەش لە كاتێكا كە ئافرەت مافی خورابوو، داواكردنی مافی بە بیردا قەت نەئەهات، بەبێ ئەوەی خۆ دەرخستنێ بكات، مانێك بگرێت، نەقابات و یانەو صالۆن بووبێت و تیا كۆبووبێتەوەو داوای ئەو ڕۆڵ و مافانانەیان تێدا بكات بەڕاپۆرت و بینێرێ بۆ لیژنەی (مافی ئادەمیزاد) یان نەتەوە یەككگرتووەكان. ئەمجا لەوێ كۆبوونەوەی بۆ بكرێت و هۆیەكانی ڕاگەیاندنیش دەنگی بگەیەنن بە هەموو لایەكی جیهان.

بەڵێ، ئیسلام ئافرەتی سەربەست و ئازاد كرد لەگەڵ پیاوداو بوژاندیەوە، بەبێ ئەوەی (ضرورة)ی ئابوریی یان زۆرانبازیی چینایەتی، یاخۆ قیژەو هاواری ئازادیخوازی خۆرئاوا ناوو بوونیان ببێ. كەچی ئەوانەی كە هەموو خولیاو ئاواتێكیان بووەتە جنس، زورناقێتیی هۆش و ژیریی لەدەست سەندوون، ئیسلام تاوانبار ئەكەن سەبارەت بە ئافرەت، تاڵیی ژیان و بەدبەختیی ئافرەت ئەدەن بە كۆڵی ئیسلامدا، هەروەك ئیسلام فەرمانی دابێت بەسەر ئافرەتا كە بەڵڵا بێت و وەك بەرخ خۆی بخاتە بەر كەڵبەو چنگی گورگە هارە!

سكالاّ: باوەڕت هەبێ، ئەوەی من بیستوومە، لە جەورو ستەم، لە كەژێتیی و دواكەووتن و دڵڕەقیی ئیسلام سەبارەت بە ئافرەت، لەگەڵ ئەم ئایەتە و فەرموودانەدا وەك (بەڵێ) و (نا) دژی یەكترن! ئای لە درۆو بوختان و فرۆفێڵ و پروپەلاّنتەی ناحەزانی ئیسلام!!

### 3ـ شەوخەوتن لەگەڵیا (مافی ناو نوێن)

سكالاّ: ئێ خوشكە دڵپاك، مافەكانی ترمان بۆ باس بكە.

دڵپاك: مافێكی تری ئافرەت بەسەر پیاوەوە، شەوخەوتنە لەگەڵیا لە ناو نوێندا. ئەبێ لەو مافە بێبەشی نەكات، دیارە ئەمەش بەپێی توانا ئەبێ، پێشێلكردنی ئەو مافە ستەمێكی گەورەیە، نابێ (هێلكە ببات بۆ هێلانەیەكی تری ناڕەوا)، ئەوە ناپاكییە لەگەڵیا هەروەك یەكێكە لە گوناحە هەرە گەورەكان، ئیسلام فەرمانی داوە بەسەر پیاودا كە ئەو مافە جێبەجێ بكات. بە واجب ناوی براوە، خوا ئەفەرموێ: "فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ". (البقره 222) هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە عبداللە كوری عمری كوڕی عاصی فەرموو: "يا عبدالله ألم أخبرك أنك تقوم النهار وتقوم الليل قلت نعم قال فلا تفعل، صم وافطر وقم ونم، فان لجسدك عليك حقا وان لعينك عليك حقا وان لزوجك عليك حقا". (رواه البخاری ومسلم).

ابن حزم ئەڵیت: "پێویستە لەسەر پیاو بچێتە لای ژنی خۆی، بە لایەنی كەمەوە لەهەر پاك بوونەوە (طهر)ێكدا جارێك، ئەگەر توانای ئەوەی بوو نەیكرد ئەوە لای خوا تاوانبارە"[2].

---

[1] (الاسلام وقضايا المرأة المعاصرة) . البهي الخولي. و (المرأة في القرآن والسنة) محمد عزة دروزة .

[2] فقه السنة ج2 : السيد سابق.

جەماوەری زانایان لەسەر ڕاکەی (ابن حزم)ن‌و بە واجبیی دائەنێن، سا مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێ کە مێردەکەی بەهانەیەکی شەرعیی هەبێت.

پێشەوا شافیعی ئەفەرموێ: پێویست نییە لەسەری، چونکە مافێکی خۆیەتی، وەك مافەکانی تر پێویست نابێت لەسەری".

ئەحمەد ئەفەرموێ: ئەوپەڕەکەی چوار مانگ موڵەتی نەچوونە لای هەیە، ئەگەر مێرد لە ژنەکەی دوورکەوتەوە و بەبێ بەهانە تاشەش مانگ نەگەڕایەوە بۆ لای، ژنەکە هەواڵی بۆ ئەنێرێ، ئەگەر شانی پێدا نەکرد کە بگەڕێتەوە، داوەری ئیسلام بۆی هەیە لە یەکتریان جیا بکاتەوە"[1].

پێشەوا غەزالیی ئەفەرموێ: "هەر چوار شەو جارێك ئەبێت بچێتە لای ژنەکەی (واتە مێرد) ئەمەش دادپەروەرانەیە، چونکە ژمارەی ئافرەتان بۆ پیاوێك چوارە. دواخستن لەم سنوورەدا ڕێی پێ نادرێت"[2].

محمد بن معن الغفاری ئەگێڕێتەوە: "ئافرەتێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتابو گوتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان، مێردەکەم بە ڕۆژا بە ڕۆژووە، بە شەوا شەونوێژ ئەکات، حەزناکەم شکاتی لێ بکەم (چونکە خواپەرستی ئەکات)، عومەر پێی فەرموو: (نعم الزوج زوجك). ژنەکە قسەکەی خۆی دووبارە ئەکردەوەو عومەریش فەرموودەکەی خۆی دووبارە ئەکردەوە. تا (کعب الأسدی) پێی وت: ئەی گەورەی موسڵمانان سکاڵایەتی لەدەست مێردەکەی، شەوان دوورە لێی. عومەر فەرمووی: وەك لە قسەکەی تێنەگەیشتبێ، ڕێکیان بخەن کەعب داوای کرد کە مێردەکەی بانگ بکەن، بانگیام کردو هات. کەعب پێی گوت: ئا ئەم ژنەت سکاڵات لێ ئەکات. مێردەکە گوتی: لە خواردنا یاخۆ لە خواردنەوەدا؟ کەعب گوتی: نەء. ژنەکەش گوتی:

یا أیها القاض الحکیم رشده الهي خلیلي عن فراسی مسجده
زهده في مضجعي تعبده فاقضی القضاء کعب، ولا ترده
نهاره ولیله ما یرقد فلست في أمر النساء أحمده

مێردەکەی گوتی:

زهدنی في النساء وفي الحجل اني امرؤ اذهلني مانزل
في سورة النحل وفي السبع الطوال وفي کتاب الله تخوف جلل

کەعبیش گوتی:

أن لها علیك حقا یا رجل نصیبها فی أربع لمن عقل
فاعطها ذاك ودع عنك العلل

خوا تا چوار ئافرەتی بە حەڵاڵ بڕیار بۆ داوی، سێ شەوو سێ ڕۆژت هەیە بۆ خواپەرستیی (واتە شەو ڕۆژێکیشت بۆ ئەم ژنەیە، چونکە هەر خۆیەتی). ئەمجا عومەر فەرمووی: بە خوا نازانم لە کام کارت سەرم سوڕبمێنێ؟ لە تێگەیشتنت لە گیروگرفتەکەیان یان لەو حوکمەی کە لە نێوانیاندا کردت. بڕۆ ببە بە قازی بەسرە. (فقه السنة ج2 ل189 ، 190).

ئاواز: بەڕاستیی شتی سەیر ئەبیستم، من بەم جۆرەم نە ئەزانی. هەر ئێجگار زۆر بایەخ بە مەسەلەکە دراوە. وا دیارە..

دڵپاك: لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە لە پاڵ هەموو واجبێکدا کە بەجێ ئەهێنری، پاداشتێکی خوایی هەیە، تەنانەت لە چوونە لای ژندا خوا خێر بۆ مێردەکەی تەرخان ئەکات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ".. ولك في جماع زوجك أجر، قالوا یارسول الله أیأتی أحدنا شهوته ویکون له فیها أجر؟ قال: أرایتم لو وضعها في حرام أکان علیه فیها وزر، فکذلك اذا وضعها

[1] فقه السنة ج2 : السید سابق.
[2] فقه السنه ج2 : السید سابق.

في حلال كان له أجر". (رواه مسلم).

**4- پۆشینی نهێنی ژن**

دڵپاك: لەسەر مێرد پێویستە کە نهێنی ژنەکەی نەدرکێنێ لەلای هیچ کەس و هیچ شوێنێکا، چونکە درکاندن و بڵاوکردنەوەی قین لە دڵی ژنەکەدا دروست ئەکات، ئەبێتە هۆی سووك کردن و بەد ناوکردن و شکاندنی لە ناو خەڵکدا، لە ئەنجاما ئەوەش ئەبێتە هۆی جیابوونەوەیان، بەوەش هێلانەی خۆشبەختیی و کامەرانییان ئەشێوێت و خۆیان و منداڵەکانیشیان سەریان لێ ئەشێوێت. ئەمەش لەگەڵ سروشتی ئیسلامدا دژ بە یەکترن.

سکالا: کتومت مەبەستت لە کام نهێنییە؟ چونکە نهێنی زۆر جۆری هەیە.

دڵپاك: مەبەست هەموو جۆرەکانییەتی، بە تایبەتی گوفتارو ڕەفتاری لەسەر نوێن ئەمەیان حەرامە.. حەرامە. جگە لە حەرامیش پێچەوانەی مەردایەتییە، قسەکردن لە ناو خەڵکا یان بۆ کەسێکی تر لەو ڕووەوە، چ بۆ پیاو چ بۆ ژن دەم بەرەڵاییەو لە زمانی شەرعدا پێی ئەگووترێ (لغو)، یەکێك لە سیفاتی موسڵمانی ڕاستەقینە دوورکەوتنەوەیە لەو (لغو)وە "والذين هم عن اللغو معرضون".

سکالا: گەلێ کەس لە پیاوو ژن، دیومەو بیستوومە، بەشەوا لەسەر جێگەی خەو چی ئەگوترێ و ئەکرێ لە نێوانیانا، بەیانی بۆ خەڵکی بەلەزەت و ترش و خوێ و شانازییەوە باس ئەکەن.

دڵپاك: ڕاستە، ئەو جۆرە کەسانە هەن، دەی ئەو کردارو ڕەفتارانەیان پێچەوانەی بەرنامەی ئیسلامن، خراپ و حەرامن. پێغەمبەر ﷺ لەم ڕووەوە ئەفەرموێ: "أن شر الناس عندالله منزلة يوم القيامة الرجل الذي يفضى الى المراة وتفضى اليه ثم ينشر سرها" (رواه أحمد).

سکالا: بەخوا هەڕەشەیەکی توندوتیژە، ئەی باوکە گیان!

دڵپاك: حەقی خۆیەتی. ژن و مێرد ئەبێت لەم لایەنەوە (کە ئاماژەمان بۆ کرد) زۆر وریا بن، با نەیەت بە دەمیا، لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ ئەو ژن و مێردە دەم شڕە بە دوو شەیتان ناو ئەبات: "هل تدرون ما مثل من فعل ذلك؟ ان مثل من فعل ذلك مثل شيطان وشيطانة. لقي أحدهما صاحبه بالسكة، فقضى حاجته منها و الناس ينظرون اليه". (رواه أحمد وأبوداود).

هەروەها چەندەها نهێنی تری نێوان ژن و مێرد هەن ئەگەر پیویستی زۆر نەهێنی باسکردن و ئاشکراکردنیان حەرامە.

**5- سەردان لە کەس و کار**

دڵپاك: یەکێکی تر لە مافەکانی ژن بەسەر مێردەوە، ئەوەیە کە ڕێگەی لێ نەگرێت لەسەردانی دایك و باوك و براو خوشکان و مامۆیان و خاڵوانیدا.

هەروەها لە هاتنی ئەواندا بۆ لای ئەم ڕێگریی نەکات، چونکە ئەم هاتوچۆیە، بەجێهێنانی (صلەی ڕەحم)ە لە زاراوەی ئیسلامدا، بەجێهێنانی ئەو پەیوەندییەش واجبە. جا کە ئافرەت ئەو واجبە بەجێ ئەهێنێ، خۆ پیاویش بۆی نییە قەدەغەی ژن لە بەجێهێنانی ئەرکی ئاییندیا بکات.

ئەی سوپاسگوزاریی دایك و باوك نەکراوە بە هاوشانی سوپاسگوزاریی خوا؟ "وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً." (الأسراء 23). "وآت ذا القربى حقه". دەی خۆ یەکێك لەو مافانە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی حەڵاڵە. لە پێغەمبەر ﷺ پرسییان: يا رسول الله من أبر؟ قال: أمك وأباك، أختك اخاك، ومولاك الذي يلي ذلك، حق واجب ورحم موصولة". (رواه أبوداود).

سکالا: بەخوا گەورەو گرنگە! باوك لە دوای دایك و برا لە دوای خوشك دێت!

ئاواز: بەڵام هەندێ ئافرەت ئیستغلالی ئەو مافە ئەکات، هەر ڕۆژ بووەوە دەرگاکانی قوفڵ ئەدات و ئەڕوات بۆ ماڵی باوگی یان یەکێك لەو خزمانەی، گەلێ جار شەویش نایەتەوە و مێردەکەی بە تەنیا ئەمێنێتەوە یا بە ناچاریی ئەبێ بڕوات بۆ ئەو ماڵەی کە خانمە قۆڵێی لەوێ باری خستووە.

لەوەش خراپتر، هەر ڕۆژە دەعوەتی دەستەیەکیان ئەکات، ئیترماڵەکە ئەکاتە نیمچە چێشتخانەیەك یاخۆ نیمچە ئۆتێلێك، هێمنی لێ هەڵ ئەگیرێت، نەخۆی و نە مێردەکەی و منداڵەکانیان تامی حەسانەوە ناکەن!

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، لەو جۆرە زۆر هەیە، بەڵام ئەوە نە ڕەواو نە ڕاستە، هەر شتێ سنورێکی تایبەتیی و دیاریکراوی خۆی هەیە، ئەبێ لەو سنورە نەچێتە دەرەوە. هاتوچۆو گەیاندنی پەیوەندیی کەس و کار و خزمایەتیی، جوان و بە کەڵکن، بۆیە ئیسلام بە ڕەوای ناوبردوون. جا کاتێ جوانیی و کەڵکەکەیان گۆڕا بۆ ناخۆشیی و زیان و هەراسان کردن، ئەو کاتە لە سنووری ڕەوایی دەرئەچن.

سنووری خوا جوان و دیارییە نەکەی بیشکێنی تاوانبارییە.

## 6- یارمەتیدانی

دڵپاك: پێویستە لەسەر مێردی موسڵمان کە یارمەتی ژنەکەی لە ئیش و کاردا بدات، دەستباری بدات، بە تایبەتی کاتێ کە ژنەکەی ئیش و کاری زۆر بێت، منداڵی زۆر بێت، یاخۆ تەندروستی ناتەواو بێ.

موسڵمانانی سەردەمی پێشوو لەم ڕووەوە کەمتەرخەمییان نەکردووە، قەت ئەو کارەیان بە نەنگ و شوورەیی دانەناوە وەك ئێستای ئێمە. ئەوان بە پاکیی و ڕاستیی موسڵمان بوون، لە هەموو کارو گوفتارێکا چاویان لە پێغەمبەر کردووە ﷺ. ئەویان کردووە بە مامۆستاو سەرمەشقیان.

ئەو مێردانەی کە یارمەتیدانی ژنەکانیان بە نەنگ و شوورەیی ئەژمێرن، ئەوانە ئایینەکەیان بە تەواویی وەرنەگرتووە، تێنەگەیشتوون، جیاوازی نێوان حەڵاڵ و حەرام نازانن، مرۆڤ ئەبێ نەنگداریی و شوورەیی لە کارو گوفتاریی حەرامدا ببینێ خۆی لێ دوور بخاتەوە. دەی خۆ کاری ئافرەت لە بەڕێوەبردنی ماڵ و خێزاندا پاکترین کارە، لە لایەن ئیسلامەوە بە بەرزو پیرۆز تەماشا ئەکرێت. "وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى" بنەڕەت و یاسایەکی گرنگی خواییە. دەی خۆ ژن نزیکترین کەسە بۆ پیاو، جا یارمەتیدانی ئەگەر بە گشتیی لە ناو موسڵماناندا پێویست بێ، دیارە لە نێوان ژن و مێرد دا پێویست ترە.

سکاڵا: جوان و ڕاستە. بێگومان هەر پیاوێك کە یارمەتیی ژنەکەی خۆی نەدات، ئەوە خۆی تاوانبارە، ناتەواوییەکە هی ئەوە نەك هی ئیسلام.

## 7- پاراستن و ڕێزگرتنی خاوەندێتی تایبەتیی

دڵپاك: وا بزانم لە بیرتان نەچۆتەوە کە باسی "شیاویی ئابووریی" ئافرەتمان کرد. ئەوەبوو بۆمان دەرکەوت کە ئیسلام گەلێ مافی گرنگی ئابووریی بە ئافرەت بەخشیی و هێنایە ڕیزی پیاو لە خاوەندێتی (ملکیە)دا. مێرد ئەبێ مارەیی بداتێ، هەموو جۆرە مەسرەفێکی بۆ بکات، میراتی مێردو باوك و .. هتدی بۆ دێتەوە. دیارە ئەوانەش کەم نین.

لەوەش زیاتر، هەمو جۆرە مافێکی تری خاوەندێتی ڕەوای لە لایەن ئیسلامەوە پێدراوە، وەك: بەخشین ، وەسیەت کردن، خانوو زەوی و باخ و ئاژەڵ و .. هتد کڕین و فرۆشتن، کاسپی کردن، عەقد بەستن، قەرز کردن و قەرزدان، سوڵح کردن و چوونە لای داوەر بۆ بەڕێوەبردن و زیادکردنی سامان و داراییەکەی، بەو مەرجەی لەسەر ڕێگەی ڕەوا لانەدات.

مێردەکەی، یا باوك و دایکی، یاخۆ کەسێکی تر بۆی نییە دەست بخاتە ناو ئابوورییەکەیەوە، تاکە فلسێکی لێ خەرج بکات، خۆ گەر شتی وەها ڕوویدا ئەوە گوناهباریی و ستەمکارییە، پێچەوانەی دەستوورو یاساو بەرنامەی خوایە، داوەری موسلمان ئەبێ ئە و مافەی بۆ وەربگرێتەوە، ئەگینا بە هیچ جۆرێك سامانی بۆ کەسێکی تر با باوك و دایك یان مێردیشی بێ ڕەوا نییە.

بەڵێ، ئەو ئافرەتە چەندێ دەوڵەمەند بێ، کەچی مەسرەفی هەر لەسەر مێردەکەیەتی، لە هەمان کاتدا لەسەر مێردەکەی پێویستە کە سامان و دارایی ژنەکەی بپارێزێ، لە هەمو ناپاکێك، بۆی نییە لە سەر خەرج کردن و بەخشیینی

کەفەدەمێی لەگەڵدا بکات، سامەگەر ئەو خەرج کردن‌و بەخشیینە گوناهباریی تێدا بێت.[1] دەی خۆتان‌و ویژدانی خۆتان، تا ئێستاش هیچ یاسایەکی خۆرئاوایی یان خۆرهەڵاتی بەم شێوە دادگەرانەیە بەرژەوەندی ئافرەتی ڕەچاو کردووە؟

**8- پاراستنی خوێن‌و ئابڕوویی**

دڵپاك: مێردی موسڵمان، ئەبێ خوێنی ژنەکەی بپارێزێ، خۆی نەیڕێژێ‌و ڕێگەش بەهیچ کەس نەدات کە خوێنی بڕێژێ (واتە بیکوژێ) چونکە شتی وەها لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ‌و ڕێك ناکەوێ.

هەروەها پێویستە ئابڕوو شەرەف‌و کەرامەتی بپارێزێ، لەهەر شتێ کە دێتە ڕێگەی ژنەکەی‌و ئەویش (مێردەکەی) لە توانایا هەیە.

بێ گەردی پاراستنی ژن، هیشتنەوەی سومعەی بە پاکیی، دوورگرتن‌و دوورخستنەوەی لە دەم‌و زمان‌و بەدگۆیان‌و بەدکاران، ئەرك‌و واجبێکی گەورەی ئەستۆی مێردەکەیەتی.[2]

ئەوانەی باسمان کردن هەندێکن (نەك هەموو) لە مافی ئافرەت بەسەر مێردەکەیەوە، بەجێ هێنانیان، یانی بەگوێکردنی خواو پێغەمبەر. لادان لێیان، واتە لادان لە شاڕێگەی ئیسلام.

سکاڵا: بە ڕاستی ئایینەکەمان بێ وێنەیە و خۆمان تاوانبارین.

[1] فقه السنة ، ج2: السيد سابق.

[2] المرأة بين البيت والمجتمع : البهي الخولي.

# بەشی دەیەم

## مافی پیاو بەسەر ژنەوە

**سکاڵا: خوشکە دڵپاك، مافی ژنت بەسەر مێردەکەیەوە بۆ باس کردین، دیارە مێردیش مافی بەسەر ژنەکەیەوە هەیە، حەز ئەکەم ئەو مافانە بزانین.**

**دڵپاك: بەڵێ، ئیسلام هەروەك مافی بۆ ژن دیاریی کردووە، ئەرکیش لەئەستۆی مێردەکەیدایە (وەك باسمان کرد) دەی بەرامبەر مێردەکەی ئەرکیشی ئەکەوێتە سەرشان، بەم جۆرە ئەرکەکە ئەبێتە نرخی مافەکە. ئەو ئەرکانەی سەرشانی (کە ئەبنە مافی پیاو بەسەر ژنەکەی خۆیەوە) ئیسلام سنووری بۆ دیاریی کردوون، واتە بێسنور (مطلق) نین. ئەمانەش هەندێکن لەو مافانەی پیاو بەسەر ژنەکەیەوە.**

### 1ـ بەگوێ کردنی ( الطاعة )

**دڵپاك: خوای پەروەردگار بە گوێ کردنی مێردی لە کارو گوفتاری حەڵاڵدا، لەسەر ژنەکەی خۆی پێویست کردووە. ئەوەش بەرامبەر بە مەسرەف کێشان لە لایەن پیاوەوە، هاوتا ئەبێتەوە. بەڵام لە هەر کارو گوفتارێکدا کە ناڕەوا بێت، ژن بۆی نییە بە گوێی مێردەکەی بکات، تەنانەت لەوەدا بە گوێ کردنی تاوان و گوناحە. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "لا طاعة لمخلوق فی معصیة الله"[1]. (متفق علیە)**

**وەك ئەزانین، خێزان دەزگایەکی زۆر گەورەو گرنگە، لە هەموو دەزگا جۆر بە جۆرەکانی تری ناو کۆمەڵگە گرنگ ترە، چونکە کارگەی پێگەیاندنی ئادەمیزادە. ئێ، خۆ ئەبێت ئەو دەزگایە سەرۆکێکی هەبێت، کەسانی ئەو خێزانە بە گوێی بکەن، دەزگای بێ سەرۆك بێ کەڵکە، ئەنجامەکەی وێرانیی و کاول بوون و تیاچوونە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ زۆر بایەخی بە بوونی ئەو سەرۆکە داوە و فەرمانی بوونی داوە کە لە هەموو کۆمەڵێکا (هەرچەندە ئەو کۆمەڵەش بچووك بێت) سەرۆکێکی هەبێت، تەنانەت ئەگەر لە دوو کەسیش پێك هاتبێ، ئەفەرموێ: "اذا خرج ثلاثة فی سفر أمروا أحدهم، حتی الاثنان اذا خرجا فی امر أمرا أحدهما"[2] دەی خۆ خێزان پێویستی بەو سەرۆکە گەلێ زیاترە، ئەی نابێ کاروباری خێزانەکە ڕاپەڕێنرێ؟ نابێ کەسێك هەبێت پێداویستییەکانی جێبەجێ بکات و بە پاکیی و ووردیی و ژیرانە سەرپەرشتی ئیش و کاری ئەندامەکانی بکات، بە جۆرێك کە مافی هیچ ئەندامێك پێشێل نەکرێت؟**

**بمانەوێ و نەمانەوێ پیاو ئەوەی لێدێت نەك ئافرەت، چونکە مێژوو و واقیعو زانیاریی ئەوەیان سەلماندووەو چاکتریش ئەیسەلمێنن. ئیسلامیش لەبەر بەرژەوەندی خێزانەکە، بە گوێ کردنی مێردی لەسەر ژنەکەی واجب کردووە. بە ڕادەیەك ئەو بە گوێکردنەی کردوەو بە بەشێك لە جێبەجێکردنی فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەر ئەفەرموێ: "لو کنت آمرا أحدا أن یسجد لاحد، لامرت النساء أن یسجدن لأزواجهن لما جعل الله لهم علیهن من الحق". (صحیح البخاري).**

**حاکم لە خاتوو عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: "لە پێغەمبەرم پرسی: کێ مافی بەسەر ژنەوە لە هەموو کەس زیاترە؟ فەرمووی: مێردەکەی. گوتم: ئەی کێ مافی لەهەموو کەس بەسەر پیاوەوە زیاترە؟ فەرمووی: دایکی".**

**ئاواز: ئەی خاك بەسەر ئافرەتدا! ئای چ هەڕەشەیەکی لێکراوە!**

---

[1] البیت الاسلامی کما ینبغی ان یکون / مقداد یالجن.

[2] البیت الاسلامی کما ینبغی ان یکون / مقداد یالجن.

دڵپاك: بەڵام ئیسلام تەنیا بە هەڕەشەکردن ڕوو ناکاتە ئادەمیزاد، بەڵکو زیاتر بە مژدە پێدان ڕووی تێئەکات، ئەوەتا خوای پەروەردگار مەدحی ئەو ئافرەتانە ئەکات کە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، لە یاسای ژمارە (33)ی النساء دا ئەفەرمووێ: " فالصالحات .." هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "خیر النساء اذا نظرت الیها سرتك واذا امرتها أطاعتك، واذا غبت عنها حفظتك فی نفسها ومالك". (النسائي وغیره بسند صحیح). وە لە پاداشتی بە گوێ کردنی مێردیدا ئافرەت بەهەشت مسۆگەر ئەکات. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "أیما امرأة ماتت زوجها عنها راض دخلت الجنة". (البخاري). هەروەها بە گوێکردنی پیاو (مێرد) بە تێکۆشان (جهاد) لە ڕێی خوادا ئەنوسرێت بۆ ئافرەت. پێغەمبەر ﷺ لە وەڵام ئافرەتێکا کە بە نوێنەر (وفد) هاتبووە خزمەتی فەرمووی: "بەهەر ئافرەتێك گەیشتی، پێی ڕابگەیەنە کە بە گوێکردنی مێردەکەی و ددان نان بەو مافەیدا کەوا بەسەریەوە، هاوتای جیهاد ئەبێت" (عن ابن عباس).

بەڵێ، ئیسلام بەجێهێنانی فەرزەکانی ئایینی لەگەڵ بەگوێکردنی مێرددا بۆ ژن، داوەتە پاڵ یەکتر، وەك نوێژوو ڕۆژوو بۆی باسکراوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: "اذا صلت المرأة خمسها، وصامت شهرها وحفظت فرجها، واطاعت زوجها قیل لها أدخلی الجنة من اي أبواب الجنة شئت". (رواه احمد والطبراني). لەگەڵ ئەوەدا، بەشی زۆری ئافرەتانی ناو دۆزەخ بە هۆی سەرپێچی کردنی مێردەکانیانەوە ئەچنە ناو ئەو ئاگرە، چاکەو خێرو بێری مێردەکانیان لە دنیادا بە هیچ دائەنێن، هەرکە دەمیان گەرم بوو هیچ چاکەیەکی مێردەکانیان ناهێننەوە یاد. بۆیە لەم ڕووەوە بێداریان ئەکاتەوەو ئەفەرمووێ: "اطلعت فی النار فاذا أكثر اهلها النساء. یكفرن العشیر، لو احسنت الى أحداهن الدهر، ثم رأت منك شیئا قالت: مارایت منك خیرا قط". (راوه البخاري).

سکاڵا: مامۆستا ئاواز، بۆ هەڕەشەکانی خێرا خاکت کرد بەسەر ئافرەتدا، کەچی بۆ ئەو هەموو مژدە گەورانە دەمت نەکردەوە! بۆچ؟!

ئاواز: ئاخر نەمزانی کە ئەم مزگێنییانەیان بە دواوەیە.

## 2ـ مافی سەر جێگە ( نوێن)

دڵپاك: لەسەر ئافرەت پێویستە کە مافی سەرجێگەی پیاو نەفەوتێنێ، پێشێلی نەکات، ئەبێ هەرکە ویستی ژن بە گوێی مێردی خۆی بکات، بەڵام ئەگەر ژنەکە بەهانەیەکی شەرعیی هەبوو، ئەوە شتێکی ترە.

هەروەك زانراوە و ئاشکرایە، سروشتی لاشەیی پیاو ناچار ئەکات کە بارگەی جنسیی خۆی خاڵی بکاتەوە و فرێی بداتە دەرەوە، ئەمەش دیاردەیەکی سروشتییە و ئەبێ ددانی پیا بنرێت، ئەوەش بە پێی ئەو کاتانەی کە پیاو زۆری بۆ دێت. بە مانەوەی ئەو بارگەیە لە لەشدا، پیاو سەری لێ تێك ئەچێت، زۆر شتی لێ ئەشێوێت، وای لێدێت کە بە چاکیی نەیپەرژێ بەسەر ئیش‌وکارییەوە، بەسەر بەرهەم هێنانەوە. ئینجا بۆ ئەوەی بتوانی بەرەنگاری گیروگرفتەکانی ژیان بکات بە شێوەیەك کە دوو دڵیی و ئاژاوەی دەمار (عصب)یی بە کۆڵەوە نەبێت، ئەبێ ژن بەدەم داوای مێردەکەیەوە بچێت. خۆ ئاشکرایە کە پیاو لە سەردەمی گەنجێتیدا زیاتر پێویستیی بە جنس هەیە (تەنها لە ژمارەی جارەکاندا).

سکاڵا: دەی خۆ ئەو کارە بۆ ئافرەتیش لە کەڵکو خۆشییدا، وەك بۆ پیاو وەهایە، هی هەردووکیانە، پەیوەندی بە هەردوو لایانەوە هەیە، وەك باسی ئەکەن، ئافرەت لە پیاو بۆی بە پەرۆشترە، چ لە ڕوویی لاشەیی و چ لە ڕووی دەروونییەوە، ئیتر بۆچ ژن بیکات بە منەت بە سەر مێردەوە؟ بۆچ بە گوێی نەکات؟

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، لەبەرئەوە چاکتر وایە ژن‌و مێرد پێکەوە بسازێن. چۆن لە ڕووی گیان‌و دەروون‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووریی‌و لایەنەکانی تر ئەسازێن، هەر بەو جۆرەش لەم لایەنەشدا بسازێن. مێرد لە کاتێکا کە ئەو حەزە زۆری بۆ ئەهێنێ‌و دەمارەکانی پێوەی ئەپەشۆکێت، ئەگەر بێت‌و ژنەکەی بە گوێی نەکات، ئەزانن کە ئەنجامی باش نابێت؟ ئایا کارێکی چاکە ئەگەر لە ماڵ بچێتە دەرەوەو بگەڕێ بە دوای داوێن پیسییدا..؟ خۆ ئاشکرایە ئەوە تاوانێکی گەورەیەو بەشی سەرەکیی ئەو تاوانەش هی ژنەکەیەتی، کۆمەڵگەی پاك بەوە ڕوو ئەکاتە پیس بوون. ئەی ژنەکەی با مێردەکەشی خۆش نەوێت، دڵنیام هەرگیز حەزناکات کە مێردەکەی بە لەش‌و حەزو هەست‌و سۆزییەوە خۆی بخاتە باوەشێکی

بێگانەوە.

لەبەرئەوە ئیسلام، پێویستی کردووە لە سەر ژن، کە هەر کاتێك مێردەکەی ئارەزوی ئەو سەرجێگەیەی کرد، ئەبێت بچێت بە دەمیەوە، خۆ ئەگەر نەچوو بەدەمیەوە ئەوا بە یاخی بوون لە خواو پێغەمبەر ﷺ دادەنرێت. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "اذا دعا رجل امراتة الى الفراش فأبت أن تجيىء، فبات غضبان عليها، لعنتها الملائكة حتى تصبح". (متفق عليه). "اذا باتت المراة مهاجرة في فراش زوجها لعنتها الملائكة حتى ترجع". (صحيح البخاري).

بۆ هێنانەدی ئەم مافە، ئیسلام بڕیاری لەسەر ئەوەیە کە ئافرەت بۆی نییە ڕۆژووی سوونەت بەبێ مۆڵەت و پرس و ڕەزامەندیی مێردەکەی بگری ئەگەر مێردەکەی لەوێ بێت: "حق الزوج على زوجته ألا تمنعه نفسها ولو على ظهر قتب (بعير) وألا تصوم يوما واحدا الا باذنه، الا لفريضة، فان فعلت أثمت ولم يتقبل منها". (أبوداود والطيالیسي).

سکالاّ: دەی ئەوا پیاو لە کاتێکا ئەوەی ویست لە ژنە بەسەزمانەکەی بەهۆی بەهانەیەکەوە بۆی نەکرا، خۆ پیاوان (بێ بەلاّ بن) لەوەدا زۆر نەوسن و چڵێسن! ئەی چار چییە؟

دڵپاك: پێش کەمێك باسی ئەوەمان کرد، ئەگەر بەهانەکە شەرعیی بێت، ئەوە ژن تاوانبار نابێت. ئەو حوکمە بۆ حاڵەتی بێ بەهانەییە. ژن لەم سێ حاڵەتەدایە کە ناچێت بەدەم مێردەکەیەوە.

حەز لە مێردەکەی ناکات و ڕقی لێی ئەبێتەوە، ئەم نەك هەر لە کاتێکی تایبەتی یان دیاریکراودان بەڵکو هەمیشە وەهایە لەگەڵیان جا ئەگەر وابوو چاکتر وایە ڕێگەی سروشتی خۆی بگرێتە بەر و بە یەکجاریی لێی جیا بێتەوە، ئەمەش ڕێگەیەکی ڕەوایە.

حەز لە مێردەکەی ئەکات و خۆشی ئەوی، بەڵام ئارەزووی جنسی نییەو لە کارەکەی ڕائەکات، ئەمەش بارودۆخێکی سایکۆلۆجی لە سروشت ترازاوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بارودۆخە لە واقیعی ژیاندا هەیە. هۆی ئەمە وانەبێت زۆر حەزیی یان زۆرداری پیاو بێت، وەك هەندێ کەس بۆی ئەچن، حاڵەتێکی سایکۆلۆجییە، پێویستی بە چارەسەریی هەیە. چارەسەریش زیاتر بە ڕێککەوتنی ژن و مێردەکە ئەبێ.

پیاوەکە یان ئەبێت ئارەزووی جنسیی خۆی بە گۆڕ بکات و وازی لێ بێنێ و ئەو قوربانییە بدات. یان ئەبێت ئافرەتەکە قورسی بارەکە بگرێتە سەرشانی خۆی، چونکە مێردەکەی خۆی خۆش ئەوێت و نایەوێ جیا بێتەوە لێی. یاخۆ ئەوە هەیە ڕێگەی پیاوەکە بدات کە ژن بهێنێ . ئەگەر ئەو ڕێگایانەیان نەگرت، دیارە ئەبێ بە ڕێگەیەکی چاك لە یەکتر جیا ببنەوەو هەریەکەیان ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر.

مێردەکەی خۆی خۆش ئەوێت، ڕقیشی لە جنسی نابێتەوە، بەڵام لەو کاتەدا کە مێردەکەی ئامادەیە بۆ کارەکە، ژنەکەی حەزی لێی نییە. ئەمەیان کاتییە، چارەسەرکردنی ئاسانە، چونکە لەوانەیە لە ئەنجامی ماندووبوون، وەڕسیی، بیر پەشۆکاندنەوە بێت، کاتییەو دوایی بەسەر ئەچێت، بە ئامادەکردنی جەو بارودۆخێکی لاشەیی و دەروونیی گونجاو ئەڕەوێتەوە. لەم ڕووەوە پێغەمبەر ﷺ هانی پیاوان ئەدات کە بە نەرمو نیانی و یاریی و دەس بازیی کردن لەگەڵ ژنەکانیاندا بچووڵێنەوە، پێش ئەوەی دەست بدەنە کارەکە، تا بریتی بێ لە پێدان و لێوەرگرتن، کارەکەش لە کایەی لاشەیی و لە شێوەی ئاژەڵیی ئەچێتە دەرەوەو شیوەیەکی ئاسایی و ئادەمیزادانە و وەڵامدانەوەیەکی لاشەیی و دەروونی بۆ مێردەکەیی و ژنەکەی ساز ئەکات و بێ هەوەسیی و سڕوساردیی ئافرەتەکە ئەڕەوێتەوە. بەوەش گیرو گرفتەکە نامێنی.[1]

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموی: "لايقع أحدكم على أمراته كما تقع البهيمة، ولكن بينكما رسول، قيل: وما الرسول يا رسول الله؟ قال: القبلة والكلام". دیسانەوە زیاتر لەوەش ئەفەرموێ: "اذا جامع أحدكم أهله (زوجته) فليصدقها، ثم اذا قضى حاجته قبل أن تقذى حاجتها فلا يعجلها حتى تقضى حاجتها". خۆ ماناکەیان تێ ئەگەن، پێویست ناکات بیکەم بە

[1] بۆ زیاد زانین تەماشای (شبهات حول الاسلام) دانانی محمد قطب بکە.

کوردیی بۆتان.

سکاڵا: ئەی باوکە گیان! ئەم هەموو بایەخ پێدانو ووردەکارییە، لەو جۆرە کارەدا، لە ئیسلامدا هەیە؟! ئەی ئیتر خەڵك چۆنو بۆچ ئەڵێت، ئیسلام ددان بە جنسدا نانێتو داوای کەبت کردنی ئەکات؟

دڵپاك: ئەگەر بەجێهێنانی پێویستی جنس بەشێوەی مەڕو بەرانیی، مانگا کەڵیو بزنو سابرینی بکرێت، بەڵێ ئیسلام ددانی پیادا نانێ، ئەگەر ژن وەك تاکسی کرێ بێتو پیاویش خۆی بە ئارەزووی خۆی سەر بە هەر ئاودەستێکی بۆگەندا بکات، بیکات. بەڵێ ئیسلام هەرگیزاو هەرگیز ددانی پیادا نانێت. خۆ ئەگەر بەشێوەیەکی پاکی مرۆڤانەی ڕەوا بێت، باسم بۆ کردنو گەڵێکتان بیست لەو بارەیەوە.

ئاواز: ئەی ئەگەر پیاوەکە نەچوو بەدەم حەزی ژنەکەیەوە، چی ئەبێ؟

دڵپاك: وا دیارە تووشی لە بیرچوونەوە بوویت! ئەی لە مافی ئافرەتدا بەسەر مێردکەیەوە، باسمان نەکرد؟ ئەوە مەر بە دەگمەن ڕوو بدات، ئەو یاسا ئیسلامییەی کە مافی پیاو ئەپارێزێ لەو ڕووەوە، مافی ئافرەتیشی بەجوانی پاراستووە، ماف بۆ نێرو بۆ مێ هەر مافەو ئەبێ بپارێزرێت.

ئاواز: چوزانم؟! لەبیرم چووبۆوە، ماڵت ئاوابێ، ئەڵێی پیرە مەلایەکی خاوەن دوو، سێ ژنی، چوویتەتە بنجو بناوانی مەسەلەکە!

### 3ـ نامەحرەم نەیەتە ماڵەکە

دڵپاك: مافی پیاوەو لەسەر ژنەکەی پێویستە کە نەهێڵێت پیاوی بیگانە و نامەحرەم بێنە ماڵەکەی، بە تایبەتیی ئەو کەسانەی کە مێردەکەی حەز لە هاتنو لەناوچاویان ناکات. لێرەدا وا تێ نەگەن کە مەبەست ئەوە بێت، گوایا هەر لە بنەڕەتدا، لە هەر لایەکدا ببی، جگە لە بۆ مێردی خۆی، حەرامە، بەڵکو مەبەست ئامۆشۆکردنو هاتوچۆیە.

سکاڵا: خوشکە دڵپاك، کە هاتو ئافرەت خۆی پاراست، خۆ ئەو کەسانەش ماڵەکە ناگرن بە کۆڵیانەوە! ئیتر بۆچ وا؟

دڵپاك: لەوەدا کە ئەڵێیت، ماڵەکە ناگرن بە کۆڵەوە، ڕاست ئەکەی. بەڵام مەبەستەکە لە ماڵ گرتن بە کۆڵەوە گەورەو گرنگ ترە، کێ ئەڵێ کە هەمیشە ژنەکە خۆی بپارێزێ؟ ئایا بە هۆی هاتنو ئامۆشۆکردنی ئەو کەسانەوە، پیاوەکە (مێردەکە) دڵی بە پاکیی ئەمێنێتەوە؟ ئایا خەڵك لە دەم بەتاڵی و بوختان کردن ئەکەوێ؟ ئەگەر بوختانێك کرا، ئەنجامەکەی چاك ئەبێت؟ ئاژاوەو ناکۆکیی ناکەوێتە نێوان ئەو ژنو مێردەوە؟ کێ ئەڵی بە هۆی ئەوەوە جیابوونەوە ناکەوێتە نێوانیانەوە؟

جا لێرەدا مەبەست ماڵ بە کۆڵەوە گرتن نییە. لەوانەیە ئەو جۆرە کەسانە کەڵكو قازانجێکی زۆریشیان هەبێت، بەڵام ئەوە هەرگیز پەڕۆو پینەی دڵ کرمۆڵیی مێردەکە ناکاتەوە، بەهەر جۆرێك بیگریت ئەنجامەکەی باش نابێت. ماڵ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەرزو پیرۆزە، هێلانەی بەختیاریی و شادمانیی ژنو مێرد و ئەندامانی خێزانە. جا بۆ ئەوەی ئەو هێلانەیە بەسەلامەتیی بمێنێتەوە، ئەبێ ئەو ئیحتیاتییەی بۆ بکرێت. ئەی نازانن کە "خۆپاراستن لە چارەسەرکردن چاکترە"؟

ئەو هاتوچۆیە دانەبڕاوە بەسەر نێردا بە تەنها، بەڵکو مێیش ئەگرێتەوە، هەندێ ئافرەتی گومان لێکراو هەن کە پیاو حەز ناکات ئامۆشۆی ماڵی بکەن، ئەبێ ژنەکەی نەهیڵی بێنە ماڵی.

ئاواز: ئەی ئافرەتیش ئەو مافەی هەیە؟ واتە بۆی هەیە نەهێڵی ئەو کەسانەی کە حەزی لە هاتنیان نییە، قەدەغەیان بکات؟

دڵپاك: چاوەکەم، لە کاتی هێمنیی و ئارامیی و سۆزو خۆشەویستییدا ژنو مێرد، ئەتوانن دابنیشنو نەخشەی ژیانی خۆیان لە هەموو ڕوویەکەوە بکێشن، هەموو شتێکی تێدا بە گوێرەی ڕێککەوتنی ژیریی خۆیان دیاریی بکەن. لە یەکتر بگەنو نەهێڵن هیچ جۆرە چەکروپیکانو ناکۆکییەك ڕوویان تێ بکات.

بەڵام ئەبێ ئەوەش بێنینە بەرچاو کە هەڵچوونەکانی ئافرەت و دڵ ناسکییەکەی لە هەموو کاتو حاڵەتێکدا، پڕ لە

ژیریی نین، لە جێی خۆیانان نین. زۆر جار دڵ کرۆمۆڵیی و خۆشەویستیی ئافرەت کەسێتی (شخصیی)یە نەك بەرژەوەندی خێزان. گەڵێ جار ئەوە پاڵ بە ئافرەتەوە ئەنێت کە ڕقی لە دایك و باوك و خوشك و برای مێردەکەی بێت. لەبەرئەوەش ناچارکردنی پیاو، بەوەی هەرکەسێ ژنەکەی حەز لە چارەی نەکات، پیاوەکە نەهێڵی بێتەماڵی، لە ئیسلامدا نییە. چونکە ناچارکردنی بەو جۆرە، بەرژەوەندی خێزانەکەی تێدانییە، داوای ژنەکە لەبەرژەوەندییەوە دوور، لە ئەنجامی شۆڕشێکی پر لە هەڵچونی کاتیی ئافرەتەکەوەیە، تەنانەت ژنەکە خۆی دوای نیشتنەوەی کەف و کوڵی هەڵچونەکەی، کە کەمێك سارد بووە، هەر خۆی لە ئەنجامی کار یان داواکەی پەشیمان ئەبێتەوە. لەبەرئەوە ناچار کردنی پیاو بۆ ئەو مەبەستە لە ئیسلامدا ناوی نەبراوە.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسانە کە ئافرەتەکە حەز لە چارەیان ناکات و نایەوێ بێنە ماڵەکەی، جێگا گومان بوون، بە تایبەتیی ئافرەتێك کە گومان لێکراو بێت، بێگومان پیاوەکە ناچار ئەکرێت.

ئاواز: ئەمەیانم بەلاوە زۆر جوان و پەسەندە. دادگەریی تیایە.

دڵپاك: یاساکانی ئیسلام هەموویان جوان و پەسەندو پڕ لە دادگەریین، "صبغه الله ومن أحسن من الله صبغه.."؟ ئەوەی کەباسمان کرد، ئەوە ناگەیەنێ کە ئیسلام هەمیشە پیاو لە خانەی هەق و ئافرەت لە خانەی ناهەقدا دابنێ. بەڵێ، زۆرجار ڕوو ئەدات کە پیاو مناڵ ئاسا ڕەفتار ئەکات، بەهانە ئەگرێت و دوور لە ڕاستیی ئەبێت. کەچی ئافرەت بە ژیرانە ئەجووڵێتەوە لەسەر هەقە. بەڵام ئیسلام تەماشای گشتیی (عام) ئەکات لە مەسەلەکەدا، بە گشتیش پیاو زیاتر لە ژیرییەوە نزیك ترە، ئافرەتیش لە هەڵچون و سۆزەوە. هەمیشە دەرگاش وازە بۆ ئافرەت کە بتوانێ مافی خۆی بسێنێت هەرکە باری لار و خواری مێردەکەی خۆی بینی. دەبا یاساکە بگرینە گوێ: ".. فحقكم عليهن ألا يوطئن فروشكم من تكرهنه، ولا يأذن في بيوتكم من تكرهونه". (رواه أبن ماجة والترمذي وقال حديث حسن صحيح).

### 4- پاراستنی ئابڕوو سامان

دڵپاك: کاتێ کە پیاو لە ماڵەوە نابێت، لەسەر ئافرەت پێویستە کە شەرەف و سامانی مێردەکەی بپارێزێ، واتە ناپاکیی نەکات، کارێ نەکات کە سەرشۆڕیی بێنێ بەسەر مێردەکەیا چ بە ئاشکرا و چ بە نهێنیی. وە ئەبێ پارێزگاریی ئەو سەروەت و سامانە بکات کە مێردەکەی خستویەتییە ژێر دەستیی و سپاردوویەتی پێی. ئەمەش زۆر گرنگە و پێویستییەکی ئێجگار گەورەیە لە ئەستۆی ئافرەتدا. پێغەمبەر ص ئەفەرموێ: "وألا تعطي من بيتها شيئا الا بأذنه ، فان فعلت، له الأجر وعليها الوزر..". (رواه أبوداود الطيالسي). ئەمە لە بارەی پاراستنی سامانەوە. خۆ ناپاکیی کردن لە شەرەفدا بە هیچ کلۆجێ لە ئیسلامدا ڕێگەی پێنەدراوە.

هەر بۆ زیادە دڵنیایی کردن، لە حەجی ماڵ ئاواییدا، پێغەمبەر ﷺ بە موسڵمانانی ڕاگەیاند: "فحقكم عليهن ألا يوطئن فروشكم من تكرهون ولا يأذن في بيوتكم من تكرهون..". (ابن ماجة والترمذي).

وا بزانم ئەمەیان ئیتر پێویستیی بە درێژە پێدان نەبێت، چونکە ئیسلام و ناپاکیی کردن بە تایبەتیی لە ئابڕوو و شەرەفدا بە هیچ شێوەو جۆرێك یەك ناگرن و پێکەوە نایان کرێ، جا ئەگەر ڕێگەی ئەوە نەدرێت کە پیاو یان ئافرەت وە کە مێردەکە حەز لە چارەی نەکات بێتە ماڵەوە لەسەر جلێ دابنیشێ، خۆ ناپاکیی کردن هەرگیز بەو پێوەرو پێوانەیە ڕێی پێنادرێ ، تەنانەت مێردەکەش ئەگەر پێی ڕازیی بێت هەر نابێت.

سکاڵا: چۆن پێویست بە درێژە پێدان ناکات، هەی خوا عەفووت بکات؟ پارێزگاریی نەکردنی شەرەفی پیاو (کە لە پلەی یەکەمدا هی ئافرەتەکە خۆیەتی) و ناپاکیی کردن، گەورەترین کار ئەکەنە سەر دەرونی پیاو، زۆربەی زۆری ئەو گیروگرفتانەی کە ئەبنە هۆی کاول بوونی خێزان و ماڵ جیابوونەوەی ژن و مێرد و سەرلێشێوانی مناڵان، هۆیەکەیان ناپاکیی کردنە لە شەرەفدا.

بە ڕاستیی هیچ تاوانێك لە گەورەییدا، ناگاتە ئەم تاوانە. هەموو هەڵەو کارو گوفتارێکی تر شیاوی لە بیرچوونەوەو زام ساڕێژ بوونە، ئادەمیزاد ئەتوانی چاوپۆشییان لێ بکات. بەڵام تاوانی ناپاکیی لەشەرەفدا نەء، ئەگەرچی بە

ڕواڵەتیش چاوپۆشیی لێ بکرێت و گڵی بدرێت بەسەردا، بەڵام سۆو چڵی زامەکەی لەدڵو دەروون و میشکدا هەرگیز نابڕێتەوەو بەسەر ناچێت، وەك قومبەلەیەکی تەوقیت کراو وەهایەو هەر ئەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان بتەقێتەوە .

لەبەرئەوە، پێویستە لەسەر ژن، لەسەر مێرد، کە خۆیان زۆر دوور بگرن لە ناپاکیی ، لەهەر شتێك کە گومان دروست ئەکات، تا فاك و فیك و قسەی بەدگۆیان لە نێوانیاندا نەتوانن جێی خۆیان بکەنەوە. دیارە چەند خۆیان لە هەڵوێستی گومان دروستکەر بە دوور بگرن، ئەوەندەش پەیوەندیی نێوانیان بە پاکیی و ڕێك و پێکی و گەرم و گوڕیی ئەمێنێتەوەو و بەردەوام تر بێت. ئای کە لەم ڕووەوە ئیسلام چاك بۆی داچووە!

دڵپاك: ماشاء الله .. ماشاء الله!! هەر زۆر زۆر ڕاستە، خوا هیدایەتت بدات.

سکاڵا: بەڵام سەبارەت بە سامان وا هەژارێك، لێ قەوماوێك ڕووی کردە ئەو ماڵەو داوای خێرێکی کرد، خۆ ئیسلامیش داوا لە موسڵمانان ئەکات کە خێر بکەن و دەستگیرۆیی هەژاران بکەن. ئەی ئافرەت دەست بەستراو نابێت؟

دڵپاك: پرسیارەکەت جوان و بەجێیە، ئیسلام لەوەدا ڕێگە لە ژن ناگرێت، مێردەکەی مۆڵەتی بدات چاکترە، ئەگەر مۆڵەتیشی نەدات هەر ئەکرێت و هەردوولاش خێریان ئەگات، بەڵام بە مەرجێك کە ئەو خێرو دەسگرۆیە نەبێتە هۆی لە ناوبردن (أتلاف)ی سامانی مێردەکەی، یان مەبەستی زیاندانی مێردەکەی نەبێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "اذا أنفقت المرأة من بيت زوجها غير مفسدة له، كان لها أجرها وله مثله ما كسب". (رواه الجماعة). ئیسلام ئەو دەستەڵاتی خێرکردنەی داوە بە ژن لە سامانی مێردەکەی، کەچی پیاو بۆی نییە یەك فلس، بە هیچ شێوەیەك لە سامانی ژنەکەی خەرج بکات یان بدۆڕێنێ یان ببەخشی، سا مەگەر ژنەکە بزانێ و ڕازیی بێت و مۆڵەتی مێردەکەی بدات!

سکاڵا: بەو پەڕی دڵنیاییەوە ئەتوانم بڵێم، ئیسلام لەم ڕووەوە فەزڵی ئافرەتی داوە بەسەر پیاودا. خوا یاربێت ئەم باسانە بۆ سەربەست و هەڵکەوت و نەشمین و ئەوان باس ئەکەم، بەڵکو کەڵکیان لێ وەربگرن.

بەخوا خەڵك لە بی کەسیدا پشتی لە ئیسلام کردووە، کەس نییە بە خەڵکی بگەیەنێ، ئەگینا بەرنامەیەکی بێ هاوتایە لە تەواویی و تێرو پڕییدا.

ئاواز: ئەی قوڕ بەسەر ئەو کەسەدا کە ئەبێتە هاوسەری سکاڵا! هەر لە ئێستاوە چەند لایەنگریی خانەگومانیی ئەکات!!

دڵپاك: بەڵام من ئەڵێم، ئەی سەد خۆزگەم بەو پیاوەی کە مامۆستا سکاڵا ئەبێتە هاوسەریی! ئای چەند دڵی حەساوە، گیانی ئارام، دەمارەکانی هێمن ئەبن! ئای چەند سەربەرزو شەرەف پارێزراو و بەختەوەر ئەبێ !

خوشکی بەڕێزم، شەرەف پاراستن و ئابڕوو نەتکاویی، پێیان ناگوترێت خانەگومانیی، خۆ ئەگەر ئەوانە خانە گومانیی بن، دەی بە خوا موسڵمان زۆر بە پەرۆشەوە ئەو خانەگومانییەی لا پەسەندو بەنرخە. دەبا شەرەف و ئابڕوو تکاویی هەر پیرۆزی نا موسڵمان بن مادام بە خانەگومانییان ئەزانێ و فیزو گەشخەیان پێوە ئەکات.

بەڵێ، شەرەف و حەیاو ئابڕو پاراستن، سەربەرزیی و خۆدوور گرتن لە ناپاکیی کردن، بە تایبەتیی لەگەڵ هاوسەری ژیاندا، ئەگەر ئەمانە پێیان بگوترێت خانەگومانیی، پەروەردگار ئەو خانەگومانییەی خۆش ئەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی ئەوێت، هەموو موسڵمانێکی ڕاست و تەواو خۆشی ئەوێت و بەری نادات.

بوخاریی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "أن الله يغار، وان المؤمن يغار، وغيرة الله أن ياتي العبد ما حرم عليه". دیسانەوە فەرمویەتی: "ما احد أغير من الله، ومن غيرته الفواحش ما ظهر منها وما بطن".

دیسان هەر لەم ڕووە فەرمویەتی: "ثلاثة لايدخلون الجنة أبدا: الديوث والرجلة من النساء ومدمن الخمر." لێیان پرسی: دەیوس چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: "ئەو کەسەیە کە خەڵك ئەچێتە لای شەرەفی، کەچی گوێی پێنادات" "الذى لايبالى من دخل على اهله" (رواه الطبرانى).

بەڵام ئیسلام هەموو شتێك و هەموو لایەنێکی ڕەچاو کردووە و حیسابی ووردو تایبەتیی بۆ کردووە، جا هەر وەك مافی بە پیاو داوە کە ژنەکەی ئەبێ شەرەفی پارێزراو بێت، لە هەمان کاتدا داوایش ئەکات لە پیاو کە لەوەدا مام

ناوەندیی بێت، لە زەن بردندا زیادەڕەویی نەکات، لە هەموو هەڵس و کەوت و جموجووڵ و قسەیەکا حیساب بۆ ژنەکەی نەکات، چونکە ئەوەش ئەبێتە هۆی تێکچوونیان، ئەبێتە هۆی دروستبوونی ناکۆکیی و ئاژاوە لە ماڵەکەدا، بەوەش بەختیاریی و خۆشی ژیان لە خێزانەکەدا بار ئەکات.

پێغەمبەر ص ئەفەرمووێ: "ان من الغيرة ما يحبه الله و منها ما يبغضه الله .. فاما الغيرة التى يحبها الله : فالغيرة في الريبة، والغيرة التى يبغضها الله : فالغيرة في غيرة ريبة". (رواه ابوداود والنسائي وابن حبان). وە عەلی کوڕی ئەوب تالیب ئەفەرمووێ: "لا تكثر الغيرة على أهلك، فترامى بالسوء من أجلك"[1].

ئاواز: دەی تۆ ئەمەی ئەم دواییەت باس نەکرد دڵپاک، خەتای تۆ بوو. من ئەگەر ئەمەم ببیستایە ئەو قسەیەم نە ئەکرد.

سکاڵا: سوپاس بۆ خوا، قسەکەت بوو بە مایەی خێرو خۆشیی بۆ من.

### 5- جوانیی شێوازی هەڵسوکەوت

دڵپاک: لەسەر ژن پێویستە کە ڕێزی هەستی مێردەکەی بگرێت و بە شێوزای نەرم و نیان و جوان لەگەڵیا بجووڵێتەوە. ئەبێ بەرامبەر چاکەی مێردەکەی سپڵە نەبێت و چاکەی لەگەڵدا بکاتەوە، "هل جزاء الأحسان الا الأحسان". (الرحمن). ئەی ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشان و ڕەنجدانەی کە مێرد بە درێژایی ژیانی پێوەی خەریکە، بەرهەمەکی هەردووکیان نایخۆن؟ قابیلە مێردەکەی دوو ورگی هەبێت؟

ئاشکرایە کە مێرد بە هۆی پەیداکردنی گوزەرانەوە زۆر ماندوو ئەبێت، تووشی مەینەت و دەردەسەریی ئەبێت، تاڵاو سوێراو ئەچێژێت، بە ماندوویی گەلێ جار بە پەستی ئەگەڕێتەوە ماڵەوە، ژنەکەی ئەتوانێ بە ووشەی شیرین و هەڵس و کەوتی جوان و خەندەی سەر لێوانی ئەو هەموو ماندووبوون و پەستیی و وەڕسیی و ناڕەحەتییەی بشواتەوە، بیڕەوێنێتەوە، چالاکیی بخاتەوە گیان و لەشی مێردەکەیەوە. بەڵام مێرد کە گەڕایەوە ماڵەوە، دی ژنەکەی گوێی پێنادات، لەگەڵیا ڕەق و گرژو مۆنە، کە هاتەوە زمان قسەی ڕەق و ترش و تاڵە، مناڵان شپرزەو چڵکن و برسین. ئەو مێردە لەش و دڵ و مێشکی چەند ماندووبوون، سەد ئەوەندەی تر ماندوو ئەبن، چالاکیی ئەو مێردە ئەمرێت، دەست و دڵی بە تەواویی سارد ئەبنەوە، بێ هیوایی سواری سەرشانی ئەبێت، ژیانی لێ تاڵ ئەبێت، دونیای لەبەرچاودا تاریك ئەبێت، ماڵەکەی لێ ئەبێتە دۆزەخ.

نەرم و نیانی و ڕووخۆشیی نواندن، زەردەخەنەو جوانیی هەڵس و کەوت لەلایەن ئافرەتەوە ناوێزە (غريب) نین، بەڵکو بەشێکن لە سروشتی ئافرەت و خوا بەخشیوینی پێی، هەرکە بیەوێ ئەتوانێ بەکاریان بهێنێ. ئەگەر بەکاریان نەهێنێ، بێگومان لەسەر سروشتی خۆی ترازاوە.

ژن نابێت ئەو مافەی مێردەکەی فەرامۆش و پێشێل بکات، ئەگەر کردی ئەوا لای خوا بەرپرسیارە، سزای سەختی دۆزەخ چاوەڕوانی ئەکات، ئەها پێغەمبەر ﷺ ئافرەتان هۆشیارو ئاگادار ئەکاتەوە: "رأيت أكثر أهل النار النساء. قالوا لم يا رسول الله؟ قال: بكفرهن. قيل: يكفرن بالله؟ قال: يكفرن العشير ويكفرن الأحسان، لو احسنت الى أحداهن الدهر ثم رأت منك شيئا قالت: ما رأيت منك خيرا قط". (صحيح البخاري).

سکاڵا: دەی خۆ ئەم مافە ئافرەتیش بەسەر مێردەکەیەوە هەیەتی. ئەی ئەوە نەبوو بە ناوی (چاکیی هەڵس و کەوت) بۆت باس کردین؟ لەبەرئەوە من ئەم مافەی پیاو بەسەر ژنەکەیەوە بەبار نازانم، بەڵکو دادپەروەرانەیەو بە چاك ڕاستی ئەزانم و مافێکی دوولایەنی ئاڵ و گۆڕ پێکراو (متبادل)ە. ئەی ژیان بریتییە نییە لە بەخشین و پێدان و وەرگرتن؟

### 6- داوانەکردنی زیاد لە توانا

دڵپاک: ئەبێ ژن توانا و دەستەڵاتی مێردەکەی لەبەرچاو بگرێت. ئەوسا داواکانی لێی بە پێی ئەو توانا و دەستەڵاتە

---

[1] فقه السنة ، ج2، ل 188ك السيد سابق.

بن. نابێت داواکانی لە سەرووی دەستەڵاتی مێردەکەیەوە بن. ئاشکرایە هەموو کەسێك حەز لە بوونی هێزو سامانو دەستەڵات (بە تایبەتیی ئابوری) ئەکات، حەز ئەکات خۆی و ژنو زارۆڵەو کەسانی لە هەموو کەسێك زیاتر بن لەهەموو سەرێکەوە ، بەلاّم حەز شتێکەو بوونو بۆ لوان شتێکی تر، جا هەروەك لەسەر مێرد پێویستە کەمتەرخەمیو درێغی نەکات لە مەسرەف کێشانی ژنو ماڵو منالّیا، هەر بەو جۆرەش لەسەر ژن پێویستە داوای زیادە نەکا لە مێردەکەی، زیادە بەهانەی لیّ نەگرێت، لە توانای بووندا داوای لیّ بکا، ئەو ژنەی کە لە سنووری تواناو دەستەلاّتی مێردەکەی داواکانی دەرئەچن، گوناهبارە، پێغەمبەر ﷺهەرەشەی لیّ ئەکات: "أیما امراة أدخلت علی زوجها في أمر النفقه وکلفته ما لا یطیق، لا یقبل الله منها صرفا ولا عدلا الا أن تتوب وترجع وتطلع منه علی طاقته". (مکارم الأخلاق، للطبري، ص157).

ئاواز: بە دەگمەن ژن هەیە کە بەم جۆرە بێت، واتە بە قەد بەرەکەی پێی رابکیشێ، لای ئافرەت دەستەلاّت و توانای مێرد پولیّ ناهێنی، ئەو هەر داواکردنی لەسەرە، قوماشی یان شتێکی تری تازە بابەت داهاتو بوو بە مۆدەی، ئەو کە بیری دەستەلاّتو توانی مێردی لە مێشکا ئەمێنیّ؟

دڵپاك: دەی ئەوە پێچەوانەی یاسای ئیسلامەو ژنی پیّ گوناهبار ئەبێت.

### 7- سپاردە پەزێریی و پەروەردەکاریی

دڵپاك: سپاردە پەزێریی بۆ ئافرەت لەگەڵ مێردەکەیا، بەرامبەر ماڵ و منداڵیی، ئابڕوو و نهێنییەکانی ئێجگار گرنگە. ئەبیّ ژن لەوەدا جێگەی باوەڕو متمانەی مێرد بێت، جا ئەگەر ئەو جێگەی باوەڕو متمانە نەبێت، ئەی کێی تر بێت؟ بۆچ کەس هەیە لەو نزیکتر بۆی؟ خوای پەروەردگار بە گۆترە نەیفەرمووە: "هن لباس لکم وأنتم لباس لهن"؟

مێردو ژن ئەگەر بێتو سپاردەپەزێریی و متمانە پیّ بوون و باوەڕ بەیەکتر لە نێوانیاندا نەبێتو نەمێنیّ، هەرگیز بەختەوەریی لە ژیانیاندا نابینن، هەرگیز دڵیان هەست بە حەسانەوە ناکات، خێروبێر ڕوویان تی ناکات، هیچ کامیان ئارامیی بەخۆیەوە نابینیّ، هەمیشە بەرەو دواوە دێنو بەدبەختیی باڵی ڕەش ئەکێشی بەسەر خێزاندا.

سکالاّ: لەو جۆرە کەسانەم بە چاوی خۆم دیوە. دیوومە پیاو پارەو پوول و هەندیّ شتی تر لە ماڵەوە دانانیّو ئەیبات لە مالانی تردا بە سپاردە دای ئەنیّ. یاخۆ ئەگەر نهێنییەکی هەبێت، حەز ئەکات دنیا پێی بزانیو بە مەرجی ژنەکەی پێی نەزانیّ! دیوومە ئافرەت خشڵو کەلو پەلی خۆی قەت لە ماڵەکەی خۆیاندا نەهێشتۆتەوە، تەنانەت جلو بەرگەکەی، بردوویەتی لە ماڵێکی تردا دایناوە و نەیویستووە مێردەکەی بزانیّ لە کوێیە!!

دڵپاك: ڕاست ئەکەی. دەی ئەوەش پێچەوانەی فەرمانو یاسای ئیسلامە. ئەبی هەردوکیان بەرامبەر یەکتر سپاردە پەرێز بن، جێی متمانە بن، پێغەمبەر ﷺئەفەرمووێ: "کلکم راع وکلکم مسئول عن رعیته .. الرجل راع و مسؤول عن رعیته والمراة راعیة علی بیت زوجها وولده.." (صحیح البخاری).

ژن ئەبیّ بە تەنگ پەروەردەکردنو پێگەیاندنی منالّەکانییەوە بێت، چونکە ئەو لە ماڵەوەیەو لە ناو منالّەکانیدایە، بەلاّم مێرد لە دەرەوەیە و بە پەیداکردنی ڕۆزیی و بژێوییەوە پەشۆکاوە، ناپەردەژیّ بەسەر منالّەوە، کاتێکیش دێتەوە بۆ ماڵەوە ماندوە پێویستی بە حەسانەوە هەیە. ئەی بۆچ ئەڵێن: "دایك یەکەمین قوتابخانەیە"؟ ئەی هەر لەبەر ئەو دەورە مەزنە گرنگە نییە کە پێغەمبەر ئەفەرمویّ: "الجنه تحت اقدام الامهات".

### 8- جیّ نەهێشتنی ماڵو لەگەڵ مێرددا چوون

دڵپاك: ڕەنگە لە بیرتان بیّ کە گوتمان، پێویستە لەسەر مێرد خانوو یان جێگەی نیشتەجێبوون بۆ ژنەکەی پەیدا بکات، جا ئەبیّ ئەو خانووە جێگەیەکی شیاو بێت بۆ تیا ژیانی خێزان، هێمنییو ئاسایشی تیا بێت، ئەمەش پێی ئەگوتریّ (المسکن الشرعی).

بەرامبەر ئەو مافەی ژن بەسەر میردەوە، مێردیش مافی ئەوەی بەسەر ژنەکەیەوە هەیە کە نەهێڵیّ ژنەکەی ماڵەکە بەبیّ بەهانویەکی شەرعیی و ڕەوا بەجیّ بهێڵیّ و بچێتە دەرەوە، ئەگەر بێتو خۆی ئیزنی پێنەدات.

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، قسه هەڵمەگێڕەوەو یەکسەر هەڵمەچۆ، ئێمە کەی گوتمان نەچێتە دەرەوە؟ ئیسلام ڕێگەی ئافرەت ئەدات بۆ: سەردانی کەس‌و کار، خەستەخانە، خوێندن، سەر لە نەخۆشدان، بۆ سەر گۆڕستان، بۆ مزگەوت، بۆ ئیش‌وکارو کارکردنی ڕەوا، بۆ سەیران‌و دیتنی ئاهەنگ و هەموو کۆمەڵو کۆبوونەوەیەکی بە کەڵکی ئایینی‌و دنیایی کە شەرعیی بێت. لە سنووری شەرعا ڕێگری لیناکات. لەمە زیاتر چی ئەوێ؟ بەندینخانەی چی؟ ئەی بۆچی نەنگ‌و شوورەییە ئەگەر مۆڵەت لە مێردەکەی وەربگرێت؟ ئەی ڕەوایە، هەرکە ڕۆژ بووە خۆی ساف‌و لوس بکات‌و جانتاکەی بکاتە قۆڵیی‌و ئەم لاو ئەولا بسوڕێتەوە، ماڵ‌و منداڵ بەجی بهێڵێ، یان دەرگا دابخات‌و گەلێ جار کاتی خەوتن بگەڕێتەوە، مێردی بەسەزمانیش بە ماندوویی‌و شەکەتیی بگەڕێتەوە ماڵەوە، کەچی دەرگا دابخرێت‌و خانم هێشتا لە گەڕان نەگەڕابێتەوە؟ ئایا هاوسەریی وەها ئەبێ؟ سەربەستیی و ئازادیی وەها ئەبێت؟!

سکاڵا: لە فەرهەنگی ئاواز دا وایە، ئەی بەندینخانەی ناو نەبرد؟

دڵپاك: ئیسلام لەو جۆرە ئافرەتانە زۆر تووڕەیە، هەڕەشەی سەختیان لێ ئەکات: "حق الزوج على زوجته .. والا تخرج من بيته الا بإذنه ، فان فعلت لعنها الله والملائكة الغضب حتى تتوب أو ترع.." (أبوداود الطيالسي). بەڵام ئەگەر ماڵەکە مەرجی تەواوی تێدا نەبێت وەك هێمنیی و ئاسایش، مەڕافقی پێویست، یان ژنەکە تیایا تووشی زەرەر بوو، لەکەل‌و پەلەکەی دڵنیا نەبوو، یان دراوسیکانی خراپ بوون، ئەو مافە ئەڕوات‌و نامێنێ.

دیسانەوە پێویستە لەسەر ژن کە لەگەڵ مێردەکەیدا بگوازێتەوە ئەو بۆ کوی چوو، ئەبێ ژنەکەی لەگەڵیا بچێت، ئەمەش فەرمانی خوایە: "أسكنوهن من حيث سكنتم من وجدكم ولا تضاروهن لتضيقوا عليهن". (الطلاق 69). بیگومان ئەو گواستنەوەیە ئەبێ بۆ ژیان بێت و زەرەری پێوە نەبێت بۆ ژنەکە، خۆ ئەگەر پێوەی بوو ئەوە ژنەکە مافی بە گوێ نەکردنی مێردەکەی هەیەو ئەتوانێ بچێتە لای داوەر و قسەی خۆی بکات.

هەروەها هەر پیاوێ لە کاتی مارە بریین‌و ژن هێناندا، مەرجی لەگەڵا کرا کە ژنەکەی لەو ماڵەدا نەگوزاێتەوە بۆ ماڵێکی تر یان لەو شوێن‌و وولاتەوە بۆ شوین‌و وولاتێکی تر. ئەبێ مێردەکەی مەرجەکە بەجێ بهێنێ . "أن أحق الشروط أن توفوا به، ماستحللتم به الفروج".

سکاڵا: ئەگەر بە ئینسافەوە بڕوانینە ئەرك‌و مافی ژن‌و مێرد لە ئیسلامدا، بە ڕۆشنیی و ئاشکراییی ئەبینین: بنەرەتی پەیوەندیی نێوانیان یەکسانیی ئافرەت و پیاوە لەئەرك‌و مافدا، هەریەکەیان بە پێی فطرەی خۆی ئەرکی بۆ دیاریی کراوە، پیاو لە دەرەوە و ئافرەتیش لە ماڵەوەدا، هەریەکەیشیان مافی خۆی بە دادگەرانە بۆ دیاریی کراوە، بەوەش ماڵ‌و خێزان، چ لایەنی ناوەوەیان و چ لایەنی دەرەوەیان بەڕێك‌و پێکی ئەمێنێتەوە.

## هاوشانیی لە ئەرك و مافدا

دڵپاك: بەڵێ، ڕاستە و چاكت گوت. باسەكەی ئێمە زیاتر دەربارەی ئافرەتە، جا لە ئیسلاما ئافرەت چەند ئەركی لەسەرشان بێت، ئەوەندەش مافی بۆ ئەبێت، چەندی لێ داوا بكرێت، ئەوەندەشی پێ ئەدرێت، ئەمەش بۆچوونێكی ڕووت نییەو من بیڵێم، بەڵكو یاسایەكی نەمری خواییە. (ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف).

بەو پێیە ئەوەی كە لەسەر ژن پێویستە بەرامبەر مێردەكەی، یاخۆ لێی چاوەڕوان بكرێت وەك: گوێڕایەڵی، سپاردە سپاردن، بێگەردێتی، داوێن پاكیی، دڵسۆزیی، چاكیی هەڵسو كەوت، خۆشەویستیی و ڕێز، باوەڕ پێ بوون و پێبەخشین، چاكەو دڵخۆش كردن، ڕەچاو كردنی بەرژەوەندیی، بەجێهێنانی پێداویستییەكان، نەهاتنەوە ڕووی، توندوتیژی بەكار نەهێنان ئەزیەت نەدان، دووركەوتنەوە لە لووت بەرزیی و گاڵتە پێكردن و كەسایەتیی شكاندن و .. هتد. هەر بەو جۆرەش بەبێ كەمكردنەوە، لەسەر مێرد بەرامبەر ژنەكەی پێویستن و ئەبێ پەیڕەویی بكرێن[1].

سەرنج بدەن، ووشەی 0لهن) پێش ووشەی (علیهن) خراوە، واتە پێش دیاریی كردنی ئەرك، ماف دیاریكراوە بۆ ئافرەت لە یاسای خوادا! ئایا لەمە دادپەروەریی تەواوتر بۆ ئافرەت ڕەچاو كراوە؟ كام یاسای زەمینی ئەوەندە بە قوڵیی لە مافی ئافرەتدا داچووە؟ هەقی خۆیەتی. ئەی پیاو و ئافرەت دوو لایەنی بنەڕەتی كۆمەڵ نین؟ ئەی نابیت ئاڵ و گۆڕ بكرێت لە هاوبەشیی ژیانی هاوسەرێتیدا؟

لە ئیسلامدا نە پیاو بۆی هەیە ستەم لە ئافرەت بكات و نە ئافرەت بۆی هەیە ستەم لە پیاو بكات، بە تایبەتیی ژن و مێرد، هەركامیان دەستی بۆ مافی ئەویتر درێژ بكات، ئەوە ستەمكارە، تاوانبارە، بە موسڵمانی تەواو دانانرێت، لە دنیادا دادوەری موسڵمان سزای ئەدات و سزای ئاگری دۆزەخ چاوەڕوانیی ئەكات. دەی لەوە دادگەریی تر؟

ئاواز: ئاخر ژیان لە گۆڕینێكی هەمیشەییدایە، ئایا ئەو ئەرك و مافانە هەر ئەوەندە ئەبن؟ زیادو كەم ناكەن؟

دڵپاك: ئەو ئەرك و مافانەی كە باسمان كردن هەموو ئەرك و مافەكان نەبوون و بەشێكیان بوون، ئیسلام هەموویانی دیاریی كردوە، بە ووردیی سەرنجی یاسا قورئانییەكان بدەن، بیر لە ووشەی (المعروف) بكەنەوە، ئەبینین مەداكەی هەر زۆر زۆر فراوانە، هەر ئەرك و مافێك كە بە ڕاست و پاك بزانرێت و دژ بە گیانی ئیسلام نەبێت، هەموویان ئەگرێتەوە، جا ئەمەش نەبەستراوە بە كاتێكی دیاریكراوەوەو كە تواناو شیاویی ئەوەی نەبێ لەگەڵ شارستانییەت و پێشكەوتندا بڕوات، لە هەموو ڕۆژگارێكدا هەتا هەیە ئەڕوات و بە وورشەداریی ئەمێنێتەوە، ماف و ئەركەكان هەر لەبەرئەوە دیاریی نەكراون، تا یاساكە بەنەرمو نیانی و نەمریی بمێنێتەوە. هەتا لەگەڵ پێشكەوتنی ژیانی كۆمەڵایەتییدا بڕوات، هەتا توانای نوێبوونەوەی ژیان و گرتنە خۆی گۆڕانی هەبێت. بەو مەرجەی حەڵاڵی تێدا حەرام و حەرامی تێدا حەڵاڵ نەكرێت.

خوشكە بەڕێزەكانم، دەی یەكسانیی لە دابەشكردنی ئەرك و مافدا، لە نێوان ژن و مێردا، لەمە جوانتر و پاكتر هەبووە ئەبێ؟ لەمە ڕوونترو بێگەرد تر ئەبێ؟ ئایا هیچ جیاوازییەكی تێدا لە نێوان ژن و پیاودا دەرئەكەوێ؟ ئەگەر ئافرەت لە سایەی ڕێبازی خوادا بەرەو بەختیاریی نەڕوات، لە سایەی كام ڕێبازی داتاشراودا ئەڕوات؟ هیهات .. هیهات!

ئەوانەی كە بەختیاریی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا نابینن كێن و كامانەن؟ جگە لە مەڕو بەرانیی، بزن و سابرینیی، چی تریان ئەوێ؟ دەی ئیسلامیش هەرگیز ئەوەی ناوێ، ددانی پیادا نانێت، بەڵكو لەناوی ئەبات، بەردە بارانی بكەرانی ئەو كارە ئەكات مەڕو بەران و بزن و سابرێن و .. هتد ئاژەڵن، بەڵام ئادەمیزاد ئادەمیزادەو وەكیلی خوایە لەسەر زەویدا: "وأذ قال ربك للملائكة اني جاعل في الارض خليفة.."

سكاڵا: بەڕاستیی ئافرەت تەنیا لە سایەی ئیسلامدا ئەتوانێ هەنگاو بنێ بەرەو بەختیاریی. بەڵام داخەكەم! كێ لە ئیسلام تێی گەیەنێ؟ چۆنی تێگەیەنی؟ تەنانەت لە زمانی كوردیدا پەڕاوێكی بە كەڵك كە بە وردیی لە ئافرەت و ژیانی

[1] المرأة في القرآن والسنة : محمد عزة دروزة. و فقه السنة : السد سابق.

موسڵمانانە بکۆڵێتەوە بەر دەست ناکەوێ!

خوشکە دڵپاك، لەناو خەڵکدا گەلێ جار ووشەی (ناچیزە) ئەبیستم، خۆزگە لێی تێ ئەگەیشتمو ئەمزانی مەبەست لەو ووشەیە چییە؟!

دڵپاك: چاوەکەم، شەوگار درەنگە، بەیانیش ئەڕۆینەوە، ان شاء الله بە درێژیی باسی ئەکەم بۆتان و لێی تێ ئەگەن.

# سەرچاوەکان


1. قورئانی پیرۆز.
2. تەفسیری قورئان (في ظلال القرآن).
3. فقه السنة ـ السيد سابق.
4. المرأة في القرآن والسنة: محمد عزة دروزة.
5. الإسلام وقضايا المرأة المعاصرة: البهي الخولي.
6. المرأة بين البيت والمجتمع: البهي الخولي.
7. الحجاب: أبو الأعلى المودودي.
8. ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين: السيد أبي الحسن على الحسن الذدوي.
9. عقبات الزواج: عبدالله ناصح علوان.
10. تعدد الزوجات في الاسلام: عبدالله ناصح علوان.
11. الاسلام والجنس: فتحي يكن.
12. البيت الاسلامي كما ينبغي أن يكون: مقداد يالجن.
13. اللأمراض الجنسية: د. نبيل صبحي الطويل.
14. شبهات حول الاسلام: محمد قطب.
15. التطور والثبات: محمد قطب.
16. وتەی زاناکان‌و باوەڕ بەخوا: ئەحمەد کاکە مەحمود.
17. حقيقة البابية والبهائية: د. محسن عبدالحميد.
18. جمال الدين الأفغاني، المصلح المفترى عليه: د. محسن عبدالحميد.
19. أحاديث مع المرأة المسلمة: محمد بشار محمد أمين الفيضي.
20. قصة الايمان: نديم الجسير.
21. عمل المرأة في الميزان: د. محمد على النجار.
22. فجر الاسلام: أحمد أمين.
23. حقائق الاسلام واباطيل خصومه: عباس محمود العقاد.
24. المرأة في التراث الاشتراكي: ترجمة جورج طرابشي.
25. المراة في القرن العشرين: جروان السابق.
26. ماذا عن المرأة : د. نورالدين عتر.
27. القران والحياة الجنسية: طارق شفيق الطاهري.
28. كلمات مضيئة مهداة الى المراة : ناجى المنار.
29. كتاب الله ياولدي: محمود غريب.
30. المرأة في القران : عباس محمود العقاد.
31. اسلامنا : السيد سابق.
32. چەند سەرچاوەیەکی جۆربەجۆری تر.

